عثمان عبدالعزيز محمد



# شەرحی فەرموودەکانی صەحیحی بوخاری



بەرگی یەکەم



عثمان عبدالعزيز محمد

# شەرحی فەرمودەکانی صەحیحی بوخاری

## بەرگی یەکەم

چاپی یەکەم

١٩٩٩ز ١٤٢٠ك



عن كثير بن عبدالله بن عمر عن أبيه عن جده رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال:

{تَرَكْتُ فِيْكُمْ أَمْرَيْنِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بِهِمَا :

كِتَابَ اللهِ وَسُنَّتِي}


- ژمارەی سپاردنی (١٦٢) سالی ١٩٩٩ز دراوەتێ.
- مافی لە چاپ دانەوەی پارێزراوە.
- چاپ:یەکەم/١٤٢٠ك ١٩٩٩ز.
- (١٠٠٠) دانەی لێ چاپ کراوە.



الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على حبيبنا محمد ﷺ خاتم المرسلين وعلى آله وصحبه أجمعين ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين، وبعد:

یەکێك لە ئاواتە بەرزەکانی جەنابی مامۆستا تەفسیر کردنی قورئانی پیرۆزو پاش ئەویش نووسینی شەرحی صەحیحی بوخاری و نووسینی [illegible]او بابەتە فیقهی‌یەکان بوو بە زمانی [illegible] کوردی، کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا خزمەتێکی گەورەیە بە رابوونی ئیسلامی و کتێبخانەی کوردی و گەلی موسڵمانی کورد بە گشتی.

ئەوەبوو لە ژیانی پڕ بەرەکەتی خۆیداو لە قۆناغە جیاجیاو پڕ لە رووداوەکاندا تەفسیرەکە لە پەنای فەزڵی پەروەردگاردا تەواو بوو، وە چاپی تێرو تەواوی یەکەم جاری لە لایەن (**پرۆژەی چاپ کردنی تەفسیری قورئانی پیرۆز**)ەوە لە چاپ دراو زۆرێك لە خوێنەرانی موسڵمانی پێ شادبوو، پاشان دەستی کرد بە نووسینی شەرحی صەحیحی بوخاری و هەر لەکاتی نووسینی ئەم بەرهەمە پیرۆزەدا دەستی دایە نووسینی بەرهەمێکی تر لە دوو تویێی کتێبێکدا بۆ تێگەیشتن لە زانیارییەکانی قورئان بەناوی (**علوم القرآن**) کە لەم بەرهەمەیان بە زمانی عەرەبی بوو تاکوخوێندکارانی زانستە شەرعییەکان سوودی زیاتری لێ وەربگرن و وەك دەروازەیەك بێت بۆ خوێندنی تەفسیری قورئانی پیرۆز، زۆریش دڵی بەم بەرهەمە خۆش بوو، وە دەیفەرموو لە کاتی دووبارە چاپ کردنەوەی تەفسیرەکەم نوسینی راو پەراوێزی تازە لەم (**علوم القرآن**)ە زۆر بە پێویست دەزانم.

پێویستە ئەوەش بوترێت کە تا کۆچی پیرۆزی جەنابی مامۆستا یەك لەسەر سێی **شەرحی بوخاری** تەواوکردو نیوەی (**علوم القرآن**)ەکەشی نووسییەوە، سەرەڕای چەند بابەتێکی فیقهی بۆ قوتابیانی زانستە شەرعییەکان.

بەڵام ئیرادەی پەروەردگار وابوو رۆحی موبارەکی جەنابی مامۆستا بباتەوە حوزوورو بە دیداری خۆشەویستانی شاد بکات و ئێمەش مەحروم بین لەو

رووە نورانی‌یەی هەمیشە دوعاو پارانەوەی بۆ ئاسوودەی میللەتەکەی و تەواوی موسڵمانان بوو.

مەکتەبی جەنابی مامۆستا بە پشت بەستن بە توانای پەروەردگار بە نیازە درێژە بەو ڕێبازە پڕ خێرو بەرەکەتە بدات، کە یەکێك لە بەشەکانی مەکتەبی (ناوەندی عبدالعزیز بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە)یەو هەڵدەستێت بە ئامادەکردنی تەواوی بەرهەمە دەست نووسەکانی جەنابی مامۆستا (رحمة الله علیه)و هەر بەرهەمێکی تری بەسوود بە پێی توانای خۆی، داواکاریشمان لە زانا پایە بەرزەکان و خێرخوازانی گەلەکەمان ئەوەیە هاوکاریمان بکەن بۆ ئەم پرۆژە خێرییە.

شایانی وتنە کە بۆ کەڵك وەرگرتن لە هەڵەگیری و ئامادەکردن بۆ بە چاپ گەیاندنی ئەم بەرهەمە پیرۆزانە جگە لە سەرپەرشتی مەکتەبی جەنابی مامۆستا لیژنەیەکی پسپۆڕی پێك هاتووە لە مامۆستا پایە بەرزەکانی هاوەڵانی ژیانی جەنابی مامۆستا لە پەیمانگاکانی زانستە شەرعی‌یەکان و لیژنەکانی فتوای سەر بە مەکتەبی جەنابی مامۆستا هەڵدەستن بەو ئەرکە پیرۆزەو بۆ تەواو کردنی هەر بەرهەمێکیش کە چوونەوە حوزووری جەنابی مامۆستا مەودای تەواوکردنی نەدا ئەو مامۆستا پایە بەرزانە هەڵدەستن بە تەواو کردنی.

لە پەروەردگار دەپاڕێینەوە صەدەقە جاری‌یەکانی جەنابی مامۆستا هەردەم لە بەردەوام بوون و پەرەپێدان و درەوشانەوەدا بن و ڕۆحی جەنابی مامۆستا بە بەهەشتی بەرین شاد بکات و گەلی موسڵمانی کوردیش لە سایەی میهرەبانی خۆیدا لە قەوارەیەکی پڕ لە دادپەروەری یەکپارچەدا بۆ هەمیشە بحەوێتەوە.

مەکتەبی شێخ عثمان عبدالعزیز
بۆ بەڕێوەبەرایەتی ناوەندو دەزگاو پەیمانگا
ئیسلامی‌یەکانی کوردستان
هەولێر
١٥ رەمەزانی ١٤٢٠ کۆچی
٢٢/ ١٢ / ١٩٩٩ زاینی

## پێشەکی:

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمد لله رب العالمین و أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شریك له و أشهد أن سیدنا و مولانا محمدا رسول الله و أصلي و أسلم علیه و علی آله و أصحابه و أزواجه الطاهراتﷺ أمهاتنا و کل من دعا بدعوته و سار علی صراطه المستقیم.

لە پاش ئەوە، بێگومان سەرچاوەی ئەم شەریعەتە گەورەی ئیسلامە کە جێگرو جێنشینی هەموو ئایین و شەریعەتەکانی خوایە لە ئادەمەوە تا خاتەم و هەتا هەتایی یە تا کۆتایی ئەم جیهانە. سەرچاوەی ئەم شەریعەتە هەر ئەم قورئانەیە بە دەرەجەی یەکەم و بە دەرەجەی دووەم سوننەت کە بریتی یە لە گوفتارو کردارو هەر کاروکردەوەیەک کە پێی زانیبێ و لێی بێ دەنگ بووبێ وەک هەر بەو جۆرە پێناسە دەکرێ: أقواله و أفعاله و تقریراته ﷺ.

هەموو سوپاس و سەنایەک بۆ خوای میهرەبان کە تەوفیقی دام تەفسیری قورئانەکەم کردو ئاواتە خواز بووم کە بەختەوەر بیم بە تەفسیری سوننەتەکەی پێغەمبەر، وە لە ناو ئەو کتێبانەی ئەو سەرچاوە روون دەکەنەوە سەحیحی ئیمامی بوخاری یە کە پەسەند ترین و وەرگیراوترینە لای هەموو موسڵمانانی ئەهلی سوننەت. چونکە ئەم ئیمامە -رحمة الله علیه- دوو شتی کردووە بە مەرج:

١- عەدالەت.

٢- تلقی. واتە راویەکان هەموو عادل بوون و یەکتریان دیوە هەر لە خۆیەوە تا پێغەمبەری ئازیزﷺ.

حەدیسەکانیشی هەن لەناو هەموو سەحیحەکانی تر کە بەناویانگن بە (الصحاح الستة) واتە هەمیشە لەگەڵ یەکێ یان چەند لەوانی تریش ریوایەتی حەدیسەکانی ئەمیان کردووە. جا لەبەر ئەوە ئەم سەحیحی بوخاری یەم هەڵبژارد. سا خوا بە میهرەبانی خۆی یارمەتیم بدات بۆ تەواوکردنی ئەمیش وەک یارمەتی دام بۆ تەواوکردنی تەفسیری قورئانی

پیرۆز. داواکارم له خوای پەروەردگار پێم تەواو بکات و لێم وەربگرێ بەڵکو ببێ بە قەڵغانم له ئاگری دۆزەخ و روو سووریم له رۆژی دواییدا، بۆ خوای میهرەبان ئەوە هیچی تێ ناچێ.

تەفسیری سەحیحی بوخاری زۆر گرانە بەجۆرێ ئەگەر شەرحەکانی نەبوایە بەراستی لە زۆر جێگەدا ئێمە دادەماین وسەرمان لێ دەرنەدەکرد، وە یاریدەدەرم لەناو شەرحەکانیدا دوو کتێبەیە:

١- فتح الباري.

٢- إرشاد الساري.

کە دوو شەرحی زۆر گرنگن و رای زۆر لە زانایانی ئیسلامیان تێدایە.

سەحیحی بوخاری (٧٥٦٣) حەدیسە ئەوانی تر دووبارە بووەوەکانە. لەبەر درێژە نەدان وەک شێخی شەرقاوی ناوی راوییەکانم نەبردووە، هەرچەند لای صالح و خواناسان پیرۆز ترەو خێری تێدایە. ئینجا ئەو حەدیسانەی دووبارەن وبە بۆنەی حوکمێکەوە هێناونی لە شوێنێکدا دەقی حەدیسەکەم شەرح کردووەو لە شوێنەکانی تردا دەست نیشانم کردووە بە مەبەست و هۆی پەیوەندی بەو بابەوە کە هێناویەتی.

ئەم ئیمامە گەورەیە خوا پاداشتی بداتەوە هیچ حەدیسێکی دانەناوە بە تیکرار، بەڵکو هەر حەدیسێکی لەسەر مەرجەکەی خۆی دەست کەوتبێ هێناویەتی. بێجگە لە تعلیقات و راو بۆچوونی هاوەڵان و خواناسانی تر، هەروەها راو مەزهەبی فیرقە مویتەدیعەکان و را ناپەسەندەکانی نابووت کردووەتەوە.

ئەمە کورتەیەک بوو لە شێوەو تەبیعەتی ئەم نووسراوەی من، و الله أسئل أن يوفقني و يتقبل مني إنه سميع مجيب و رحيم ودود، و أصلي و أسلم على سيدي و مولاي محمد و الحمد لله أولا و آخرا.

عثمان عبدالعزيز محمد

جا ئەوا دەست پێ ئەکەین:

(١)

## كتاب بدء الوحي

قال الشيخُ الامامُ الحافظُ أبو عبدِالله محمدُ بنُ إسْمَاعِيلَ بنِ إبراهيمَ بنِ المغيرةِ البُخَارِيُّ رَحِمَهُ اللهُ تعالى آمين:

### ١- باب كيف كان بَدْءُ الوَحْيِ إلى رسولِ اللهِ ﷺ
### و قول الله جَلَّ ذِكرُهُ:

﴿إنَّا أوحَينا إليكَ كما أوْحَيْنا إلى نُوحٍ و النَّبِيِّين مِنْ بَعْدِهِ﴾ (النساء:١٦٣).

ئەم ئیمامە گەورە دەست پێ ئەكات ئەفەرموێ: (كيف كان بدء الوحي الى رسول الله) ئایا چۆن بوو دەست پێ كردن و یەكەم جاری وەحی خوا بۆ لای پێغەمبەرﷺ. بە پێی ئەم نوسخە وا دەرئەكەوێ ئیمام بە گوتن ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ی گوتبێ.

بە پێی فەرموودەی ئەوانەی كە تەفسیرو شەرحیان كردووە وا دەرئەكەوێ بە گوتن فەرموویێتی. بە هەرحاڵ گوتنی ئەو فەرموودەیە بە گوتن مەرجە ئیتر نووسینی لەگەڵ بێت یان نە. بێگومان زۆر دوور لەو زاتەوە بە گوتن بۆ كاری وا پیرۆز ئەم وتەی بە دەم نەفەرمووێ. كەواتە وا بڕیار ئەدەین كە دەم فەرموویێتی. (كيف كان بدء الوحي إلى رسول اللهﷺ) ئایا چۆن بووە یەكەم جاری دەست پێ كردنی وەحی خوا بۆ پێغەمبەرﷺ، واتە ئایا چۆن بووە یان لە یەكەم جارەوە بە خەو بوو تا ئامادەیی پەیدا كردبێ و لە پاش ئەوە لە بێداریدا بوویێ؟ وەک ئەبو ئەعیم بە ئیسنادێكی حەسەن ریوایەت ئەكات و ئەیهێنێ لە ئیبن و مەسعوودەوە، هەروەها چەند حەدیسێكی تریش هاتووە كە پشتگیری ئەم رایە دەكات.

لێرەدا پرسیار دەکرێت کە عینوانی باسەکە پرسیارە لە چۆنێتی یەکەم جار، وە هەموو حەدیسەکان هەر بۆ باسی هاتنی یەکەم جار نییە، بەڵکو باسی چۆنێتی وەحی‌یە بە شێوەیەکی گشتی، کەواتە ئەگەر بیفەرمووایە (کیف کان الوحي) رێک تر ئەبوو. لە وەڵامدا ئەڵێین: مەبەست باسی وەحی‌یە هەر لە یەکەم جارەوە هەتا دوایی لەگەڵ هەر بارێ کە پەیوەندی هەبێ بە یەکەم جاری‌یەوە. ئیمام -خوای لێ رازی بێت- لە هەموو کتاب و بابێکدا هەر حەدیسێکی دەست کەوتبێ بە پێی مەرجی خۆ ی هێناویەتی، وەک بۆمان روون ئەبێتەوە لەمەوپاش ﴿إنا أوحينا إليك كما أوحينا إلى نوح و النبيين من بعده﴾ ،بێگومان ئادەم یەکەم پێغەمبەرە، کەواتە جۆن باسی ئەوی نەفەرموو، لەوەڵامدا گوتراوە: نوحی کرد بە یەکەم، چونکە یەکەم پێغەمبەرێکە کە رەسوولەو رەوانە کراوە، ئادەم رەسوول نەبوو. یان لەبەر ئەوەیە نوح یەکەم پێغەمبەرێک بوو کە تۆڵە لە گەلەکەی سەنراوە.

پەیوەندی ئەم ئایەتە بە عینوانەکەوە ئاشکرایە. واتە نابێ سەر سوڕ بمێنێ لە وەحی بۆ لای پێغەمبەری ئازیزﷺ، چونکە ئەم یەکەم کەس نی‌یە کە وەحی بۆ کرابێ و کرابێ بە پێغەمبەر. یان مەبەست ئەوەیە چۆنێتی هاتنی وەحی بۆ ئەم بە وێنەو لەسەر شێوەی پێغەمبەرەکانی پێشوو بووە، بەم رەنگە لە پێشەوە بە خەو بوو، نەک لە کاتی بێداریدا وەک حەدیسەکەی ئەبو نەعیم بەڵگەیە لەسەری. بە هەر حاڵ پەیوەندی ئەو ئایەتە ئاشکرایە، بەڵام پەیوەندی ئەم حەدیسە کە دێت جێگای لێکۆڵینەوەو قسەو باسە کە ئەیهێنێ لە حەزرەتی عومەرەوە -خوای لێ راری بێت-.

لەم حەدیسەو هەموو حەدیسەکانی ئەم کتێبە ناوی راوی‌یەکانم نەنووسی هەرچەندە ناوی ئەو زاتانە فەرێ تێدایە. ناوەکانم نەبردن وەک ئیمامی شەرقاوی خاوەنی تەجریدی بوخاری، لەبەرئەوەی درێژە نەکێشێ.

١) عَن عَلقَمَةَ بنَ وقَّاصٍ اللَّيْثي يَقُولُ: سَمعتُ عمرَ بن الخَطَّابِ -رَضي اللّهُ عنه-على الْمنْبَرِ قَال: سمعْتُ رَسُولَ اللّهﷺ يَقولُ: «إنَّمَا الأَعْمَالُ بالنِّيَات، وَ إنَّمَا لكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى: فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إلَى دُنْيَا يُصيبُهَا، أوْ إلى امْرَأةٍ يَنْكِحُهَا؛ فَهِجْرَتُهُ إلَى مَا هَاجَرَ إلَيْهِ».

عەلقەمەی کوڕی وەقاص ئەڵێ بیستم لە عومەری کوڕی خەتتاب -خوای لێ رازی

بێت- لەسەر مینبەر ئەیفەرموو بیستم لە پێغەمبەرﷺ ئەیفەرموو: (إنما الأعمال بالنيات و إنما لكل امرئ ما نوى) هەموو کردەوەکان بە پێی نیازو نیەتەکانیانەوە بەستراون بەوەوە. بۆ هەرکەس هەر ئەوە هەیە کە نیازی کردووە. ئینجا روون کردنەوەو وتنەیەکمان بۆ باس ئەکات کە لەو کاتەدا بووە بەم رەنگە لە پاش کۆچ کردنی پێغەمبەرﷺ موسڵمانە ئەنصاریەکان -خوا لێیان رازی بێت- ئەچوون بە پێشوازیانەوە بە یارمەتی دان و ژن پێدان. جا لەو کاتەدا هێنی وا بوون کۆچی ئەکرد بە نیازی ئەوەی ماڵ و سامانیان پێ بدرێت یان ئافرەتێکیان پێ بدرێ وەک لەوانە هێنی واش هەبوو هەر لەبەر خوا کۆچی ئەکرد. جا پێغەمبەری ئازیزﷺ فەرمووی: (فمن كان هجرته إلى الله و رسوله فهجرته إلى الله والرسول). کەواتە هەرکەس کۆچ کردنەکەی لە مەککەوە بۆ مەدینە هەر بۆ لای خواو پێغەمبەری خوابێ و هەرکەس نیازی ئەوەی کردبێ لە راستیدا کۆچ کردنەکەی هەر بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەیەتی. فمن كانت هجرته إلى دنيا يصيبها أو إلى امرأة ينكحها فهجرته إلى ما هاجر إليه. هەرکەس کۆچ کردنەکەی بۆ لای ماڵ و سامانێک بێت یان بۆ لای ئافرەتێک بێت کە مارەی بکات و هەر بە نیازی ئەوە کۆچی کردبێت ئەو کەسە هیجرەتەکەی بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەی نییە، بەڵکو بۆ لای ئەوەیە کە هیجرەتی بۆ کردووەو نیازی کردووە، وەک ئەو کابرای کە هیجرەتی کرد بە نیازی ئەو ئافرەتەی کە ناوی أم قیس بوو کە دواتر ئەو پیاوە ناسرا بە موهاجیری ئوم قەیس.

پەیوەندی ئایەتەکە بە بابەکەوە ئاشکرایە وەک قسەمان لێ کرد، بەڵام پەیوەندی حەدیسەکە ئاشکرا نییە، لەبەر ئەوە زانایان هەرکەس بە پێی بۆچوونی خۆی شتێکی فەرمووە، هیچ کام لەو راو بۆچوونانە دڵنیاکەر نین و جێگەی قسەو باسن، ئەوەی زۆرتر بچێتە دڵەوە ئەمەیە: ئەم کتێبە دانراوە بۆ باسی کارو کردەوە شەرعییەکان و کاروکردەوە شەرعییەکانیش ئەوانەن لە لایەن خواوە دیاری کراون، دیاری کردنەکەش یان بە قورئان یان بە سوننەت، جا بەو بۆنەوە لە پاش ئایەتەکە ئەم حەدیسەی هێنا کە حەدیسەکە سەحیحە لەسەر مەرجی خۆی، وە حەدیسەکە بنەرەت و ئەساسەو جیاکەرەوەی کردەوە چاکەکانە لە کردەوەی بەتاڵ و وەرنەگیراو. زانین لەلای خواو پێغەمبەرەکەیەتیﷺ.

ئەم حەدیسە لە حەدیسەکانی ژمارە: (٥٤، ٢٥٢٩، ٣٨٩٨، ٥٠٧٠، ٦٦٨٩، ٦٩٥٣).

٢ـ باب

٢ ) عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا أَنَّ الْحَارِثَ بنَ هِشَامٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : «أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ فَيُفْصَمُ عَنِّي وَ قَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ، وَ أَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِيَ الْمَلَكُ رَجُلاً فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ». قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: وَ لَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ فَيَفْصِمُ عَنْهُ وَ إِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا.

له دایکی ئیماندارانەوە عائیشە -خوای لێ رازی بێت- فەرمووی: حاریسی کوڕی هیشام -خوای لێ رازی بێت- پرسیاری کرد لە پێغەمبەرﷺ کە چۆن وەحییت بۆ دێت؟ (فقال) ئەویش فەرمووی: (أحیانا یأتیني مثل صلصلة الجرس) لە هەندێ کاتدا بۆم دێت بە وێنەی زڕەی زەنگ (وهو أشده علي) ئەو جۆرە قورسترین و سەخت ترینە لەسەرم (فیفصم عني وقد وعیت عنه ما قال) ئینجا ئەو سەختییەم لێ دەبڕێت لە کاتێکدا تێ ئەگەم و وەری ئەگرم لە فریشتەکە ئەوەی پێی گوتم، واتە وەحی بە هەموو شێوەکانییەوە سەختە. بەڵام ئەو جۆرەیان سەخت تریانە.چونکە بێجگە لە سام و هەیبەتی وەحی بە شێوەی گشتی ئەم جۆرەیان شتێکی کەس نەدیدەیەو سام و هەیبەتی بەتێن ترە لە کاتێکدا ئەو زڕە دڵ دائەچڵەکێنێ (وأحیانا یتمثل لي الملك رجلا) لە هەندێ کاتی تردا فریشتەکە لە شێوەی پیاوێکدا بۆم دەرئەکەوێت (فیکلمني فأعي ما یقول) ئینجا گفتوگۆم لەگەڵ ئەکات و منیش ئەوەی کە پێم ئەڵێ وەری ئەگرم لێی.

ئینجا دایکی ئیمانداران شێوەی سەختیی جۆری یەکەم ئەخاتە بەرچاو کە ئەفەرموێ: (ولقد رأیته ینزل علیه الوحي في الیوم الشدید البرد فیفصم عنه و إن جبینه لیتفصّد عِرقًا) بە راستی پێغەمبەرم دیتووە لە رۆژێکی زۆر سارددا لە کاتێکدا تەوێڵی عەرەقی لێ ئەچۆڕا لەبەر زەحمەت و ماندوویەتی ئەو وەحییە.

ئەم حەدیسە لە ژمارە (٣٢١٥)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣-باب

٣) أوّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ ، فَكَانَ لاَ يرى رُؤْيَا إلا جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ. ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ، وكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فيه - وَهُوَ التَّعَبُّدُ- اللَّيَالِي ذَوَاتِ الْعَدَدِ، قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ وَ يَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إلى خديجة فيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ: اقْرَأْ. قال: ما أنا بِقَارِئٍ. قَالَ: فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ. قُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: اقْرَأْ. فَقُلْتُ: مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ: ﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ، خَلَقَ الإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ، اقْرَأْ وَ رَبُّكَ الأَكْرَمُ ﴾ فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا فَقَالَ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي. فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، فَقَالَ لِخَدِيجَةَ وَ أَخْبَرَهَا الْخَبَرَ: لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي. فَقَالَتْ خَدِيجَةُ: كَلاَّ وَاللّٰهِ مَا يُخْزِيكَ اللّٰهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَ تَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَ تَقْرِي الضَّيْفَ، وَ تُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ. فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ ابْنَ نَوْفَلِ بنِ أَسَدِ بنِ عَبْدِ الْعُزَّى -ابنَ عَمِّ خَدِيجَةَ- وَكَانَ امْرَءًا تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ، فَيَكْتُبُ مِنَ الإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللّٰهُ أَنْ يَكْتُبَ، وكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ، فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ: يَا ابْنَ عَمِّ اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ. فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: يَا ابْنَ أَخِي مَاذَا تَرَى؟ فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ خَبَرَ مَا رَأَى. فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ: هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللّٰهُ عَلَى مُوسَى، يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: أَوَ مُخْرِجِيَّ هُمْ؟ قَالَ نَعَم، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلاَّ عُودِيَ، وَ إِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا. ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ، وَ فَتَرَ الْوَحْيُ.

هەر لە دایکی ئیماندارانەوە عائیشە -خوای لێ رازی بێت- کە فەرمووی: (أول ما بدء به رسول اللهﷺ الرئيا الصالحة) یەکەم جاری وەحی کە دەست پێ کرا بۆ لای پێغەمبەرﷺ خەوی راست بوو (فكان لا يرى رؤيا إلا جاءت مثل فلق الصبح) بەم رەنگە

هەر خەوێکی بدیایە بە ڕێکی و بە وێنەی ڕووناکی شەبەق بەدی ئەهات.

ئەمەش حیکمەت و کاردروستی خوا بوو کە بەو خەوە ڕاستانە ئامادەیی پەیدا ئەکرد نەکا لە ناکاودا ئەو کارە گەورە بێت و دایبچڵەکێنێ (ثم حبب اليه الخلاء) ئینجا لەپاش ئەوە خەڵوەت و کەنارگیریی خۆشەویست کرا لە دڵیدا (وكان يخلو لغار حراء) خەڵوەت و کەنار گیریی ئەکرد لە ئەشکەوتی (حراء)دا (فيتحنث فيه وهو التعبد الليالي ذات العدد) واتە خوا ناسی بە ڕاستی ئەکرد چەند شەو و ڕۆژێک بەم ڕەنگە شوێنی ئایینی خواپەرستی ئیبراهیم ئەکەوت (قبل أن ينزع إلى أهله) پێش ئەوەی بیری ماڵ و منداڵی بکاتەوەو بگەڕێتەوە بۆ لایان (ويتزود لذلك) توێشووی هەڵئەگرت بۆ ئەو ماوەیە (ثم يرجع إلى خديجة -رضي الله عنها-) ئینجا ئەگەڕایەوە بۆ لای خەدیجە (فيتزود لمثلها) توێشووی هەڵئەگرت بۆ وێنەی ئەو شەو و ڕۆژانە (حتى جاءه الحق وهو في غار حراء) هەتا وەحی بۆ هات لە کاتێکدا لە ئەشکەوتی (حراء)دا بوو (فجاء الملك) بەم ڕەنگە فریشتەکە هات بۆ لای -واتە جبرئیلﷺ- (فقال) ئینجا وتی: (إقرأ) وتی بە پێغەمبەرﷺ: بخوێنە. ئیتر مەبەست بێدار کردنەوە بوویێت وەک هەندێ ئەفەرموون یان نە. (فقال: ما أنا بقارئ) لە وەڵامدا فەرمووی: من خوێندەوار نیم. (فأخذني فغطني) ئینجا گوشیمی بە خۆیەوە (ثم أرسلني، فقال إقرأ) مەرەخەسی کردم و هەمیتر گوتی: (إقرأ) بخوێنە، منیش گوتم: خوێندەوار نیم. (فأخذني فغطني الثانية حتى بلغ مني الجهد) ئینجا هەمیتر گوشیمی بە خۆیەوە هەتا پشووی لێ بڕیم (فأخذني فغطني الثالثة) ئینجا بۆ جاری سێیەم گوشیمی بە خۆیەوەو لە پاش ئەوە مەرەخەسی کردم (فقال: إقرأ باسم ربك الذي خلق) ئینجا فەرمووی: بخوێنە بە ناوی پەروەردگارتەوە کە داهێنەرە.

ئینجا بە تایبەتی باسی داهێنەریی ئادەمی ئەکات کە گەورەترین و نایاب ترین داهێنراوەکانە، ئەفەرموێ: (خلق الإنسان من علق) ئادەمی دروست کرد و دای هێنا لە خوێن پارەکان (إقرأ وربك الأكرم الذي علم بالقلم) بخوێنە لە کاتێکدا پەروەردگارت لە هەموو کەریم و بەخشندەیە کەریم و بەخشندە ترە کە بە قەڵەم فێر ئەکات (علم الإنسان ما لم يعلم) ئادەمی فێری شتێ کردووە کە لەمەوپێش فێری نەبووەو نەیزانیوە.

لێرەدا پێویستە هەموو ژیریێ بیر بکاتەوە لەوەی کە خوای پەروەردگار ویستی دواترین پەیام و بەرنامەی خۆی بنێرێ بۆ هەموو جیهانیان هەتا رۆژی دوایی کاتێ ئیرادەی ئەوەی کرد کەسێکی بۆ هەڵبژارد کە هەر خۆی موعجیزەیەو بەڵگەی قەتعی‌یە لەسەر فروستادەیی‌یەکەی. کەسێکی هەڵبژارد کە نەخوێندەوار بوو و پێگەیشت لەناو گەلێکی بت پەرستی نەخوێندەواردا لەگەڵ ئەوەدا بەرنامەیەکی هێنا لە هەموو بارو رووبەکی ژیان و جیهانەوە تەواوە کە ئەمە زیاد لە ١٤ چەرخە هاتووەو چەند جارێک بەری بڕیەوە لە خەڵکی کە بتوانن وێنەی بێنن و دوژمنان دەستەپاچە و پەک کەوتوو بوون لەبەردەمیدا، تەنانەت نەتوانرا وتارو دانراوێک بێنن، بە تایبەت ئەم تاقمە عەرەب بوون و هەوڵ و تێکۆشانی تەواویان کردو چەند هەڵبەستیان داناو بەڵام هەر بۆ خۆیان تەریق بوونەوەو هیچیان بۆ نەمایەوە و گوتیان ئەمەی محمد ئەیڵێ سیحرەو جادووە، چەند چەرخ نامەدارەکان لافی زانایی‌یان لێ ئەدا، بەڵام پێغەمبەری ئازیزی نەخوێندەوارﷺ بە درۆی خستنەوەو نەیان توانی بەرگری بکەن و ئەشیان زانی خۆیان درۆزنن، بەڵام لە حەسادەتدا دانیان پێدا نەئەنا بێجگە لە هەندێ زانا بەرزەکانیان کە بە رێکی باوەڕیان هێنا.

ئەمە لە بارەی ئەو شتە ئاشکراوە، لە بارەی نیزامی ئابووری و کۆمەڵایەتی و هەموو بوارەکانی تری ژیان هەتا زانین و زانیاری پێش بکەوێ باشتر دەرئەکەوێ ئەمەی پێغەمبەری ئازیزی نەخوێندەوارﷺ هێنای لە توانای هیچ کەسدا نی‌یە بێجگە لە داهێنەری ئەم بوونەوەرە. ئەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەﷺ ماتوڵ خۆی نەخوێندەوار بوو ئەبوو باسی نووسین و قەڵەمی نەکردایە، بەڵام کارەکە کاری خوایەو فەرمانەکە فەرمانی ئەوە پاکی لە هیچ شتێک نی‌یەو بە پێی کاردروستی خۆی هەر لە یەکەم جارەوە باسی ئەوە ئەکات. کەواتە هەر بوونی خۆی موعجیزەو بەڵگەیەکی روونە لەسەر راستی‌یەکەی خۆی فصلی اللە علیە و علی آلە و أصحابە و أزواجە و أولادە أجمعین.

ئینجا با بگەڕێینەوە بۆ سەر حەدیسەکە بە یارمەتی خوا (فرجع بها رسول اللهﷺ) ئینجا پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە بەو ئایەتانەی کە لە جوبرەئیلەوە وەری گرت لە کاتێکدا دڵی ئەلەرزی لەبەر ئەوەی ئەو کارە گەورە کەس نەدیدە لە ناکاودا رووی تێ کرد. ئەوەش شتێکە بە گوێرەی سروشتی بەشەری روو ئەدات لە کاتی ئاوادا (فدخل علی خدیجة بنت خویلد

-رضي الله عنها) ئینجا رۆیشتەوە بۆ لای دایکی ئیمانداران خەدیجەی کچی خوەیلید -خوای لێ رازی بێت- بە دەم ئەو لەرزەوە فقال زملوني زملوني فەرمووی دامپۆشن (فزملوه) ئەوانیش دایان پۆشی (حتى ذهب عنه الرّوع) هەتا ئەو حاڵەت و لەرزەی نەما (فقال لخديجة و آخبرها الخبر لقد خشيت علي نفسي) ئینجا فەرمووی بە دایکی ئیمانداران خەدیجە -خوای لێ رازی بێت- بەراستی مەترسیم پەیدا کردووە لە خۆم کە شتێکم بەسەر بێت.

لە بارەی ئەو مەترسی لێ کراوەوە ١٢ را هەیە لە لایەن زانایانەوە. لەناو ئەو رایانەدا -والله و رسوله أعلم- ئەمە بەجێیە کە مردن یان تێک چوونی مەبەست بووبێ. ئیتر هەرچەندە گومانی نەبووە کە ئەوە فریشتەیە و لە لایەن خواوە ئەو ئایەتانەی فێر کردووە، بەڵام لەو کاتەدا پێی نەفەرموو تۆ ئەبیت بە پێغەمبەر تا لە پاشان لە جارێکی تردا کە سەرەتای سورەتی المدثر ئەیگەیەنێ. جا کە ماتوڵ ئەو یەکەم جارە ئەو هەواڵەی پێ نەدرا زۆر بەجێیە مەترسی کردبێ ئەو داچڵەکان و ترس و لەرزە ببێتە هۆی نەمان و لەناوچوون یان تێک چوونی.

ئینجاخاتوو خەدیجە فەرمووی: (كلا و الله) نەخێر سوێند بە خوا شتی وا نابێ (ما يخزيك الله أبدا) خوا هەرگیز تۆ ریسوا ناکات و شتێ ناکات پێت کە غەمبارت بکات.

چەند کردەوەیەکی چاکی کرد بە بەڵگە لەسەر ئەوە:

أ- (إنك لتصل الرحم) بێگومان تۆ سیلەی رەحم بەجێ ئەهێنی.

ب- (وتحمل الكلّ) تۆ ئەرکی کەسانێ ئەگریتە گەردن کە بێ کارەو دەستە پاچەو ناتەواون.

ج- (وتكسب المعدوم) تۆ شتێ ئەبەخشی بە خەڵکی کە لە لای تۆ نەبێ دەستیان ناکەوێ.

د- (وتقري الضيف) تۆ میوانداری خەڵکی ئەکەیت.

هـ- (وتعين على نوائب الحق) تۆ کۆمەکی ئەکەیت لەسەر بەسەرهاتی سەخت و رووداوی حەق و بەجێ.

بە راستی ئەم فەرموودانە بەڵگەی بەهێزن لەسەر فەزڵ و ژیریی دایکی ئیمانداران خوای لێ رازی بێت- کە زۆر بە دڵنیایی‌یەوە سوێندی خوارد کە خوا هەرگیز کاری خراپ ناهێنێ بەسەر پێغەمبەری ئازیزﷺ، چونکە خاوەنی ئەو کردەوە چاک و پەسەندانەیە کە لای خوا پەسەندن.

لەو فەرموودەیەوە وەرئەگیرێ هەرکەسێ بەو جۆرە سروشت پاک بێت خوا دووچاری شتی خراپی ناکات و ئەیپارێزێ لە دوا رۆژدا هەرچەندە بە پێی حیکمەت و لێزانی خوا نارەحەتی بەسەر بێت. خوای پەروەردگار خەدیجە خاتوونی بەو جۆرە دروست کرد بۆیە کردی بە هاوسەری گەورەترین ئادەمی (فانطلقت به خديجة حتى أتت به ورقة بن نوفل) ئینجا خەدیجە خاتوون -خوای لێ رازی بێت- پێغەمبەری ئازیزی برد بۆ لای وەرەقەی کوڕی نەوفەل کە ئامۆزای خەدیجە بوو (وكان امرأ تنصر في الجاهلية) وەرەقە پیاوێک بوو لە چەرخی نەفامی‌دا لای دابوو لە بت پەرستی و چووبوویە سەر ئایینی حەزرەتی عیسا (وكان يكتب الكتاب العبراني) نامەو نووسراوی ئەنووسی بە زمانی عیبرانی کە زمانی ئەهلی کیتاب بوو (فيكتب من الإنجيل ما شاء الله أن يكتب) وە بە زمانی عیبرانی ئینجیلی ئەنووسی‌یەوە ئەوەی خوا ئیرادەی کردبێ (وكان شيخا كبيرا قد عمي) وەرەقە پیاوێکی پیر بوو (فقالت له خديجة) ئینجا خەدیجە خاتوون -خوای لێ رازی بێت- فەرمووی بە وەرەقە (يا ابن عمّ اسمع من ابن أخيك) ئەی ئامۆزام ببیسە لە برازاکەت، واتە پێغەمبەری ئازیزﷺ (فقال له ورقة يا ابن أخي ماذا ترى؟) وەرەقە گوتی ئەی برازاکەم ئایا چیت دیوە؟ (فأخبره رسول اللهﷺ خبر ما رأى) پێغەمبەریشﷺ هەواڵی ئەوەی پێدا کە دیتبووی (فقال له ورقة هذا الناموس الذي نزل الله على موسى) وەرەقە گوتی ئەمە ئەو خاوەنی سڕی خوایە کە لە ئاسمانەوە هێنایە سەر موسا، واتە جوبرەئیلە کە فریشتەی وەحیە بۆ لای پێغەمبەران (يا ليتني فيها جذعا) کاشکێ من لە ماوەی پێغەمبەرێتیت‌دا گەنج بوومایە بۆ ئەمەی یارمەتیت بدەم (ليتني أكون حيا إذ يخرجك قومك) کاشکی من زیندوو بوومایە ئەو کاتەی کە گەلەکەت دەرت ئەکەن (فقالﷺ أو مخرجي هم؟) ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئایا ئەوانە من دەرئەکەن؟ (قال: نعم لم يأت رجل قط بما جئت إلا عودي) وەرەقە گوتی بەڵێ هیچ

پیاوێک نەهاتووە بە وێنەی ئەو ئایینەی کە تۆ پێی هاتووی مەگەر دوژمنایەتی لەگەڵ کراوە (وإن یدرکني یومك أنصرك نصرا مؤزرا) ئەگەر ئەو ڕۆژەی تۆم پێ بگات یارمەتیت ئەدەم بە یارمەتی دانێکی زۆر بەهێز (ثم لم ینشب ورقة أن تُوفّي) ئینجا ئەوەندەی پێ نەچوو وەرەقە وەفاتی کرد (وفتر الوحي) ئینجا وەحی وەستا ماوەی سێ ساڵ یان دوو ساڵ و نیو.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی (٣٣٩٢، ٤٩٥٣، ٤٩٥٥، ٤٩٥٦، ٤٩٥٧، ٤٩٨٢)دا دووبارە بووەتەوە.

٤) قَالَ ابنُ شِهَابٍ: وَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ بنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ أَنَّ جَابِرَ بنَ عَبْدِاللهِ الأَنْصَارِيَّ -وَهُوَ يحدِّثُ عن فَتْرَةِ الْوَحْيِ- فَقَالَ فِي حَدِيثِهِ: ( بَيْنَا أَنَا أَمْشِي، إِذْ سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ، فَرَفَعْتُ بَصَرِي فَإِذَا الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءٍ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَ الأَرْضِ، فَرُعِبْتُ مِنْهُ، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ، قُمْ فَأَنْذِرْ-إلى قوله تعالى-وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ﴾. فَحَمِيَ الْوَحْيُ وَ تَتَابَعَ).

جابری کوڕی عەبدوڵلا -خوای لێ ڕازی بێت- لە کاتێکدا لە بارەی وەستانی وەحی‌یەوە قسەی ئەکردو گوتی: (فقال رسول الله ﷺ) ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بینا أنا أمشي) لە کاتێکدا من ئەگەڕام (إذ سمعت صوتا من السماء) لەوکاتەدا دەنگێم بیست لە ئاسمانەوە (فرفعت بصري) منیش چاوم بەرزکردەوە بەرەو ئاسمان (فإذا الملك الذي جاءني بحراء جالس علی کرسي بین السماء و الأرض) بینیم ئەو فریشتەی کە هات بۆ لام لە ئەشکەوتی (حراء)دا دانیشتووە بەسەر کورسی‌یەکەیەوە لە نێوان زەوی و ئاسماندا (فرُعبت منه) منیش داچڵەکام لێی (فرجعت فقلت) ئینجا گەڕامەوە بۆ ماڵ و گوتم پێیان (زملوني) داپۆشن (فأنزل الله یا أیها المدثر) ئینجا خوا ئەم ئایەتانەی هێنایەوە خوارەوە: ئەی کەسێ کە خۆتت داپۆشیوە (قم فأنذر) هەستەو خەڵکی بترسێنە لە سزای خوا ئەگەر باوەڕ نەهێنن.

پێغەمبەری ئازیز مژدە دەریش بوو، بەڵام لەو کاتەدا قسەی لەگەڵ بێ باوەڕان بووەو مژدەیش بەوان نادرێ (و ربك فکبر) پەروەردگارت بە پاک و خاوێن ڕاگرە لەهەر لەکەو شتێکی ناڕاست (وثیابك فطهر) جل و بەرگت پاک و تەمیز بکە (والرجز فاهجر واز بێنەو

...رێکەوەرەوە لە بتان، (فَحمِيَ الوحي و تتابع) ئینجا لە پاش هاتنی ئەم ئایەتانە وەحی
..ر بوو هات بە دوای یەکدا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٢٢٨، ٤٩٢٢، ٤٩٢٣، ٤٩٢٤، ٤٩٢٦، ٤٩٥٤، ٦٢٤٢)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٤-باب

٥)حدَّثَنَا موسى بنُ إسْماعيلَ قال حدَّثَنا أبو عَوَانَةَ قال حدَّثَنا موسى بنُ أبي عائشَةَ قالَ حدَّثَنا سَعِيدُ بنُ جُبير عن ابنِ عباسٍ في قوله تعالى: ﴿لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ﴾ (القيامة:١٦) قال: كَانَ رسولُ اللهِ ﷺ يُعَالِجُ مِنَ التَّنْزِيلِ شِدَّةً، وكَانَ مِمَّا يُحَرِّكُ شَفَتَيْهِ، فَقَالَ ابنُ عَبَّاسٍ: فَأَنَا أُحَرِّكُهُمَا لَكُمْ كَمَا كَانَ رَسولُ اللهِ ﷺ يُحَرِّكُهُمَا. وقال سعيدٌ: أنا أُحَرِّكُهُمَا كَمَا رَأَيْتُ ابنَ عَبَاسٍ يُحَرِّكُهُمَا -فَحَرَّكَ شَفَتَيْهِ- فَأَنْزَلَ اللهُ تَعالَى: ﴿لاَ تُحَرِّكْ بِهِ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِ، إنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُ وَ قُرْآنَهُ﴾ قال: جَمْعُهُ لَكَ في صَدْرِكَ وَ تَقْرَأَهُ ﴿فَإذَا قَرَأْنَاهُ فَاتَّبِعْ قُرْآنَهُ﴾ قال فَاسْتَمِعْ لَهُ وَ أَنْصِتْ ﴿ثُمَّ إنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُ﴾ ثُمَّ إنَّ عَلَيْنَا أنْ تَقْرَأَهُ. فَكَانَ رسولُ اللهِ ﷺ بعدَ ذلك إذَا أتَاهُ جِبْرِيلُ اسْتَمَعَ، فَإذَا انْطَلَقَ جِبْرِيلُ قَرَأَهُ النَّبِيُّ ﷺ كَمَا قَرَأَهُ.

لە پاش ئەوەی وەحی زۆر بوو لەبەر پاراستنی ئەو ئایەتانە کە ئەهاتن بە دوای یەکداو لەبەر کردنیان، کاتێ کە جوبرەئیل ﷺ ئایەتەکانی ئەخوێندەوە لەگەڵ گوتنی ئەودا ئەمیش ئەیخوێندەوە. ئینجا خوای میهرەبان ئادابی گوێ گرتن و وەرگرتنەکەی راگەیاند بە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و دڵنیای کرد لەسەر ئەوەی کە خوا ئەو ئایەتانە کۆ ئەکاتەوە لە دڵیداو لە بیریان ناچێتەوە.

جا لەم بارەیەوە سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبن و عەباسەوە -خوا لێیان رازی بێت- ئەم حەدیسە ئەهێنێ: (قال) ئیبن و عەباس ئەفەرموێ: (کان رسول اللهِ ﷺ یعالج من التنزیل شدة) پێغەمبەر ﷺ دووچاری زەحمەت ئەبوو لەبەر غەمی لەبیر چوون و وەرنەگرتنی بە رێکی لەبەر ئەو هەوڵ کۆششانەی و (کان مما یحرك شفتیە) باوی وابوو هەردوو لێوی

ئەجوولاَنەوە لەگەڵ گوتنەکەی جوبرەئیلدا.

جا لێرەدا ئیبن و عەباس -خوا لێیان رازی بێت- ئەفەرموێ: (فأنا أحركهما كما كان رسول الله ﷺ يحركهما) ئینجا من ئەیان جولێنمەوە هەرچۆنێ پێغەمبەرﷺ ئەیجولاندنەوە و قال سعيد و أنا أحركهما كما رأيت ابن عبا يحركهما -فحرّك شفتيه -)

وە سەعیدیش ئەفەرمووێ: ئەوا من ئەیجولێنمەوە هەرچۆنێ ئیبن و عەباس ئەیجولاندەوەو هەردوو لێوی ئەجولاندەوە.

مەبەست لە نیشاندانی ئەو شێوەیە روون کردنەوەو دڵنیا کردنە لەسەر راستی هەواڵەکە. ئینجا ئیبن و عەباس -خوا لێیان رازی بێت- ئەفەرموێ: (فأنزل الله تعالى) بە هۆی ئەوەوە خوا ئەم ئایەتەی هێنایە خوارەوە ﴿لا تحرّك به لسانك لتعجل به﴾ ئەی پێغەمبەر زمانت مەجولێنە بۆ خوێندنی قورئانەکە بۆ ئەوەی پەلەی پێ بکەیت بۆ وەرگرتنەکە نەک لە بیرت بچێ ﴿إن علينا جمعه و قرآنه﴾ بەراستی لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوەی لە دڵتداو خوێندنەوەت ﴿فإذا قرأناه فاتبع قرآنه﴾ واتە بوەستە تا جوبرەئیل لێ ئەبێتەوە، ئینجا کاتێ ئێمە خوێندمانەوە لەسەر زمانی جوبرەئیل ئەو کاتە شوێنی خوێندنەوەکەی ئەو بکەوەو بوەستەو گوێ بگرە هەتا ئەو لێ ئەبێتەوە. ﴿ثم إن علينا بيانه﴾ ئینجا لەپاش لێ بوونەوەکەی جوبرەئیل لەسەر ئێمەیە خوێندنەوەکەی تۆ بۆ ئەو قورئانەی کە جوبرەئیل ئەیخوێنێ بەسەرتدا. وەک بەو جۆرە ئیبن و عەباس -خوا لێیان رازی بێت- تەفسیری ئەکاتەوە (فكان رسول الله ﷺ بعد ذلك) ئینجا پێغەمبەرﷺ لە پاش هاتنی ئەم ئایەتە (إذا أتاه جبريل استمع ، فإذا انطلق جبريل قرأه النبيﷺ كما قرأه). کاتێ جوبرەئیل ئەهات بۆ لای و قورئانی بەسەردا ئەخوێند ئەوەستا هەتا جوبرەئیل لێ ئەبوویەوە، ئینجا کاتێ جوبرەئیل لێ ئەبوویەوە پێغەمبەرﷺ ئەیخوێندەوە هەرچۆنێ جوبرەئیل ئەیخوێندەوە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٩٢٧، ٤٩٢٨، ٤٩٢٩، ٥٠٤٤، ٧٥٢٤)دا دووبارە بووەتەوە.

***　　***　　***

٥ـ باب

٦) حدثنا عَبْدَانُ قالَ أخبَرَنَا عبدُالله قالَ أخبَرَنَا يُونُسُ عن الزُهْرِيْ.ح.

وحدثنا بِشْرُ بنُ مُحَمَّدٍ قالَ أخبرَنَا عَبْدُالله قالَ أخبَرَنَا يونُسُ ومَعْمَرٌ عنِ الزُهْرِيّ نحوه قالَ: أخبَرَني عُبَيْدُ اللهِ بنُ عَبْدِالله عنِ ابنِ عَباسٍ قال: كانَ رسولُ اللهِ ﷺ أجْوَدَ الناسِ، وكَانَ أجْوَدُ مَا يَكُونُ في رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وكانَ يلقاهُ في كلِّ ليلةٍ مِنْ رمضانَ فيُدَارِسُهُ القُرآنَ، فَلَرَسولُ اللهِ ﷺ أجْوَدُ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِيْحِ الْمُرْسَلَةِ.

ئینجا لەکاتێکدا دەست پێ کردنی یەکەم جاری وەحی لە ڕەمەزاندا بوو وەک هاتنە خوارەوەی بە کۆمەڵ لە (لوح المحفوظ)ەوە بۆ ئاسمانی چوارەم کاتێ کارەکە بەو جۆرە بوو ئیمامی بوخاری حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن و عەباسەوە -خوا لێیان رازی بێت- لە بارەی هاتنە خوارەوەی جوبرەئیل بۆ لای پێغەمبەرﷺ لە هەموو شەوێکی ڕەمەزاندا بۆ پیاچوونەوەی ئەو ئەندازە قورئانەی کە لەو ساڵەدا هێناویەتە خوارەوە، ئەفەرموێ: کان رسول اللهﷺ أجود الناس پێغەمبەری خۆشەویستﷺ سەخی ترین و بەخشندە ترینی هەموو کەس بوو (وكان أجود ما يكون في رمضان حين يلقاه جبريل و كان يلقاه جبريل في كل ليلة من رمضان فيدارسه القرآن) وە سەخی ترین و بەخشندە ترینەکەی هەبوو لە ڕەمەزاندا کاتێ کە ئەگەیشت بە جوبرەئیل ﷺ، جوبرەئیلیش هەموو شەوێ لە ڕەمەزاندا ئەهات بۆ لای پیاچوونەوەی قورئانی لەگەڵ ئەکرد (فَلَرسول اللهﷺ أجود بالخير من الريح المرسلة) پێغەمبەرﷺ بەراستی خێرو بەخشینی زۆرتر بوو لە بای بە تەوژم کە هەمیشە دێت بێ وەستان.

ئیمامی ئەوەوی -رەحمەتی خوای لێ بێ- ئەفەرموێ: لەم حەدیسەدا چەند شتێ وەرئەگیرێ:

أ- هاندان لەسەر سەخاوەت و بەخشین لە هەموو کاتێکدا.

ب- زیادە بەخشین لە مانگی ڕەمەزاندا.

ج- پەسەندێ کۆبوونەوە لەگەڵ چاکاندا.

د- چەند بارە کردنەوەی کۆبوونەوە ئەگەر زیارەت کراو بێزار نەبێ.

هـ- قورئان زۆر خوێندن لە ڕەمەزاندا.

و- خوێندنەوەی قورئان گەورەترە لە هەموو زیکرەکانی تر.

دیارە خوێندنی رووت خێری گەورەی هەیە، بەڵام خوێندنی بە فیکرو مل کەچی‌یەوە بۆ هەموو فەرمانەکانی و بیر کردنەوە لە هەموو ئایەتەکانی ئەوە پلەی هەرە بەرزتری هەیەو لە هەمووی بەرزتر هەوڵدانە بۆ بەجێ هێنان وجێ بە جێ کردنی یاساو مەبەستەکانی وەک یەکەم تاقمی ئەم ئومەتەو شوێن کەوتووەکانیان. واللّٰه الموفق.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٩٠٢، ٣٢٢٠، ٣٥٥٤، ٤٩٩٧)دا دووبارە بووەتەوە.

***    ***    ***

٦- باب

٧) حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ الْحَكَمُ بنُ نَافِعٍ قَالَ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللهِ بنُ عبدِاللهِ بنِ عُتْبَةَ بنِ مَسْعُودٍ أَنَّ عبدَاللهِ بنَ عباسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا سُفْيَانَ بنَ حَرْبٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ هِرَقْلَ أَرْسَلَ إِلَيْهِ فِي رَكْبٍ مِنْ قُرَيْشٍ، وَ كَانُوا تجارًا بالشَّامِ فِي الْمُدَّةِ الَّتِي كَانَ رَسُولُ اللهِ مَادَّ فِيهَا أَبَا سُفْيَانَ وَ كُفَّارَ قُرَيْشٍ، فَأَتَوهُ وَهُمْ بإِيلِيَاءَ، فَدَعَاهُمْ فِي مَجْلِسِهِ وَحَوْلَهُ عُظَمَاءُ الرُّومِ، ثُمَّ دَعَاهُمْ وَ دَعَا بِتَرْجُمَانِهِ فَقَالَ: أَيُّكُمْ أَقْرَبُ نَسَبًا بهذَا الرَّجُلِ الَّذِي يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِيٌّ؟ فَقَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَقُلْتُ: أَنَا أَقْرَبُهُمْ نَسَبًا. فَقَالَ: أَدْنُوهُ مِنِّي، وَ قَرِّبُوا أَصْحَابَهُ فَاجْعَلُوهُمْ عِنْدَ ظَهْرِهِ. ثُمَّ قَالَ لِتَرْجُمَانِهِ: قُلْ لَهُمْ إِنِّي سَائِلٌ عَنْ هَذَا الرَّجُلِ، فَإِنْ كَذَبَنِي فَكَذِّبُوهُ. فَوَاللهِ لَو لاَ الْحَيَاءُ مِنْ أَنْ يَأْثِرُوا عَلَيَّ كَذِبًا لَكَذَبْتُ عَنْهُ. ثُمَّ كَانَ أَوَّلَ مَا سَأَلَنِي عَنْهُ أَنْ قَالَ: كَيْفَ نَسَبُهُ فِيكُمْ؟ قُلتُ: هُوَ فِينَا ذُو نَسَبٍ. قَالَ: فَهلْ قَالَ هذا الْقولَ منكُم أَحَدٌ قَطُّ قَبْلَهُ؟ قلتُ: لا. قال: فَهلْ كَانَ من آبائه مِنْ مَلِكٍ؟ قلتُ: لا. قال: فَأَشرافُ النَّاسِ يَتَّبِعونَهُ أَمْ ضُعَفَاؤُهُمْ؟ فقلتُ: بَلْ ضُعَفَاؤُهُمْ. قال: أَيَزِيدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ؟ قلتُ: بلْ يَزِيدُونَ. قال: فَهلْ يرتَدُّ أَحَدٌ مِنهُمْ سَخْطَةً لِدِينِه بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ؟ قلتُ: لا. قال: فَهلْ كُنْتُمْ تَتَّهِمُونَهُ بِالْكَذِبِ قَبْلَ أَنْ يَقُولَ مَا قَالَ؟ قلتُ: لا. قال: فَهلْ يَغْدِرُ؟ قلتُ: لا، وَنحنُ مِنهُ فِي مُدَّةٍ لاَ نَدْرِي مَا هُوَ فَاعِلٌ فِيهَا. قَالَ وَلَمْ تُمْكِنِّي كَلِمَةٌ أُدْخِلُ فِيهَا شَيْئًا غَيرَ هذهِ الْكَلِمَةِ. قال: فَهلْ قَاتَلْتُمُوهُ؟ قلتُ: نعم. قال: فَكَيفَ كَانَ قِتَالُكُمْ إِيَّاهُ؟ قلتُ: الْحَرْبُ بَيْنَنَا وَ بَينَهُ سِجَالٌ، يَنالُ مِنَّا وَنَنالُ مِنهُ. قالَ: مَاذَا يَأْمُرُكُمْ؟ قلتُ: يَقولُ اعْبُدُوا اللهَ وَحدَهُ

ولا تشركوا به شيئا، واتركوا ما يقول آباؤكم. ويأمرنا بالصلاة والصدق والعفاف والصلة. فقال للترجمان: قل له: سألتك عن نسبه فذكرت أنه فيكم ذو نسب، فكذلك الرسل تبعث في نسب قومها. وسألتك هل قال أحد منكم هذا القول؟ فذكرت أن لا، فقلت: لو كان أحد قال هذا القول قبله لقلت رجل يتأسى بقول قيل قبله. وسألتك هل كان من آبائه من ملك؟ فذكرت أن لا، قلت: فلو كان من آبائه من ملك قلت: رجل يطلب ملك أبيه. وسألتك: هل كنتم تتهمونه بالكذب قبل أن يقول ما قال؟ فذكرت: أن لا. فقد أعرف أنه لم يكن ليذر الكذب على الناس ويكذب على الله. وسألتك: أشراف الناس اتبعوه أم ضعفاؤهم؟ فذكرت: أن ضعفاءهم اتبعوه، وهم أتباع الرسل. وسألتك: أيزيدون أم ينقصون؟ فذكرت: أنهم يزيدون، وكذلك أمر الإيمان حتى يتم. وسألتك: أيرتد أحد سخطة لدينه بعد أن يدخل فيه فذكرت: أن لا، وكذلك الإيمان حين تخالط بشاشته القلوب. وسألتك: هل يغدر؟ فذكرت: أن لا، وكذلك الرسل لا تغدر. وسألتك بما يأمركم؟ فذكرت أنه يأمركم أن تعبدوا الله ولا تشركوا به شيئا، وينهاكم عن عبادة الأوثان، ويأمركم بالصلاة والصدق والعفاف، فإن كان ما تقول حقا فسيملك موضع قدمي هاتين. وقد كنت أعلم أنه خارج لم أكن أظن أنه منكم، فلو أني أعلم أني أخلص إليه لتجشمت لقاءه، ولو كنت عنده لغسلت عن قدمه.

ثم دعا بكتاب رسول الله الذي بعث به دحية إلى عظيم بصرى، فدفعه إلى هرقل، فقرأه، فإذا فيه:

بسم الله الرحمن الرحيم

من محمد عبدالله ورسوله إلى هرقل عظيم الروم. سلام على من اتبع الهدى. أما بعد فإني أدعوك بدعاية الإسلام، أسلم تسلم، يؤتك الله أجرك مرتين. فإن توليت فإن عليك إثم الأريسيين ﴿قل يا أهل الكتاب تعالوا إلى كلمة سواء بيننا وبينكم أن لا نعبد إلا الله ولا نشرك به شيئا ولا يتخذ بعضنا بعضا أربابا من دون الله، فإن تولوا فقولوا اشهدوا بأنا مسلمون﴾ (آل عمران: ٦٤).

قَالَ أَبُو سُفْيَانَ: فَلَمَّا قَالَ مَا قَالَ، وَ فَرَغَ مِنْ قِرَاءَةِ الْكِتَابِ، كَثُرَ عِنْدَهُ الصَّخَبُ، وَ ارْتَفَعَتِ الأَصْوَاتُ، وَ أُخْرِجْنَا. فَقُلْتُ لأَصْحَابِي حِينَ أُخْرِجْنَا: لَقَدْ أَمِرَ أَمْرُ ابْنِ أَبِي كَبْشَةَ، إِنَّهُ يَخَافُهُ مَلِكُ بَنِي الأَصْفَرِ. فَمَا زِلْتُ مُوقِنًا أَنَّهُ سَيَظْهَرُ حَتَّى أَدْخَلَ اللَّهُ عَلَيَّ الإِسْلاَمَ.

وَكَانَ ابْنُ النَّاظُورِ -صَاحِبُ إِيلِيَاءَ وَهِرَقْلَ- سُقُفًّا عَلَى نَصَارَى الشَّأْمِ يُحَدِّثُ أَنَّ هِرَقْلَ قَدِمَ إِيلِيَاءَ أَصْبَحَ يَوْمًا خَبِيثَ النَّفْسِ، فَقَالَ بَعْضُ بَطَارِقَتِهِ: قَدِ اسْتَنْكَرْنَا هَيْئَتَكَ. قَالَ ابْنُ النَّاظُورِ: وَكَانَ هِرَقْلُ حَزَّاءً يَنْظُرُ فِي النُّجُومِ. فَقَالَ لَهُمْ حِينَ سَأَلُوهُ: إِنِّي رَأَيْتُ اللَّيْلَةَ حِينَ نَظَرْتُ فِي النُّجُومِ مَلِكَ الْخِتَانِ قَدْ ظَهَرَ، فَمَنْ يَخْتَتِنُ مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ؟ قَالُوا: لَيْسَ يَخْتَتِنُ إِلاَّ الْيَهُودُ، فَلاَ يُهِمَّنَّكَ شَأْنُهُمْ، وَ اكْتُبْ إِلَى مَدَائِنِ مُلْكِكَ فَيَقْتُلُوا مَنْ فِيهِمْ مِنَ الْيَهُودِ. فَبَيْنَمَا هُمْ عَلَى أَمْرِهِمْ أُتِيَ هِرَقْلُ بِرَجُلٍ أَرْسَلَ بِهِ مَلِكُ غَسَّانَ يُخْبِرُ عَنْ خَبَرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ. فَلَمَّا اسْتَخْبَرَهُ هِرَقْلُ قَالَ: اذْهَبُوا فَانْظُرُوا أَمُخْتَتِنٌ هُوَ أَمْ لاَ؟ فَنَظَرُوا إِلَيْهِ، فَحَدَّثُوهُ أَنَّهُ مُخْتَتِنٌ، وَ سَأَلَهُ عَنِ الْعَرَبِ فَقَالَ: هُمْ يَخْتَتِنُونَ. فَقَالَ هِرَقْلُ: هَذَا مَلِكُ هَذِهِ الأُمَّةِ قَدْ ظَهَرَ. ثُمَّ كَتَبَ هِرَقْلُ إِلَى صَاحِبٍ لَهُ بِرُومِيَةَ، وَكَانَ نَظِيرَهُ فِي الْعِلْمِ. وَ سَارَ هِرَقْلُ إِلَى حِمْصَ، فَلَمْ يَرِمْ حِمْصَ حَتَّى أَتَاهُ كِتَابٌ مِنْ صَاحِبِهِ يُوَافِقُ رَأْيَ هِرَقْلَ عَلَى خُرُوجِ النَّبِيِّ ﷺ وَ أَنَّهُ نَبِيٌّ. فَأَذِنَ هِرَقْلُ لِعُظَمَاءِ الرُّومِ فِي دَسْكَرَةٍ لَهُ بِحِمْصَ، ثُمَّ أَمَرَ بِأَبْوَابِهَا فَغُلِّقَتْ، ثُمَّ اطَّلَعَ فَقَالَ: يَا مَعْشَرَ الرُّومِ، هَلْ لَكُمْ فِي الْفَلاَحِ وَ الرُّشْدِ وَأَنْ يَثْبُتَ مُلْكُكُمْ فَتُبَايِعُوا هَذَا النَّبِيَّ؟ فَحَاصُوا حَيْصَةَ حُمُرِ الْوَحْشِ إِلَى الأَبْوَابِ فَوَجَدُوهَا قَدْ غُلِّقَتْ، فَلَمَّا رَأَى هِرَقْلُ نَفْرَتَهُمْ وَ أَيِسَ مِنَ الإِيمَانِ قَالَ: رُدُّوهُمْ عَلَيَّ. وَقَالَ: إِنِّي قُلْتُ مَقَالَتِي آنِفًا أَخْتَبِرُ بِهَا شِدَّتَكُمْ عَلَى دِينِكُمْ، فَقَدْ رَأَيْتُ. فَسَجَدُوا لَهُ وَ رَضُوا عَنْهُ، فَكَانَ ذَلِكَ آخِرَ شَأْنِ هِرَقْلَ.

رَوَاهُ صَالِحُ بْنُ كَيْسَانَ وَ يُونُسُ وَ مَعْمَرٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ.

له پاش ئەوەی لێ بوویەوە لە باسی سەرەتاو یەکەم جاری هاتنی وەحی، ئینجا دێتە سەر باسی هێندێ لە سیفاتی پێغەمبەر ﷺ کە بە شایەتی پاشای رۆم نیشانەی راستی پێغەمبەری نازیزی دا ﷺ تا رادەیەک خەریک بوو ئیمان بهێنێ ئەگەر مەترسی نەکردایە لە

..ا گەرانەوەی گەلەکەی وەک ئەم حەدیسە باسی ئەکات کە ئەیهێنێ لە ئیبن وعەباسەوە -خوا لێیان رازی بێت- کە ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب هەواڵی پێداوە کە هیرەقلی پاشای رۆم ..بە لای لەگەڵ کۆمەڵێ لە قورەیش کە بازرگان بوون و چوو بوون بۆ شام (في المدة التي ...رسول الله ﷺ ماد فيها أبو سفيان و كفار قريش) لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ سوڵح و ..ەی کردبوو لەگەڵ کافرەکانی قورەیش لە پاش سوڵحی حودەیبیە (فأتوه وهم بإيلياء) لە ..ایکدا لە فەلەستین بوون، ناردبووی بە شوێنیاندا تا بزانێ ئەمەی کە ئیدیعای پەیغەمبەری ئەکات چۆنە، وە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ نامەی نووسی بوو بۆ پاشای رۆم و هەموو پاشاکانی تری بانگ کردبوو بۆ ئیمان هێنان. (فدعاهم في مجلسه) ئینجا بۆ ئەو مەبەستە ناردبووی بە دوایاندا و داینان لە مەجلیسی خۆیدا (وحوله عظماء الروم) بە دەوریدا بوون پیاو ماقوڵ و گەورەکانی رۆم (ثم دعاهم و دعا بترجمانه فقال: أيكم أقرب نسبا بهذا الرجل الذي يزعم أنه نبي؟) ئینجا بانگی کردن بۆ پرسیارو وەڵام و بانگی تەرجومانەکەی خۆی کردو گوتی بە تەرجومانەکەی پرسیاریان لێ بکە کامتان نزیکترین خزمی ئەم پیاوەن کە لافی پێغەمبەرایەتی لێ ئەدات؟ (فقال أبو سفيان: فقلت: أنا أقربهم نسبا). ئەبو سوفیان ئەڵێ: گوتم من. (فقال أدنوه مني) ئینجا هیرەقل گوتی: ئەمە نزیک بخەنەوە لە من (وقربوا أصحابه فاجعلوهم عند ظهره) هاوەڵەکانی لە پشتیەوە دابنێن، (ثم قال لترجمانه: قل لهم) ئینجا گوتی بە تەرجومانەکەی پێیان بڵێ: (إني سائل هذا عن هذا الرجل) من پرسیار ئەکەم لەمە لەبارەی ئەم پیاوەوە (فإن كذبني فكذبوه) ئەگەر درۆی لەگەڵ کردم ئێوە بیخەنەوە بە درۆوە. ئەبو سوفیان ئەڵێ: (فوالله لو لا الحياء من أن يأثروا عليّ كذبا لكذبت عنه) ئەگەر شەرمم ئەکردایە لەوەی بم خەنەوە بە درۆوە درۆم ئەکرد دەربارەی پێغەمبەر ﷺ و شتی درۆم بۆ هەڵئەبەست، بەڵام ئەم وێرا لەوەڵامەکاندا هەر راستم گوت (ثم كان أول ما سألني عنه أن قال: كيف كان نسبه فيكم؟) ئینجا یەکەم پرسیاری لە من لە بارەی پێغەمبەرەوە ئەمە بوو ئەسەب و ئەژادی لەناو ئێوەدا چۆنە؟ (قلت هو فينا ذو نسب) گوتم ئەو پیاوە لەناوماندا خاوەن ئەسەب و ئەژادێکی گەورەیە. (قال: فهل قال

هذا القول منكم أحد قط قبله ؟) گوتی ئایا هیچ کەسێکی تر لە ئێوە پێش ئەم ئەم قسەی کردووەو ئەم لافەی لێداوە؟ (قلت: لا) گوتم: نەخێر. (قال فهل کان من آبائه من ملك ؟) گوتی ئایا لەناو باوک و باپیریدا هیچ مەلیک و پادشا بووە (قلت: لا). گوتم نەخێر. (قالَ فأشراف الناس يتبعونه أم ضعفاؤهم ؟) گوتی: ئایا پیاو ماقوڵ و پیاوە گەورەکان شوێنی ئەکەون یان ژێر دەستەو هەژارەکان (فقلت: بل ضعفاؤهم) منیش گوتم ژێر دەستەو هەژارەکان دوای ئەکەون. (قال: هل يزيدون أم ينقصون؟) گوتی ئایا لە بەرەوە زیاد ئەکەن یان کەم ئەبنەوە؟ (قلت: بل يزيدون) گوتم کەم ناکەن بەڵکو لەبەرەوە زیاد ئەبن. (قال: فهل يرتد أحد منهم سخطة لدينه بعد أن يدخل فيه؟) ئایا هیچ کەس لە شوێن کەوتووەکانی پاشگەز ئەبنەوە لەبەر ناڕەزایییان لە ئایینەکەی؟ (قلت: لا) گوتم نەخێر (قال: فهل كنتم تتهمونه بالكذب قبل أن يقول ما قال؟) ئایا تۆهمەتی درۆی پێ ئەبەن پێش ئەمەی ئەم قسەو لافە لێ بدات؟ (قلت: لا) گوتم نەخێر (قال: فهل يغدر؟) گوتی: ئایا پەیمان ئەشکێنێ و غەدر ئەکات. (قلت:لا) گوتم نەخێر، (ونحن منه في مدة لا ندري ما هو فاعل فيها) ئێمە ماوەیەکە دوورکەوتووینەتەوە لێی نازانین ئەم ماوەیە چی کردووە؟ (قال ولم تمكني كلمة أدخل فيها شيئا غير هذه الكلمة). ئەبو سوفیان گوتی: لە وەڵامەکانم بۆم نەکرا هیچ وشەیەک بڵێم کە بکرێ بە لەکە بەسەریەوە، بێجگە لەم وشەیە: (قال: فهل قاتلتموه؟) ئایا شەڕو جەنگتان لەگەڵ کردووە؟ (قلت: نعم) وتم بەڵێ جەنگمان بووە لەگەڵی (قال: فكيف كان قتالكم إياه؟) گوتی: دەی چۆن بووە شەڕو تێ جەنگینتان لەگەڵی؟ (قلت: الحرب بيننا و بينه سجال) گوتم جەنگمان لەگەڵی بە نۆبە بووە (ينال منا و ننال منه) ئەو زەربە ئەدا لە ئێمەو ئێمەش زەربە ئەدەین لەو. (قال: ماذا يأمركم؟) گوتی: فەرمانی چیتان پێ ئەدات؟ (قلت: يقول اعبدوا الله وحده و لا تشركوا به شيئا) گوتم: ئەڵێ خوا بپەرستن بە تەنیاو هیچ شتێک مەکەن بە هاوبەشی (و اتركوا ما يقول آباؤكم) واز بێنن لەوەی باوکو باپیرتان ئەیڵێن (ويأمرنا بالصلاة والصدق و العفاف) فەرمانمان پێ ئەدات بە نوێژو بە راستی و داوێن پاکی (والصلة) وە بەجێ هێنانی سیلەی

ڕەحم، (قال لترجمانه) ئینجا هیرەقل وتی بە تەرجومانەکەی: (قل له) بە ئەبو سوفیان بڵێ: (سألتك عن نسبه فذكرت إنه فيكم ذو نسب) پرسیارم لێ کردی لە نەسەب و نەژادی گوتت: لەناو ئێوەدا خاوەن نەسەبە (فكذلك الرسل تبعث في نسب قومها) هەر بەو جۆرە پێغەمبەران ڕەوانە ئەکرێن لەناو خاوەن نەسەبی گەلەکانیاندا (وسألتك هل قال أحد منكم هذا القول؟) وە پرسیارم لێ کردی کە کەس لە ئێوە ئەم قسەیەی کردووە -واتە بڵێ من پێغەمبەرم- فذكرت :أن لا تۆش گوتت: نەخێر. (فقلت لو كان أحد قال هذا القول قبله لقلت رجل يأتسي بقول قيل قبله) منش گوتم: ئەگەر پێش ئەم کەسێکی تر ئەو قسەی کردبێ ئەمگوت ئەم پیاوە شوێن قسەی ئەو کەسە کەوتووە. (وسألتك هل كان من آبائه من ملك؟) پرسیارم لێ کردی ئایا لەناو باوک و باپیرانیدا مەلیک و پادشا بووە (فذكرت: أن لا) گوتت: نەخێر. (قلت: فلو كان من آبائه من ملك قلت: رجل يطلب ملك أبيه) گوتم ئەگەر ببوایە ئەم گوت ئەم پیاوە بە دوای پادشایی باوک و باپیریدا ئەگەڕێ. (وسألتك: هل كنتم تتهمونه بالكذب قبل أن يقول ما قال؟) وە پرسیارم لێ کردی ئایا توهمەتی درۆی لێ دەکەن پێش ئەوەی ئەم قسە بکات؟ (فذكرت: أن لا) گوتت: نەخێر. (فقد أعرف أنه لم يكن ليذر الكذب على الناس و يكذب على الله) کەواتە ماتوڵێ ئەم پیاوە درۆی لەگەڵ خەڵکی نەکردبێ هەرگیز درۆ لەگەڵ خوا ناکات. (وسألتك: أشراف الناس اتبعوه أم ضعفاؤهم؟) وە پرسیارم کرد ئایا پیاو ماقوڵ شوێنی ئەکەون یان هەژارو بێ دەسەلات؟ (فذكرت: أن ضعفاءهم اتبعوه) گوتت: هەژارو بێ دەسەلات شوێنی ئەکەون. (وهم أتباع الرسل) کە شوێن کەوتووانی پێغەمبەران بێ دەسەلات و هەژارەکانە. (وسألتك: أيزيدون أم ينقصون؟) وە پرسیارم کرد ئایا شوێن کەوتووەکانی زیاد ئەکەن یان کەم ئەبنەوە؟ (فذكرت: أنهم يزيدون) گوتت: لەبەرەوە زیاد ئەکەن. (كذلك أمر الإيمان حتى يتمّ) کاری ئیمان بەو جۆرەیە تا ئەگاتە پایان. (وسألتك: أيرتد أحد منهم سخطة لدينه بعد أن يدخل فيه؟) وە پرسیارم کرد: هیچ کەس لە شوێن کەوتووانی پاشگەز ئەبنەوە لێی، لەبەر بێزارییان لە ئایینەکەی. (فذكرت: أن لا) گوتت: نەخێر. (وكذلك الإيمان حين تخالط بشاشته

القلوب) کاری ئیمان هەر بەو جۆرەیە کە بە تەواوی بچێتە دڵەوە. (وسألتك: هل يغدر؟) وە پرسیارم کرد: ئایا غەدر ئەکات؟ (فذكرت: أن لا) گوتت: نەخێر. (وكذلك الرسل لا تغدر) دیارە پێغەمبەران غەدر ناکەن (وسألتك: بما يأمركم؟) پرسیارم کرد: بە چی فەرمانتان پێ ئەدات. (فذكرت: أنه يأمركم أن تعبدوا الله و لا تشركوا به شيئا، و ينهاكم عن عبادة الأوثان، ويأمركم بالصلاة و الصدق و العفاف) گوتت: فەرمانمان پێ ئەدات بەوەی خوا بە تەنیا بپەرستین و هیچ شتێک نەکەین بە هاوبەشی و جڵەوگیریتان ئەکات لە بت پەرستی، فەرمانتان پێ ئەکات بە نوێژو راستی و داوێن پاکی. (فإن كان ما تقول حقا فيملك موضع قدمي هاتين) ئینجا هیرەقل گوتی: ئەگەر راست بێت ئەوەی تۆ ئەیڵێی ئەوا جێی ئەم دوو پێی من ئەگرێ. (وقد كنت أعلم أنه خارج لم أكن أظنه أنه منكم) من ئەمزانی پێغەمبەرێک پەیدا ئەبێ. بەڵام ئەم ئەزانی کە لە ئێوە ئەبێ -واتە عەرەب-. (فلو أني أعلم أني أخلص إليه لتجشمت لقاءه) ئەگەر من بمزانیایە ئەگەم پێی هەوڵم ئەدا بە زەحمەت بچم بۆ لای. (ولو كنت عنده لغسلت عن قدمه) وە ئەگەر من لای بوومایە پێم ئەشۆرد، واتە ئەوپەڕی خزمەتم ئەکرد (ثم دعا بكتاب رسول الله ﷺ) ئینجا داوای نامەکەی پێغەمبەری کرد (الذي بعث دحية إلى عظيم بُصرى) کە بۆی ناردبوو بە (دحیەی کەلەبی)دا کە بیبات بۆ لای گەورەی (بوسرا) و ئەویش بینێرێ بۆ هیرەقل (فدفعه إلى هرقل) ئەویش ناردبووی بۆ هیرەقل. (فقرأه فإذا فيه) خوێندیەوە کە ئەزانێ نامەکەی بەم جۆرەیە (بسم الله الرحمن الرحيم من محمد عبدالله و رسوله إلى هرقل عظيم الروم) لە(محمد)ەوە کە بەندەی خواو پێغەمبەریەتی بۆ لای هیرەقل کە گەورەی رۆمە (سلام على من اتبع الهدى) سەلام لەسەر هەرکەس بێت کە شوێنی رێگەو رێنموونی خوا ئەکەوێ (أما بعد فإني ادعوك بدعاية الإسلام) لە پاش ئەوە بە راستی من بانگت ئەکەم بە وتەیە کە بانگ ئەکات بۆ ئیسلام کە کەلیمەی شایەتومانە (أسلم تسلم يؤتك الله أجرك مرتين) موسڵمان ببە تا سەلامەت ببی لە سزای خواو موسڵمان ببە تا خوا پاداشتت بداتەوە دووجار. پاداشتی ئیمان هێنان بە شەریعەتی ئینجیل وە پاداشتی ئیمان هێنان بە قورئان (فإن توليت فإنما عليك إثم

الأريسيين) ئەگەر سەرپێچی ئەکەیت لە گوێڕایەڵی من ئەوە لەسەر تۆیەو لە گەردنی تۆیە گوناهی فەلاح و کشتوکاڵ کەران و رەعیەت کە شوێنت کەوتوون، ئەگەر تۆ باوەڕ بێنی ئەوانیش باوەڕ ئەهێنن، کەواتە تۆ هۆی باوەڕ نەهێنانی ئەوانی ئەک مەبەست ئەوەیە کە گوناهەکەی ئەوان لە گەردنی هیرقل دایە. ﴿ويا أهل الكتاب تعالوا إلى كلمة سواء بيننا و بينكم ان لا نعبد إلا الله و لا نشرك به شيئا ولا يتخذ بعضنا بعضا أربابا من دون الله، فإن تولوا فقولوا اشهدوا بأنا مسلمون﴾ واتای ئایەتەکە: ئەی نامەدارەکان وەرن بۆ لای ئەم وتەیەو وەری گرن کە ئەو وتەیە یەکسانە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا کە ئەو وتەش ئەمەیە بێجگە لە خوا هیچ شتێک نەپەرستین و هیچ شتێک نەکەین بە هاوبەشی، وە هیچ کام لە ئێمەو ئێوە هەندێکمان نەکەین بە پەروەردگارو تێپەڕ بکەین لە پەروەردگاریتی خواو هەر ئەو بپەرستین و هەر ئەو بکەین بە پەروەردگار -نە بڵێین عوزەیر کوڕی خوایە و نە بڵێین عیسا کوڕی خوایە-. با گوێڕایەڵی عابیدو زاناکانمان نەکەین لە هەر حوکم و بڕیارێکدا کە دەست هەڵبەستی خۆیان بێت و دایان هێنابێ، جا ئەگەر نامەدارەکان پشتیان کردە ئەم فەرمانی خواو گوێڕایەڵیان نەکرد، ئەوا ئێوە ئەی موسڵمانەکان بڵێن بە هەموان بە شایەت بن کە ئێمە موسڵمان و مل کەچین بۆ خواو بۆ هەموو حوکم و بڕیارەکانی خوا. ئەوە بوو ئەو نامە پیرۆزە کورت و پڕ ماناو مەبەستە کە نووسی بۆ پادشای رۆم (قال أبو سفيان) ئەبو سوفیان وتی: (فلما قال ما قال و فرغ من قراءة الكتاب) کاتێ هیرەقل ئەو قسانەی کرد کە کردی و لێی بوویەوە لە خوێندنی ماناکەی بە هۆی تەرجومانەکەی (كثر عنده الصخب و ارتفعت الأصوات) غەڵبە غەڵب زۆر بوو لای هیرقل و دەنگیان بەرز بوویەوە (وأخرجنا) ئێمە دەرکراین لە مەجلیسەکەیان (فقلت لأصحابي حين أخرجنا: لقد أمر أمر ابن إبي كبشة) گوتم بە هاوڕێکانم کاتێک دەرکراین: بەراستی بەرز بوویەوە کاری ئیبن ئەبی کەبشە -واتە پێغەمبەری ئازیزﷺ- کە ئەبو کەبشە باوکی شیری بوو (إنه يخاف منه ملك بني الأصفر) بەراستی پادشای رۆم لێی دەترسێ -بە رۆم گوتراوە بني آلأصفر- واتە نەوەی زەردوام، چونکە باپیرە گەورەیان کچی پادشای حەبەشەی هێنابوو لە نێوان ئەمان کە سوورو سپی بوون و ئەوان کە رەش بوون ئەم تائیفە پەیدا بوو کە تێکەڵە لەو دوو تیرەیە (فما زلت موقنا أنه

سيظهر حتى أدخل الله علي الإسلام) ئينجا له دڵمدا جێگیر بوو، وه بڕوام وابوو كه سەر ئەكەوێ هەتا خوا ئیسلامی له دڵمدا دامەزراندو موسڵمان بووم (وكان ابن الناطور -صاحب إيلياء و هرقل-) ئیبن ناتوور كه ئەمیری -بيت المقدس- بوو> وه هاوڕێی هیرەقل بوو (سقفا على نصارى الشام) كرابوو به سەرۆك و ئەمیر لەسەر نەسرانییەكانی شام (يحدث أن هرقل حين قدم إيلياء) ئەڵێ كاتێ گەیشتە -بيت المقدس- (أصبح خبيث النفس) واته گەڕا به كەسێكی ناوچاو دڕژو مات و عاجز (فقال بعض بطارقته) به هۆی ئەوەوە هەندێ له بەتریرەكانی -قاندو پیاوە تایبەتییەكانی- (قد استنكرنا هيئتك) پێیان گوت: بەراستی شێوەو هەیبەتەكەت ناخۆش دەبینین، وەک جاران نیت. (قال ابن الناطور) ئیبن ناتوور ئەڵێ: (وكان هرقل حزاء) هیرقل كاهین بوو (ينظر في النجوم) تەماشای ئەستێرەكانی ئەكردو ئەستێرەگەری ئەكرد.

كاهین باو بوو له چەرخی نەفامیدا، وه كاهینێتی بریتی بوو له ئیدیعای غەیب زانی، ئەوەش به دوو جۆر ئەكرا: به قسه له شەیاتینەوە وەری ئەگرت یان به سەرنج دانی حساباتی ئەستێرەگەری به هەموو بارەكانییەوە بەناردنی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ خوا نەیهێشت.

وەرگرتنیان له شەیاتین بەو جۆرە بوو ئەچوون بۆ ئاسمان و گوێیان ئەگرت لەمەلائیكە. ئینجا چەند درۆی خۆیان تێكەڵ ئەكرد، ئینجا له پاش رەوانەكردنی پێغەمبەرﷺ بەرگری كران له چوون بۆ ئاسمان، وەک له سورەتی (الجن)دائەفەرموێ. جا هیرقل به حسابی ئەستێرەگەری بۆی دەركەوتبوو هاتنی پێغەمبەر، لەبەر ئەوە دڕژو بێ تاقەت بوو، وەک ئەگێڕێتەوە له وەلامەكەی هیرقلدا، ئەڵێ: (فقال لهم حين سألوه:) هیرقل له وەلامدا وتی كاتێک پرسیاریان لێ كرد: (إني رأيت الليلة حين نظرت في النجوم) بەراستی ئەم شەو كاتێ سەرنجی ئەستێرەكانم دا بینیم: (ملك الختان قد ظهر) پادشای خەتان زاڵ بوو. قسەكەش به راست دەرچوو، چونكه سوڵحی حودەیبییە كراو ئەو سوڵحەش بوو به هۆی سەركەوتنی ئایینی خواو شكاندنی قورەیش و بت پەرستی (فمن يختتن من هذه الأمة؟) دەی ئایا كێ خەتەنە ئەكەن له ئەهلی ئەم چەرخە (قالوا: ليس يختتن إلا اليهود) گوتیان: بێجگه له جوولەكە كەس لەم چەرخەدا هیچ خەتەنە ناكات (فلا يهمنك شأنهم) كەواتە با هیچ

گوێت نەبێ لێیان، ئەوان ئەوە نین مەترسیان لێ بکرێ (واكتب إلى مدائن ملكك فيقتلوا من فيهم من اليهود) فەرمان دەر بکەو بنووسە بۆ هەموو شارەکانی ولاتەکەت کە هەرچی جوولەکە هەیە بیانکوژن. (فبينما هم على أمرهم) لەم تەگبیرو باسەی خۆیاندا بوون (أتى هرقل برجل أرسل به ملك غسان) پیاوێکیان هێنا بۆ لای هیرقل کە مەلیکی غەسان ناردبووی (يخبر عن خبر رسول الله ﷺ) هەواڵی ئەدا لە بارەی پەیدا بوونی پێغەمبەرەوە ﷺ (فما استخبره هرقل) کاتێ هیرقل هەواڵی لێ پرسی و ئەویش بەو جۆرە هەواڵەکەی دا (قال: اذهبوا فانظروا أهو مختتن أم لا؟) وتی: بڕۆن تەماشا بکەن ئایا ئەو پیاوە خەتەنە کراوە یا نە،؟ (فنظروا إليه فحدثوه أنه مختتن) سەرنجی پیاوەکەیاندا و ئینجا هەواڵیان دا بە هیرقل کە خەتەنە کراوە (وسأله عن العرب) وە پرسیاری لێ کرد لە بارەی عەرەبەوە (فقال: هم يختتنون) ئەویش گوتی: بەڵێ عەرەب خەتەنە ئەکەن. (فقال: هذا ملك هذه الأمة قد ظهر) ئەمەیە من دیتم پادشای ئەم ئوممەتی عەرەبەیە ئەوا دەرکەوت. (ثم كتب هرقل إلى صاحب له برومية) ئینجا هیرقل نامەیەکی نووسی بۆ هاورێیەکی لە (رومییە) (وكان نظيره في العلم) کە هاوشانی خۆی بوو لە علیمدا (وسار هرقل إلى حمص) هیرقل ڕۆیشت بۆ شاری حیمص (فلم يرم حمص حتى أتاه كتاب من صاحبه يوافق رأي هرقل على خروج النبي ﷺ و أنه نبي) لە حمص دەرنەچوو تا نامەی بۆ هات لە هاوەڵەکەیەوە ڕێک بوو لەگەڵ ڕای هیرقلدا کە پێغەمبەر ﷺ ڕەوانە کراوە، وە بە ڕاستی پێغەمبەرە. (فأذن هرقل لعظماء الروم في دسكرة له بحمص) ئینجا هیرقل ئیزنی گەورەکانی ڕۆمی دا کە بچنە ناو قەسرەکەی کە هەیەتی لە حمصدا (ثم أمر بأبوابها فغلقت) پاشان فەرمانی دا بە داخستن و قوفڵ دانی قاپییەکانی (ثم اطلع) ئینجا لە بەرزییەوە خۆی نیشان دان (فقال: يا معشر الروم) ئینجا گوتی: ئەی کۆمەڵی ڕۆم (هل لكم في الفلاح و الرشد) ئایا مەیل و ئارەزووتان هەیە لە گەیشتن بە ئامانج و سەرکەوتن و ڕزگاری و سەر لێ تێک چوون؟ (وأن يثبت ملككم فتبايعوا هذا النبي) وە ئەگەر ئەتانەوێ پادشاییەکەتان بەردەوام بێ، ئەوا پەیمان بدەن بەم پێغەمبەرەو باوەڕی پێ بهێنن (فحاصوا

حيصة الوحش إلى الأبواب) لەگەڵ ئەوەی وت گەلەکەی بەجارێ بە وێنەی کەرە کێوی هەڵیان تیزان بەرەو قاپییەکان (فوجدوها قد غلقت) سەرنجیان دا هەموو داخراوە (فلما رأي هرقل نفرتهم و أيس من الإيمان) کاتێ هیرقل بینی بێزاریان و نائومێد بوو لە باوەڕهێنانیان (قال ردوهم علي) گوتی: بیانگێڕنەوە بۆ لام (وقال: إني قلت مقالتي آنفا) پێی گوتن: من ئەو قسە کە کردم (أختبر بها شدتكم على دينكم) بەوە تاقیتان بکەمەوە لە بارەی شیدەت و بەهێزیتان لەسەر دینەکەتان (فقد رأيت) ئەوا بەراستی بینیم (فسجدوا له و رضوا عنه) ئەوانیش سوژدەیان بۆ بردو رازی بوون (فكان هذا آخر شأن هرقل) ئەمە دواترین بارو وەزعی هیرقل بوو لە بارەی ئەوداستانەو بڕوا هێنانی.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٥١، ٢٦٨١، ٢٨٠٤، ٢٩٧٨، ٣١٧٤، ٤٥٥٣، ٥٩٨٠، ٦٢٦٠، ٧١٩٦، ٧٥٤١)دا دووبارە بووەتەوە.

***　***　***

ئینجا کە لێ بوویەوە لە باسی وەحی کە وەک سەرەتا وابوو بۆ ئەم کتێبە پیرۆزە،ئەوا دەستی کرد بەمەبەستەکانی. لە یەکەم جارەوە باسی ئیمانی کرد، چونکە هەموو مەبەستەکان بەستراون بە ئیمانەوە، ئیمان یەکەم واجبە لەسەر موسڵمانەکان،لەبەر ئەوە فەرموی:

(٢)

## ﴿ كتاب الإيمان ﴾

### ١ـ بابُ قَولِ النَّبيِّ ﷺ: (بُنِيَ الإسْلامُ عَلى خَمْسٍ) وهُوَ قَولٌ وَ فِعْلٌ. وَيزِيْدُ وَ يَنْقُصُ.

قالَ اللّهُ تَعالى: ﴿لِيَزْدَادُوا إِيْمَانًا مَعَ إِيْمَانِهِمْ﴾ (الفتح: ٤) ﴿وَ زِدْنَاهُمْ هُدًى﴾ (الكهف: ١٣) ﴿وَ يَزِيْدُ اللّهُ الَّذِيْنَ اهْتَدَوا هُدًى﴾ (مريم: ٧٦) ﴿وَالَّذِيْنَ اهْتَدَوا زَادَهُمْ هُدًى وَ آتَاهُمْ تَقْوَاهُمْ﴾ (محمد: ١٧) ﴿وَ يَزْدَادَ الَّذِيْنَ آمَنُوا إِيْمَانًا﴾ (المدثر: ٣١) و قوله: ﴿أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَذِهِ إِيْمَانًا فَأَمَّا الَّذِيْنَ آمَنُوا فَزَادَتْهُمْ إِيْمَانًا﴾ (التوبة: ١٢٤) و قَوْلُهُ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿فَاخْشَوهُمْ فَزَادَهُمْ إِيْمَانًا﴾ (آل عمران: ١٧٣) وَ قَوْلُهُ تَعَالَى: ﴿وَمَا زَادَهُمْ إِلاَّ إِيْمَانًا وَ تَسْلِيْمًا﴾ (الأحزاب: ٢٢). وَ الْحُبُّ فِي اللهِ وَ الْبُغْضُ فِي اللهِ مِنَ الإِيْمَانِ. وَ كَتَبَ عُمَرُ بنُ عَبْدِالْعَزِيْزِ إِلَى عَدِيِّ بنِ عَدِيٍّ: إِنَّ لِلإِيْمَانِ فَرَائِضَ وَ شَرَائِعَ وَحُدُودًا وَسُنَنًا، فَمَنْ اسْتَكْمَلَهَا اسْتَكْمَلَ الإِيْمَانَ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَكْمِلْهَا لَمْ يَسْتَكْمِلِ الإِيْمَانَ، فَإِنْ أَعِشْ فَسَأُبَيِّنُهَا لَكُمْ حَتَّى تَعْمَلُوا بِهَا، وَ إِنْ أَمُتْ فَمَا أَنَا عَلَى صُحْبَتِكُمْ بِحَرِيْصٍ. وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ: ﴿وَلَكِنْ لِيَطْمَئِنَّ قَلْبِي﴾ (البقرة: ٢٦٠). وَقَالَ مُعَاذٌ: إِجْلِسْ بِنَا نُؤْمِنْ سَاعَةً. وَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: الْيَقِيْنُ: الإِيْمَانُ كُلُّهُ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: لاَ يَبْلُغُ الْعَبْدُ حَقِيْقَةَ التَّقْوَى حَتَّى يَدَعَ مَا حَاكَ فِي الصَّدْرِ. وَقَالَ مُجَاهِدٌ ﴿شَرَعَ لَكُمْ...﴾ (الشورى: ١٣) أَوْصَيْنَاكَ يَا مُحَمَّدُ وَإِيَّاهُ دِيْنًا وَاحِدًا. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ ﴿شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ (المائدة: ٤٨) سَبِيْلاً وَسُنَّةً.

لەم كیتابەیشدا هەر حەدیسێكی لەسەر مەرجی خۆی دەست كەوتبێ هێناویەتی تا

ئەگاتە کیتابی عیلم تا ئەگاتە کیتابی تر.

ئیمان لە زمانی عەرەبدا بریتی‌یە لە باوەڕ، وە لە شەرعدا بریتی‌یە لە باوەڕ کردن بە هەرچی پێغەمبەری ئازیزﷺ هێناویەتی لە لایەن خواوەو مل کەچی و بەستنەوەی دڵ پێ‌یەوە.

ئەم ئەندازە بڕیاری هەموو موسڵمانانی لەسەرە. لەگەڵ گوتنی شایەتومان لە لایەن هەرکەسێکەوە کە بتوانێ قسە بکات. وە ئەگەر ئەو وتنەی نەبێ لە دنیادا بە موسڵمان دانانرێ و حوکمی موسڵمانی بەسەردا نادرێ و ماوەتەوە لای خوا بۆ ڕۆژی دوایی. واتە بە دڵ بڕوای هەبێ و بەڵام شایەتومان نەهێنێ ئەو کەسەش کۆڕو جەماوەر بە موسڵمانی دانانێن، چونکە مەرجە کە نیشانەی بێ بڕوایی لەگەڵ نەبێ، وە ئەگەر ئەو نیشانە بوو ئیعتیبار بە باوەڕەکەی ناکرێ بە وێنەی کەسێ کە بە دڵ بڕوای هەبێ و بە ئیختیاری خۆی سوژدە بهات بۆ بت ئەو کەسە بە موسڵمان و باوەڕدار دانانرێ، کەواتە ئەو کەسەش کە بە ئیختیاری خۆی شایەتومان ئەهێنێ ماتوڵ نیشانەی بێ باوەڕی لەگەڵە ئیعتیبار بە باوەڕەکەی ناکرێ. هەروەها هەر نیشانەو کەم و کوڕی لەگەڵ بێت وەک ئەوە هەر بەندو بڕیارێ لە بڕیارەکانی ئیسلام بە ناتەواو یان بە نەشیاو دابنێ بۆ هەرکات و چەرخێ. ئەمەش هەق نی‌یە هیچ کەس گومانی بێ تیایدا، چونکە هەر بیروباوەڕو بڕیارێکی تر بە شیاوو ڕاست بزانێ ئەبێ بیرو باوەڕو بڕیارەکەی خواو پێغەمبەریﷺ بە ناڕاست و نەشیاو بزانێ، ئیسلام لە هیچ بیروباوەڕێکی تر وەرنەگیراوە، بەڵکو کۆکەرەوەی هەرشتێکە کەڵکی بێ بۆ جیهان و جیهانیان، پاک و بێگەردە لە دژو پێچەوانەی ئەوە، بیرو باوەڕەکانی تر کە لەم زەوی‌یە هەڵقوڵاون و لە ئاسمانەوە نەهاتوون هەر شتێکی چاکی تێدا بێ، چونکە تێکەڵە لە شتی خراپ و بەد پێویستە موسڵمان دووربێ لێیان، چونکە هەر شتێک پێک هاتبێ لە پاک و پیس پیسە. بۆ وێنە عەرەق و قومار کە بە فەرموودەی قورئان چەند سوودیان تێدایە، بەڵام خراپەو زیانەکانیان زۆرترو گەورەترە، کەواتە بێ وێنەو هاوبەشە، هەروەها هەر ناوێکی تری لێ بنرێ وەک ئەگوترێ ئیسلام و دیموکراتیەت یان ئیشتراکی‌یەت، چونکە ئەو ناوانە لەکەدارن و شتی بەدیان تێکەڵە، دەی نابێ و پێویستە ئیسلام پاک و خاوێن ڕابگیرێ وەک داهێنەرەکەی جل جلالە. ئەگەر هەر ناوێکی تری تێکەڵ بکرێ لە دەروونی نەزاناندا پاک و خاوێنی پەیدا ئەبێ بۆ ئەو بیروباوەڕە بەدانە، لە لایەکی تریشەوە ئەزان وا ئەزانێ ئیسلام

لەوانە وەرگیراوە -حاشا لله و نعوذ بالله- لەو باوەڕە. بەڵێ هەندێ لە نووسەرانی موسڵمانان وەک مەرحوم دکتۆر مصطفى السباعي کە کتێبێکی دانا بەناوی (اشتراکية الإسلام) یان وەک دکتۆر عثمان خلیل عثمان کە کتێبێکی هەیە بەناوی (ديمقراطية الإسلام) ئەو نووسراوانە بە نیازی ئەوە بوو کە خەڵکی نەشارەزا نزیک بخەنەوە لە ئیسلام، چونکە لەم چەرخە دوایی‌یەدا خەڵکی دوور کەوتنەوە لە حەقائقی ئیسلام و ئەو بیرو باوەڕانە زۆر پەسەندو بێ عەیب بوون لای نەشارەزاکان، بەڵام هەر خۆیان پەشیمان بوونەوە لەوەو بۆیان دەرکەوت زیانی ئەوە زۆرتر بوو خوا لێیان ببورێ با موسڵمانان زۆر بە وردی و تێکەیشتنەوە خۆیان بپارێزن لەو جۆرە هەڵانەش.

ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ سەر باسەکە: ئایا ئیسلام کە لای کۆڕو جەماوەر بریتی‌یە لە باوەڕو شایەتومان، ئیتر کردەوە بەشێکە لە ئیمان بە جۆرێ بە نەبوونی ئەو بەشە ئیمان پێک نایەت یان بەشێکە لە کەمالی ئیمان و بە بێ ئەوە حەقیقەتی ئیمان هەیەو بەڵام کەمالی نی‌یە.

ئینجا با بێینە سەر فەرمودەکەی ئیمامی بوخاری کە ئەفەرموێ: (و قول النبيﷺ بني الإسلام على خمس) ئەمە بابی ئیمانەوە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ ئیسلام بینا کراوە لەسەر پێنج پایە. واتە حەدیسەکانی ئەم بابە ئەگەڕێنەوە بە دەوری ئەو حەدیسەدا کە تەواوەکەی لەمەوپاش دێت، ئینجا لە یەکەم جارەوە لە بارەی ئیمانەوە دوو مەسەلە ئەهێنین:

١- تەعریفی ئیمان کە ئەفەرموێ: (هو قول و عمل) واتە ئەو ئیمانەی کە لێرەدا بابێکی بۆ دانراوە دوو شتە گوتن، واتە شایەتومان هێنان. وە کردەوە. بێگومان بە پێی ئایەت و حەدیس ئیمان باوەڕەو کردەوەی دڵە، کەواتە ئەبێ مەبەستی ئیمان ئەمە بێ گوتن و کردەوە بەرهەمی ئیمان و نیشانەیەتی ئەگەر ئەو بەرهەم و نیشانەی لەگەڵ نەبوو ئەو کەسە بە ئیماندار ناناسرێ.

یان ئەبێ مەبەست بە (عمل) شێوە گشتی‌یەکە بێت کە کردەوەی دڵ و کردەوەی ئەندامانە. ئەو کاتە گوتنەکەش ئەگرێتەوەو ئەبێ بڵێین: گوتنەکە بەشێکە بوونی پێویستەو بە بێ ئەوە ئیمان پێک نایەت، بەڵام کردەوەکانی مەرجن بۆ ئیمانی تەواو و کامل. بە کورتی ئەبێ فەرمودەی ئیمام بەو جۆرە راڤە بکرێ وەک زانایانی حەدیس و ئەوانە کە شەرحیان

کردووه له بوخاری شەریف بەو جۆرەیان فەرمووە.

٢- ئەفەرموێ: (يزيد و ينقص) ئیمان زیاد ئەکات و کەم ئەکات.

ئەم مەسەلەی زیاد کردن و کەم کردنەش شتێکە پێویست ئەکات بە درێژیی لێکۆڵینەوەی تێدا بکرێ. بێگومان ئیمان لە راستیدا بریتی‌یە لە باوەڕهێنانی دڵ و گەردن کەچی دڵ و بەستنەوەی بە هەرچی کە لە لایەن خواوە هاتبێ بە کورتی لەو شتانەدا کە بە کورتی زانراوە، وە بە درێژیی لەو مەسەلانەدا کە بە درێژیی زانراون. ئەو باوەڕە ئەبێ بە هەموو جەزم و دڵنیایی‌یەکی تەواوە بێت ئیتر بە بەڵگە و دەلیل ئەوە پەیدا بووبێ یان هەر بە سروشت و ژیریی.

ئینجا ئەو باوەڕە بەهێزو قەتعی‌یە بۆ بڕیارو مەسەلەکانی کە زانراون و بەناوبانگن ئیسلام هێناونی. جا ئەم ئیمانە کە کۆڕو جەماوەری ئەهلی سوننەتی لەسەرە لە خولەفاو صەحابەو تابعین و غەیری ئەوان هەموو ئەوانە ئەفەرموون ئیمان زیادو کەم ئەکات وەک ئیمامی بوخاریش لەم کتێبە پیرۆزەدا ئەفەرموێ: (يزيد و ينقص) تەنانەت بە سەنەدێکی سەحیح هاتووە لە ئیمامەوە کە ئەفەرموێ: زیاد لە هەزار کەسم دیتوە لە زانا شارەزاکانی ئیسلام هیچ کەسم نەدیتوە لەم بارەوە کە نەفەرموێ: ئیمان گوتن و کردەوەیە، ئیمان زیادو کەم ئەکات. زیاد ئەکات بە تاعەت و گوێڕایەڵی. کەم ئەکات بە گوناه، زیاد ئەکات بە زۆری بەرهەم و کەم ئەکات بە کەم و کوڕی بەرهەم، یان زیاد ئەکات بە هۆی زیادە ئاگاداری بەسەر ئەسرارو نهێنی‌یەکانی ئیسلام و کەم و کوڕیش ئەکات بە هۆی کەم و کوڕی ئاگاداری و نەشارەزاییدا. بێگومان زیادو کەم و کوڕیی بەو شێوەی کە گوترا شتێکی ئاشکرایەو نابێ جێگای ئاژاوەو دووبەرەکی بێت. ئەوانەی کە ئەفەرموون: ئیمان زیادو کەم ناکات مەبەستیان بەشە براوەکەیەتی کە ئەبێ بگاتە رادەیەکی تەواو و یەقینی قەتعی، ئەگەر بەو جۆرە بڵێن ئەوا مەسەلەکە خیلافی تێدا نامێنێ، ئەو کاتە خیلاف و نیزاعەکە هەر بە دەمی و رواڵەتی رووتە، بەڵام لە دووبارەوە ئەو یەک خستنە سەرناگرێ، چونکە شتێکی روونە کە هەموو باوەڕەکان چوون یەک نین، بەڵکو بە ویژدان هەست ئەکرێ بەو جیاوازی‌یە وەک ئاشکرایە کە ئیمامی ئەبوبەکرو هاوەڵەکان قورس ترن و کەسانی تر هاوکێشیان نین. بەڵگەی دووەم لەسەر یەک نەخستنەکە ئەمەیە ئەگەر نیزاع و دووبەرەکی لەوەدا ببوایە ئەبو مەسەلەکە بەم جۆرە تەرح بکرایە: (الإيمان يقوي و يضعف) ئیمان بەهێزو لاواز ئەبێ، نەک بەوە (يزيد و ينقص)

زیاد ئەکات و کەم ئەکات.

ئەم باس و مەسەلەیە بە درێژیی لە کتێبەکانی عەقائدو کەلامدا روون کراوەتەوە، لە راستیدا بەم جۆرەی کە گوترا باشتر ئەچێتە دڵەوەو ئەو نیزاع و دوویەرەکی یە لە راستیدا هەیەو لە هەموو مەسەلەیەکی ئیجتیهادیدا هەریەکێک رێی بردووە بە حەقیقەت. نابێ سەر سوڕ بمێنێ لە رێ نەبردنی هەر ئیمام و پێشەوایەک، چونکە لەم ئومەتەدا تەنها پێغەمبەری نازدارﷺ پاکە لە هەڵەو مەعصومە، هەزارەها رەحمەت لە ئیمامی مالیک کە ئەفەرموێ: (کل یؤخذ من کلامە و یترك إلا صاحب هذا القبرﷺ) واتە: هەموو کەس قسەی لێ وەئەگیرێ، وازی لێ ئەهێنرێ تەنها خاوەنی ئەم گۆڕە نەبێ. ئینجا ئیمامی بوخاری -رەحمەتی خوای لێ بێت- بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەر زیادکردنی ئیمان بە هەشت ئایەت. دیارە ئیمان ئەگەر قابیلی زیادە بێت ئەبێ قابیلی کەم و کورییش بێت، کەواتە پێویست نی یە بە دەلیل هێنانەوە لەسەر کەم و کوریی:

١- لە سورەتی (الفتح)دا قورئان ئەفەرموێ: ﴿لیزدادوا إیمانا مع إیمانهم﴾. هەر ئەو خوایە نارامی خستە ناو دڵی ئیماندارانەوە تا ئیمانی تریان زیاد بکات لەگەڵ ئیمانەکانیاندا.

٢- لە سورەتی (الکهف)دا ئەفەرموێ: ﴿و زدناهم هدی﴾. ئەوانەلاوانێک بوون ئیمانیان هێنابوو بە پەروەردگاریان، ئێمەیش ئیمانەکەیانمان زیادکرد.

٣- لە سورەتی (مریم)دا ئەفەرموێ: ﴿و یزید الله الذین اهتدوا هدی﴾. زیاد ئەکات خوای گەورە هیدایەتی ئەوانەی رێگەی هیدایەتیان گرتووە. -وشەی هیدایەت لەم شوێنانەدا مانای ئیمانە.

٤- لە سورەتی (محمد)دا ئەفەرموێ: ﴿و الذین اهتدوا زادهم هدی و آتاهم تقواهم﴾. ئەوانەی رێگەی هیدایەتیان گرتووە -واتە ئیمانیان هێناوە بە خوای پەروەردگار- هیدایەتەکەیان -واتە ئیمانەکەیان- زیاد ئەکات و خواپەرستی یان پێ ئەبەخشێ.

٥- لە سورەتی (المدثر)دا ئەفەرموێ: ﴿و یزداد الذین آمنوا إیمانا﴾. بۆ ئەوەی ئیمانداران ئیمانیان زیاد بکات.

٦- لە سورەتی (التوبة) دا ئەفەرموێ: ﴿أیکم زادته هذه إیمانا فأما الذین آمنوا

فزادتهم إيمانا ﴾. كامتان ئەمە ئيمانى زياد كرد، ئەوانەى ئيمانيان بوو، ئيمانى زياد كردن.

٧- لە سورەتى (ال عمران)دا ئەفەرموێ: ﴿ فاخشوهم فزادهم إيمانا ﴾. بترسن لێيان كەچى ئيمانيان زيادى كرد.

٨- لە سورەتى (الأحزاب)دا ئەفەرموێ: ﴿ وما زادهم إلا إيمانا و تسليما ﴾. زيادى نەكردن ئيمان و مل كەچ بوون نەبێت بۆ خوا.

لە پاش ئەم ئايەتانە ئينجا ئەم فەرمودەى ئەهێنێ: (و الحب في الله و البغض في الله من الإيمان) خۆش ويستن و قین لێ بوون لەبەر خوا بەشێكە لە ئيمان. هەروەها ئەم فەرمودەى عومەرى كوڕى عبدالعزيز ئەهێنێ بە بەڵگە لەسەر زياد بوون و كەم بوونى ئيمان كە نووسى بۆ (عدى كوڕى عدى) (إن للإيمان فرائض و شرائع وحدودا وسننا) ئيمان چەند كردەوەيەكى فەرزى هەيە، چەند بيروباوەڕێكى دينى هەيە، چەند سنوورو قەدەغەيەكى هەيە، چەند رەوشت و كردەوەيەكى هەيە كە سوننەتن (فمن استكملها استكمل الإيمان) هەركەس ئەوانە بە تەواوى بەجێ بێنێ ئەو كەسە ئيمانى بە تێرو تەواوى بەجێ ئەهێنێ (ومن لم يستكملها لم يستكمل الإيمان) هەركەس ئەوانە بە تەواوى بەجێى نەهێنێ ئيمانى بە تەواوى بەجێ نەهێناوە. (فإن أعش فسأبينها لكم) ئەگەر مام و نەمردم هەموو ئەوانەتان بۆ باس ئەكەم و روونى ئەكەمەوە بۆتان (حتى تعملوا بها) تا رەفتارى پێ بكەن (فإن أمت فما أنا على صحبتكم بحريص) ئەگەر مردم ئەوا من سوور نيم لەسەر هاوڕێيەتيتان و بە دەست من نىيە مان و نەمانم. مەبەست لەم فەرمودە ئەمەيە عومەرى كوڕى عبدالعزيز كە يەكێكە لە خەليفە راشدەكان ئەويش راى لەسەر ئەوەيە كە ئيمان زيادو كەم ئەكات.

ئينجا فەرمودەكەى حەزرەتى ئيراهيم ئەكات بە بەڵگە لەسەر ئەم مەسەلەيە كە فەرمووى: ﴿ و لكن ليطمئن قلبي ﴾ كەوا نيشانى ئەدات ويستى ئەو ئيمانەى كە هەيەتى بەهێزتر بێ تا رادەيەك (علم اليقين)ەكەى ببێ بە (عين اليقين) وەك سعيدى كوڕى جوبەير ئەفەرموێ: (ليزداد يقيني) هەتا يەقينم زياد بكات. مجاهد ئەفەرموێ: (لأزداد إيمانا إلى إيماني) بۆ ئەوەى زياد بكەم ئيمانێكى تر بۆ لاى ئيمانەكەم. ئينجا ئايا بۆچى لە ريزى ئايەتەكانى پێشوودا نەيهێنا؟ لە وەڵامدا ئەڵێين: ئايەتەكانى پێشوو سەريح بوون لە

مەسەلەکەدا، بەڵام ئەم فەرمودەی ئیبراهیمی خەلیلە ﷺ بە وتەی ئایەتەکانی پێشوو سەریح ئەوەیە.

ئینجا فەرمودەی مەعاذی کوڕی جەبەل ئەکات بە بەڵگە کە فەرموی بە (ئەسوەدی ئەری هیلال): (اجلس بنا نؤمن ساعة) وەرە دانیشە لەگەڵمان ساتێک با ئیمان بێنین. بێگومان مەعاذ یەکێکە لە هاوەڵە گەورەکان و پلەی بەرزی بووە لە ئیماندا، کەواتە مەبەستی زیادە ئیمان بوونە.

ئینجا فەرمودەیەکی (ئیبن و مەسعود) ئەهێنێ کە فەرموی: (الیقین: الإیمان کله) یەقین هەموو ئیمانە. واتە ئیمانە چەند بەشێکەو یەقین هەموویەتی.

ئینجا فەرمودەیەکی (ئیبن وعومەر) ئەهێنێ بە بەڵگە کە فەرموی: (لا یبلغ العبد حقیقة التقوی حتی یدع ما حاك في الصدر) بەندە ناگاتە حەقیقەتی تەقوا هەتا واز نەهێنێ لە هەتەرمو خەیاڵێک کە هات و چۆ ئەکات لە دڵدا.

دەی ئەم فەرمودەیە وا نیشان ئەدات کە هێندێ لە ئیمانداران ناگەنە ئەو پلەو رادەیە، کەواتە ئیمان زیادو کەمی هەیە. هەرچەند ئایەتەکان بەس بوون بۆ بەڵگە، بەڵام رای ئەو هەموو پێشەواو ئیمامانە ئەبن بە هۆی زیادە دڵنیایی لەسەر راست و رەوایی مەسەلەکە.

هێندێ لەوانەی کە رایان لەسەر ئەوەیە ئیمان زیادو کەم ناکات ئەو فەرمودەی ئیبن و مەسعوذە ئەکەن بە بەڵگە کە هەرکاتێ یەقین لە دڵدا دامەزرا ئەندامەکان ئەکەونە کردەوەو تێکۆشان بۆ رەزامەندی خوا، کەواتە ئیمامی بوخاری راستی فەرموە کە کردوویەتی بە بەڵگە لەسەر زیاد کردنی ئیمان وەک (سوفیانی سەوری) ئەفەرموێ: ئەگەر یەقین بە رێکی دامەزرێ لەدڵدا ئەو دڵە ئەفڕێ بەرەو بەهەشت و راکردن لە ئاگر.

ئینجا فەرمودەیەکی (مجاهد) ئەهێنێ بەبەڵگە لەسەری ئەفەرموێ لە تەفسیری ئایەتی (١٣)ی سورەتی (الشوری)دا: ﴿شرع لکم...﴾ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: (أوصیناك یا محمد و إیاه دینا واحدا) فەرمانمان داوە بە تۆ ئەی محمد وە بە ئیبراهیمیش بە یەک دین کە ئەم دینی ئیسلامەیە، کە بریتییە لە ئایینی خواپەرستی بە تاک و تەنیاو تاعەت و گوێڕایەڵی، هەروەها فەرمانمان داوە بەو ئایینە بە ئیبراهیم و موساو عیسا کە ئەم پێنجە خاوەنی شەریعەتێکی تازەن و پێیان ئەگوترێ أولوا العزم –سەلامی خوا لە

هەمویان بێت-. فەرمانمان پێداون کە ئایینەکەتان بە رێک و پێکی و بە راستی راگیر بکەن. کەواتە لەو شەریعەتانەوە دەرئەکەوێ کە ئایینەکەی خوا بریتییە لە باوەڕو کردەوە. کەواتە مەبەستی (مجاهد) ئەوەیە ئەم ئایەتە بکات بە بەڵگە لەسەر ئەوە کە کردەوە بەشێکە لە ئیمان، نەک ئیمان هەر باوەڕ بێت.

رەخنە گیراوە لە تەفسیرەکەی (مجاهد) بەمە خیتابی ئایەتەکە بۆ کۆیەو تەفسیرەکە بە تاکە، بەڵام لە راستیدا لە پێغەمبەری ئازیزەوەﷺ فەرمانەکانی خوا ئەگات بە ئومەت لە یەکەم جارەوە ئەو شایانە بۆ ئەوە خوا رووی فەرموودەی تێ بکات. رەخنەیەکی تر گیراوە لە ئیمامی (مجاهد) -خوا لێی رازی بێت- کە بۆچی نوحی جیا کردەوە لە تەفسیرەکەدا لەگەڵ ئەوە لە ئایەتەکەدا بە هاوبەش هاتووە لەگەڵ سیانەکەی تردا، لە وەڵامدا گوتراوە نوح نزیک ترینە لە وتنداو راناویش بۆ نزیک بەجێ ترە. هەموو ئەوانی تریش هاوبەشن لە فەرمانەکەدا، کەواتە باسی هەرکامیان بەسەو وەک جێگری ئەوانیش وایە.

ئینجا فەرموودەیەکی ئیبن و عەباس ئەهێنێ کە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرموویەتی: ﴿ شرعةو منهاجا ﴾ کە ئەفەرموێ: (سبيلا وسنة) واتە رێگەیەکی روون و رۆشن -یەکەم تەفسیرە بۆ دووەم- هەروەها دووەم بۆ یەکەم، ئەمە پێی ئەگوترێ لف و نشری غير مرتب کە ئەوەش لە هەندێ کاتدا چاکەو وێنەی لە قورئان و حەدیسدا هاتووە، لێرەدا پرسیارێک ئەکرێ کە ئەم ئایەتە وا ئەگەیەنێ جیاوازی و ئیختیلاف هەیە، ئایەتی پێشوو وا نیشان ئەدات یەکێتی و یەکباری هەیە لە نێوان پێغەمبەرەکاندا. لە وەڵامدا ئەڵێین هەردوو جۆرەکە هەیە لە نێوان پێغەمبەرەکاندا یەکێتی هەیە لە ئەسڵی دیندا، جیاوازیان هەیە لە فەرعی دینداو نەسخ و سڕینەوە لەم دووەمەدا هەیەو لەسەر ئەم باری دووەمە کردەوە جیاوازە لە ئیمان و کەواتە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە وەک بەڵگەکانی تر.

**** **** ****

## ٢ـ باب دُعاؤُكُمْ إِيمَانُكُمْ

٨ـ حَدَّثَنَا عُبَيْدُاللهِ بن مُوسَى قَالَ أَخْبَرَنَا حَنْظَلَةُ بنُ أَبِي سُفْيَانَ عَنْ عِكْرِمَةَ بنِ خَالِدٍ عَنْ ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ : (بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيْتَاءِ الزَّكَاةِ، وَ الْحَجِّ، وَصَوْمِ

رَمَضَانَ).

وشـەی (باب)لە هەندێ نوسـخـەدا هەیەو لە هەندێ تردا نی‌یە، ئیـمـامی نەوەوی بوونەکەی بە هەڵە دائەنێ. رای بەهێز لەسەر ئەوەیە کە ئەم وتەیە فەرمودەی ئیبن و عەباسەو دەست نیشانە بۆ تەفسری ئەو ئایەتەی کۆتایی سورەتی (الفرقان): ﴿قل ما يعبؤ بكم ربي لولا دعاؤكم فقد كذبتم فسوف يكون لزاما﴾ واتە: ئەی پێغەمبەر بڵێ خوا هیچ گوێ‌ی لە ئێوە نی‌یە ئەی بێ باوەڕەکان ئەگەر باوەڕتان نەبێ دەی ئێوە باوەڕتان نەهێناو نیتانە، کەواتە بێگومان سزای خوا هەیە بۆتان و لێتان جوێ نابێتەوە. ئیمامی بوخاری ئەم تەفسیرەی هێناوە بە بەڵگە وەک بەڵگەکـانی پێشـوو و وتەی (و)ی -واتە "و"ی عـاتیـفـە- نەهێناوە بە پێ‌ی باوی خۆی لەبەر ئەوەی درێژەی پێ نەدات، وە هێنانی بە بەڵگە لەم رووەوەیە کە ئیـمـانی بە دوعا ناوبردووە، دوعاش کردەوەیە، خواو پێغەمبەرەکەی باش ئەزانن.

ئینجا حەدیسێکی تر ئەهێنێ کە چەند شتی گرنگی لێ وەرئەگیرێ وەک بەڵگەیەک لە بەڵگەکانی تر: ئیبن و عومەر -خوا لێ‌یان رازی بێت- ئەفەرموێ: (قال رسول اللهﷺ: بني الإسلام على خمس) پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: ئیـسلام بینا کراوە لەسەر پێنج پایە (شهادة أن لا إله إلا الله، و أن مـحـمـدا رسـول الله) شـایەتی دان کە هیـچ خوایەک نی‌یە بێـجگە لە (الله) و محمد فروستادەو نێرراوی خوایەو (و إقام الصلاة) بەجێ هێـنانی نوێژ بە رێـک و پێکی و بەردەوامی لەسەری و (وإيتاء الزكاة) زەکات دان بەو جۆرەی کە دیاریی کراوەو بەو کەسانەی کە دیاریی کراون (و الحج) حەج کردن و (و صوم رمضان) رۆژوو گرتنی مـانگی رەمەزان.

لە هێندێ ریوایەتدا رۆژوو پێش ئەخـات لە حـەج وا دەرئەکـەوێ ئەم ریوایەتی ئێـرە بەهێزتر بێت وەک بیستراوە لە ئیبن و عومەر -خوا لێ‌یان رازی بێت-.

لێرەدا پرسیارێ کراوە کە بینا کراو -کە ئیسلامە- ئەبێ جیاواز بێ لە بینا لەسەر کراو-کە فەرزەکانە-، کەچی لێرەدا بە رواڵەت یەکن. وەڵام دراوەتەوە بەوە بیناکراو هەمووەو بینا لەسـەر کـراو یەکـە یەکـەیە، بەڵام لە راسـتـیـدا لە یەکـەم جـارەوە پرسـیـارەکـە جێ‌ی سەرسووڕمانە، چونکە ئیسلام بریتی‌یە لەم ئایین و شەریعەتە کە گشتی‌یە بۆ هەموو کاروباری کـۆمـەڵایەتی و ئابووری و هەمـوو شـتـەکـانی ترو بینا لەسـەر کـراوەکـان ئەو پێنج پایەن و بە

وێنەی کۆشکێکی گەورەو فراوان کە بینا بکرێ و دامەزرێ لەسەر چەند پایەیەک. کاتێ ئەو پرسیارە ئەبێ وەڵام بدرێتەوە ئەگەر ئیسلام بریتی بووایە لەو پێنج پایە. ئەو پێنج پایە ناوبراون بە شیعارو نیشانەی بەندەیی بۆ خوا نەک ئەو پێنجە کرابن بە ئیسلام.

ئەم حەدیسە لە ژمارە: (٤٥١٥)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣ـ باب أُمُورِ الإِيْمَانِ

و قَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَ الْمَلاَئِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّيْنَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِيْنَ وَابنَ السَّبِيْلِ وَالسَّائِلِيْنَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلاَةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِيْنَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَاءِ وَحِيْنَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِيْنَ صَدَقُوا وأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾ (البقرة:١٧٧) ﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ﴾ (المؤمنون:١).

٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ الْعَقَدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ ابنُ بِلاَلٍ عَنْ عَبدِاللهِ بنِ دِيْنَارٍ عَنْ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (الإِيْمَانُ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنَ الإِيْمَانِ).

ئینجا درێژە ئەدا بە بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەو مەبەستەی کە خەریکین پێیەوە ئەفەرموێ: (باب أمور الإيمان) ئەمە بابی چەند کاروبارێکە کە بەشێکن لە ئیمان (و قول الله تعالى: ﴿ليس البر أن تولوا وجوهكم قبل المشرق و المغرب﴾ بابی ئەم فەرمودەی خوایە کە ئەفەرموێ: چاکەو کردەوەی چاک رووکردنتان نی‌یە بەرەو رۆژهەڵات و رۆژئاوا. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بە بۆنەی گۆڕانی قیبلە لە (بيت المقدس)ەوە بۆ (كعبة) کە جوولەکە کردیان بە هۆسەو هەراو فاک و فیک، جا لێرەدا (بیضاوی) ئەفەرموێ: چاکە هەر بریتی نی‌یە لە مەسەلەی قیبلە. ئەفەرموێ: پێیان بڵێ چاکە ئەوە نی‌یە کە ئێوەی لەسەرن. چونکە ئەو قیبلەی ئێوە ئەفی کراو باوی نەما. بەڵکو چاک و چاکە ئەمەیە کە لەم ئایەتە وەرئەگیرێ: ﴿من آمن بالله واليوم الآخرو الملائكة و الكتاب﴾ چاکە ئەو کەسەیە باوەڕی هێناوە بە خواو

بە رۆژی دوایی و حیساب و بڕیارو بە مەلائیکەی خواو بە کتێبی خوا کە قورئانە، یان هەموو کتێبەکانی خوا ﴿و النبیین و آتی المال علی حبه ذوي القربی و الیتامی والمساکین و ابن السبیل و السائلین﴾ بە پێغەمبەرەکانی خواو ماڵ ببەخشێ لەسەر خۆشەویستی خوا، یان لەگەڵ ئەوەی ماڵەکەی خۆش ئەوێ و پێویستی پێی هەیەو ئەیبەخشێ بە خزمە نزیکەکانی کە نەدارن و بە هەتیوان، وە بە هەژاران و سەفەرییەکان و سواڵکەرو داواکەرەکان ﴿وفي الرقاب﴾ وە ماڵ بەخت ئەکات لە ڕێی ئازاد کردنی خەڵکیدا ئیتر ئەو رزگار کردن و ئازاد کردنە بە هەرجۆرێ کە ئەگونجێ ﴿و أقام الصلاة وآتی الزکاة﴾ نوێژ ئەکات و زەکات ئەدات ﴿والموفون بعهدهم إذا عاهدوا﴾ ئەوانەی کە کاتێ عەهدو پەیمانیان دا وەفا ئەکەن بە پەیمانەکەیان و نایشکێنن. ئەم وتەیە عەتفە لەسەر ﴿من آمن﴾. وتەی ﴿من﴾ یەکسانە بۆ یەک و زیاد لە یەک و دروستە بە پێی دیمەنی لەفزەکەی بۆ یەک بەکار بهێنرێ وەک لە سەرەتاوە تا ئێرە، هەرچۆنێ دروستە بەکار بهێنرێ بۆ زیاد لە یەک و بۆ کۆ وەک لێرە بە دواوە تا دوایی ئایەتەکە. ﴿و الصابرین في البأساء و الضراء و حین البأس﴾ ئەوانەی کە خۆ ئەگرن و سەبر ئەکەن لە کاتی زیانی ماڵ و سامان و لە کاتی زیان و بەسەرهاتی سەختی بەدەن و لەشدا، لە کاتی تەنگی و بەربەرەکانی و جەنگ لەگەڵ دوژمندا وەک زوهەری بەم جۆرە تەفسیریان ئەکاتەوە. ئەم وشەیە ئەگەر عەتف بکرایەتەوە بۆ سەر ﴿الموفون﴾ ئەبو ﴿الصابرون﴾ە بوایە،بەڵام لەبەر گەورەیی خۆگرتن بە (منصوب)ی فەرموو کە ئەو شێوەیە لەم جۆرە شوێنانەدا مەدح و تایبەتێتی نیشان ئەدات ﴿أولئك الذین صدقوا وأولئك هم المتقون﴾ ئەوانەی کە خاوەنی ئەم سیفەت و کردەوانەن کە لەم ئایەتەدا باس کراون. هەر ئەوانەن کە راستن و راستیان کردووە لە دینداو لە شوێن کەوتنی هەق و چاکەداو هەر ئەوانە خۆپارێزەرن لە کوفرو تاوان و خراپەکانی تر. ئەم ئایەتە کۆکەرەوەی هەموو کەمالاتی ئادەمییەو ئەوانەن راست ئەکەن لەگەڵ خواو بەندەیانی خوادا. لە حەدیسێکدا هاتووە: (من عمل بهذه الآیة فقد استکمل الإیمان) هەرکەس رەفتار بکات بەم ئایەتە ئەو کەسە کەماڵی ئیمانی بەدەست هێناوە.

ئیمامی بوخاری ئەم ئایەتەی هێنا بە بەڵگەیەکی گەورە لەسەر راست و رەوایی

مەسەلەی زیاد کردن و کەم کردنی ئیمان وەک هەموو بەڵگەکانی تری رابردوو، هەروەها بەڵگەکانی تری داهاتوو کە یەکێ لەوانە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿قد أفلح المؤمنون﴾ بەراستی ئەوەی کە گەیشتووە بە ئامانج ئیمانداره ﴿الذين هم في صلواتهم خاشعون﴾ ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا مل کەچ و لە سام و بیمدان بەرامبەر پەروەردگاریان ﴿و الذين هم عن اللغو معرضون﴾ وە ئەوانەی کە روو وەرگێرن لە شتی بێ نرخ و بێ سوود، هەروەها نیشانەو سیفەتەکانی تر.

ئینجا حەدیسێک ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (الإيمان بضع و ستون شعبة) ئیمان شەست و ئەوەندە بەش و کۆمەڵەو (و الحياء شعبة من الإيمان) حەیاو شەرم بەشێکە لە ئیمان. بە تایبەتی باسی شەرم و حەیا ئەکات، چونکە پاڵدەرو هۆیە بۆ باقی تر، چونکە هۆی مەترسییە لە ئابڕوو چوونی دنیاو رۆژی دوایی، هەرکەسیش ئەو مەترسییەی بۆ پەیدا ببێ دوور ئەکەوێتەوە لە هەموو کارێکی بەدو هەوڵ ئەدات بۆ هەموو کارو کردەوەیەکی چاک و شەرمی راستەقینە بریتییە لە شەرم کردن لە خوا جل جلاله وە شەرم لە خوا لەمەوە پەیدا ئەبێ کە ئاگاداری و چاودێری و رەقابەی هەمیشەیی خوای لەدڵدا جێگیر ببێ.

خوا بە میهرەبانی خۆی بەشدارمان بکات لەو حەیا راستەقینەدا، آمین.

**** **** ****

## ٤ـ بابُ الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَ يَدِهِ.

١٠ـ حَدَّثَنَا آدَمُ بن أَبِي إِيَاسٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ أَبِي السَّفَرِ و إِسْمَاعِيلَ عَنِ الشَّعْبِيِّ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّﷺ قَالَ: (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَ يَدِهِ، وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللهُ عَنْهُ).

قَالَ أَبُو عَبدِاللهِ وَ قَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ: حَدَّثَنا دَاوُدُ عَنْ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَاللهِ عَنِ النَّبِيِّﷺ.

وَ قَالَ عَبْدُالأَعْلَى: عَنْ دَاوُدَ عَنْ عَامِرٍ عَنْ عَبْدِاللهِ عَنِ النَّبِيِّﷺ.

ئیسلام و ئیمان هەرچەند بە پێی زمانی عەرەب جیاوازن، بەڵام بە پێی مانا

شەرعی‌یەکەیان هەریەکن، کەواتە ئەم حەدیسەش کە لە بارەی ئیسلامەوە هاتووە ئەیهێنێ بە بەڵگە لەسەر مەبەستی ئەم کتاب و بابەو حەدیسەکە ئەهێنێ لە (عبداللەی کوڕی عەمر)ەوە -خوا لێ‌یان رازی بێت- عن النبي ﷺ قال: (المسلم من سلم المسلمون من لسانه و يده) لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمووی: موسڵمانی راستی و کامل کەسێکە کە موسڵمانان سەلامەت بن لە زمانی و لە دەستی، واتە بە ناهەق زیان نەگەیەنێ بە موسڵمانان نە بە زمان و نە بە دەست، کەواتە ئەگەر زمانی هەقی گەیاند ئەوە بەجێ‌یەو شەرع ئیزنی داوە.

ئینجا ئەو موسڵمانەی کە ئەوەندە گوێڕایەت بێت خۆی بپارێزێ لە زیان گەیاندنی ناهەق ئەبێ باشتر گوێڕایەڵ بێت لە هەموو فەرمانەکانی تری شەرعدا، ئینجا مەبەست بە موسڵمانان ئافرەتانیشە، بەڵام لە زۆر جێگادا باسی ئافرەتان ناکرێ لەبەر (تعليب) کە ئەوە زۆر بەکار هێنراوە لە زمانی شەرعداو هەروەها لە زمانی عەرەبدا، ئینجا کە گوتمان مەبەست زیانی ناهەقە، کەواتە هەر زیانێکی تری ناهەق بە غەیرە موسڵمان وەک زیان گەیاندن بە ئەهلی کیتاب و ئەهلی زیمە هەر قەدەغەیەو مەرجە خۆپارێزیی لێ‌ی.

ئینجا زیانی دەستی پێش ئەخست، چونکە زیانی زمان زۆرترەو گشتی‌یە بۆ زیانی رابردوو ئێستاو داهاتوو، بەڵام زیانی دەست زیانی رابردوو ناگرێتەوە، وە بە تایبەتی زیانی دەم و دەستی فەرموو، چونکە زۆربەی زیان بەو دووانە ئەکرێ.

ئەمە بەشی یەکەم بوو لە حەدیسەکە، بەشی دووەم ئەمەیە کە ئەفەرموێ: (المهاجر من هجر ما نهى الله عنه) کۆچ کەر کەسێکە واز بێنێ و کۆچ بکات لە هەر شتێ خوا جڵەوگیریی لێ کردووە، ئەم فەرموودەیە ئەکەر پێش فەتحی مەککە بووبێ ئەوە بۆ تەمێ‌ی کۆچ کەرانە نەک بە هۆی کۆچ کردنەکەیانەوە وا خەیاڵ بکەن کە ئیتر هیچیان لەسەر نەماوە. ئەو خەیاڵە ناراستەو ئەبێ وەک ئەو کۆچەیان کردووە پێویستە کۆچیش بکەن لە هەر گوناهێکی تریش. ئەگەر دوای فەتحی مەککە بووبێ ئەوە بۆ دڵدانەوەی ئەوانەیە کە کۆچی مەککەیان بە نیسب نەبووە.

ئەم حەدیسە لە ژمارە (٦٤٨٤)دا دووبارە بووەتەوە.

**** **** ****

## ٥ـ بابٌ أيُّ الإسْلَامِ أفْضَلُ؟

١١ـ حَدَّثَنَا سَعِيدُ بنُ يَحْيَى بنِ سَعِيدٍ الْقُرَشِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أبِي قَالَ: حَدَّثَنَا أبُو بُرْدَةَ ابنُ عَبْدِاللهِ بنِ أبِي بُرْدَةَ عَنْ أبِي بُرْدَةَ عَنْ أبِي مُوسَى رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: (قَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، أيُّ الإسْلَامِ أفْضَلُ؟ قَالَ: مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ).

ئینجا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە -خوا لێی رازی بێت- کە موسڵمانان گوتیان (یا رسول الله: أي الإسلام أفضل؟) ئەی پێغەمبەری خوا کام ئیسلام گەورەترە؟ (قال: من سلم المسلمون من لسانه و یده) .فەرمووی ئەو کەسەیە کە موسڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەت بن.

**** **** ****

## ٦ـ بابٌ إطْعَامُ الطَّعَامِ مِنَ الإسْلَامِ

١٢ـ حَدَّثَنَا عَمْرُو بنُ خَالِدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ يَزِيدَ عَنْ أبِي الْخَيْرِ عَنْ عَبْدِاللهِ ابْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أنَّ رَجُلاً سَألَ النَّبِيَّ ﷺ: (أيُّ الإسْلَامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: تُطْعِمُ الطَّعَامَ، وَتَقْرَأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ).

بۆ ئەم بابە حەدیسێ ئەهێنێ لە (عبداللەی کوڕی عەمر)ەوە -خوا لێیان رازی بێت-: (أن رجلا سأل النبي ﷺ أي الإسلام خیر؟) کە پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ کام کردەوەو خەسڵەتی ئیسلام چاکترە؟ (قال تطعم الطعام، وتقرأ السلام علی من عرفت و من لم تعرف) خۆراک بدەیت بە خەڵکی و سەلام بکەیت لەسەر هەرکەس کە بیناسی و هەرکەس کە نەیناسی لە موسڵمانان نەک سەلام لە هەندێ بکەیت و لە هەندێ نەکەیت. لەبەر ئەوەی خۆت بە زل دانێی کە ئەوەش ناگونجێ لەگەڵ برایەتی ئیسلامی.

ئەم دوو کردەوەو خەسڵەتە دوو چاکەی تێدایە چاکەی ماڵی و چاکەی بەدەنی.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٨، ٦٢٣٦)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٧ـ بابٌ مِنَ الإيْمَانِ أنْ يُحِبَّ لأخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ

١٣ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ شُعْبَةَ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أنَسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ

النبيﷺ.

وَعَنْ حُسَيْنٍ الْمُعَلِّمِ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حتى يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ).

ئینجا حەدیسێکی تر ئەهێنێ ئەفەرموێ: (باب من الإيمان أن يحب لأخيه ما يحب لنفسه) ئەمە بابێکە: بەشێکە لە ئیمان کە موسڵمان پێی خۆش بێ بۆ براکەی هەرشتێک کە پێی خۆشە بۆ خۆی. وە لەم بارەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسەوە -خوا لێی رازی بێت- لە پێغەمبەرەوەﷺ کە ئەفەرموێ: (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه) هیچ کام لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ تا وا نەبێ پێی خۆش بێ بۆ برای خۆی ئەوەی پێی خۆش بێ بۆ نەفسی خۆی.

***      ***      ***

## ٨ـ بابُ حُبُّ الرَّسُولِ ﷺ مِنَ الإِيْمَانِ.

١٤ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ -رَضِيَ اللهُ عَنْهُ- أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: (فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ).

١٥ـ حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عُلَيَّةَ عَنْ عَبْدِالْعَزِيزِ بنِ صُهَيْبٍ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ. ح.

وَحَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: (لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ).

ئەمە بابێکە خۆش ویستنی پێغەمبەرﷺ بەشێکە لە ئیمان، جا لەم بارەوە حەدیسێک ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە -خوای لێ رازی بێت- کە (أن رسول اللهﷺ قال: فو الذي نفسي بيده) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سوێند بە کەسێ گیانی منی بە دەستە (لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من والده وولده) هیچ کەس لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ هەتا من خۆشەویست تر نەبم بەلایەوە لە باوک و ئەولادی.

حەدیسێکی تر ئەهێنین لە ئەنەسەوە -خوای لێ رازی بێت- (قال: قال النبي ﷺ: لا يؤمن أحدكم حتى أكون أحب إليه من والده وولده و الناس أجمعين) کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ کام لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ هەتا من خۆشەویست تر نەبم بە لایەوە لە باوک و دایکی و لە رۆڵەی و لە هەموو ئینسان بە گشتی.

پێشخستنی باوک و دایک لەبەر ئەوەیە ئەوانە بەرێزترن یان لەبەر ئەوەیە باوک و دایک زۆرترن، چونکە هەموو رۆڵەیەک باوک و دایکی هەیە لە پاش ئادەمەوە، بێجگەلە عیسا کە هەر دایکی هەبوو.

ئینجا ئایا هەموو ئادەمی، تەنانەت نەفسی ئیماندارەکەش ئەگرێتەوە یان نەء؟ هەموو ئادەمی وشەیەکە گشتی ئەگەیەنێ و بە بێ بەڵگەیەک وتە گشتییەکان لە رواڵەتەکەیان لانادرێن، بێجگە لەوەش لە حەدیسی تردا هاتووەو لەمەوپاش بە خزمەتی ئەگەین کە بە رێکی دانی ناوە بە نەفسی موسڵمانەکەیشدا.

ئینجا ئەم خۆش ویستنە نیشانەی ئیمانی تەواوە بۆ هەموو کەس و تایبەتی ناکرێت بە هیچ کەسێکەوە.

ئینجا ئایا مەبەست بەم خۆش ویستنە چییە؟ بێگومان خۆش ویستنی باوەڕی رەزامەندی (حب الإختيار)ە کە ئەوە مەرجە بۆ تەواو بوونی ئیمانی هەموو ئیمانداری. یا خۆش ویستنی سۆزو پەرۆشی دڵ (حب الطبع). ئەم بەشە زانایان ئەفەرموون مەرج نییە، بەڵام بە راستی هەق وایە ئەم بەشە مەرج بێت بۆ تێرو تەواوی ئیمان.خوا بە میهرەبانی خۆی ئەمە جێگیر بکات لە دڵ و دەروون و هەستماندا آمین.

**** **** ****

## ٩ـ بابُ حَلاَوَةُ الإِيْمَانِ

١٦ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَهَابِ الثَّقَفِيُّ: قَالَ حَدَّثَنَا أَيُّوبُ عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيْهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإِيْمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللهُ وَ رَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَأَنْ يُحِبَّ الْمَرْءَ لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ للهِ، وَ أَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُقْذَفَ فِي النَّارِ).

ئینجا حەدیسێکی تر ئەهێنین لە ئەنەسەوە -خوا لێی رازی بێت- و ئەویش لە

پێغەمبەرەوەﷺ فەرموی: (ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان) سێ شت هەیە هەرکەس ئەو سێ شتە هەست پێ بکات لە خۆیدا شیرینی ئیمان هەست پێ ئەکات:

١- (أن يكون الله و رسوله أحب إليه مما سواهما) خواو پێغەمبەری لا خۆشەویست تر بێ لە غەیری ئەوان.

٢- (و أن يحب المرء لا يحبه إلا لله) کەسێکی خۆش بوێ لە کاتێکدا هەر لەبەر خوا خۆشی بوێ، واتە هیچ هۆیەک نەبێ بۆ خۆش ویستنەکە بێجگە لە ڕەزامەندی خواو هەر لەبەر خوا خۆشی بوێ. واتە نە بە چاگەو پیاوەتی خۆش ویستنەکەی زیاد بکات و نە بە گوێ پێ نەدان و نەبوونی عەلاقەو پەیوەندی کابرا خۆشەویستی‌یەکەی کەم بکات، بەڵکو هەر لەبەر ئەوە خۆشەویست بێت بەلایەوە کە بە پیاوێکی چاک و خواناسی ئەزانێت. دیارە خۆش ویستنی وا نیشانەی شیرینی ئیمانە.

٣- (و أن يكره أن يعود في الكفر كما يكره أن يقذف في النار) بێزارو خەشمناک بێت لە کوفر بە وێنەی بێزاری و خەشمناکی لەوەی تور بدرێتە ناو ئاگر، وتەی (يعود) بە مانا گەڕانەوەیە بۆ کوفر، کەواتە ئەبێ لە پێش ئیمان هێنانی لە کوفردا بووبێ، دیارە ئەوە مەرج نی‌یە، کەواتە مەبەست ئەوەیە بگەڕێ بە کافر بە وێنەی ﴿أو لتعودن في ملتنا﴾(الأعراف:٨٨) کە بە مانا (تصيرُن اليه).

ئینجا هەڵئەگرێ ئەم (يعود) هەر لەسەر ماناکەی خۆی بێت، کە وێنەو چیرۆکەکە بە نەزەر ئەو چەرخی یەکەم جاری ئیسلام بووبێ کە موسڵمانان چەرخی بەدی کوفریان بینی و پیسی و بۆگەنی‌یەکەی ناسراو بوو لایان، ئینجا کە موسڵمان بوون بە تەواوی تێگەیشتن کە توورداینیان بۆ ناو ئاگر بە وێنەی گەڕانەوەیانە بۆ کوفر، خواو پێغەمبەرەکەی باش ئەزانن.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢١، ٦٠٤١، ٦٩٤١) دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٠ـ بابُ عَلاَمَةُ الإيْمَانِ حُبُّ الأنْصَارِ

١٧ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيْد قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَبْدُاللهِ بنُ عَبْدِاللهِ بنِ جَبْر قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا عَنِ النَّبِيِّﷺ قَالَ: (آيَةُ الإيْمَانِ حُبُّ الأنْصَارِ، وَ آيَةُ النِّفَاقِ بُغْضُ

الأنصَار).

نیشانەی ئیمانی تەواو خۆش ویستنی ئەنسارە، ئینجا لەم بارەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسەوە -خوای لێ رازی بێت- کە پێغەمبەرﷺ: (قال: آية الإيمان حب الأنصار، و آية النفاق بغض الأنصار) فەرمووی: نیشانەی ئیمانی تەواو خۆش ویستنی ئەنسارەو نیشانەی مونافیقی بوغزو قینە لە ئەنسار -خوا لێیان رازی بێت-، چونکە ئەنسار بوون بە هۆی بڵاو بوونەوەی ئیسلام و فیداکاری تەواویان کرد بە نەفس و ماڵ. لەم حەدیسەدا هێندێ لێکۆڵینەوە کراوە، بەڵام بە راستی ئەمە جێگەی لێکۆڵینەوە نی یە، چونکە:

یەکەم: مەبەست کۆمەڵی ئەنسارە دەی هەرکەس ئیمانی هەبێ بێ پەروا خۆش ویستنی ئەو کۆمەڵە لە دڵیدا جێگیر ئەبێ. وە هەرگیز ئیمانەکەی رێگە نادا بۆ بوغزی ئەوانە.

دووەم: ئەم خۆش ویستنە کراوەبە نیشانەی ئیمانی تەواو، هەرکەسێ ئەوانەی خۆش نەوێ -خوا نە خواستە- ناڵێین کافری بێ ئیمان، بەڵکو ئەڵێین: ئیمانی کاملی نی یە، دەی ئەوەش شتێکی زۆر راستەو جێگەی گومان نی یە.

ئەم حەدیسە لە ژمارە (٣٧٨٤)دا دووبارە بووەتەوە.

***     ***     ***

## ١١- باب

١٨- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِدْرِيسَ عَائِذُ اللهِ بنُ عَبْدِاللهِ أَنَّ عُبَادَةَ بنَ الصَّامِتِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ - وَكَانَ شَهِدَ بَدْرًا، وَهُوَ أَحَدُ النُّقَبَاءِ لَيْلَةَ الْعَقَبَةِ- أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ وَحَوْلَهُ عِصَابَةٌ من أَصْحَابِهِ: (بَايِعُونِي عَلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُوا بِاللهِ شَيْئًا، وَلاَ تَسْرِقُوا، وَلاَ تَزْنُوا، وَلاَ تَقْتُلُوا أَوْلاَدَكُمْ، وَ لاَ تَأْتُوا بِبُهْتَانٍ تَفْتَرُونَهُ بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَ أَرْجُلِكُمْ، وَلاَ تَعْصُوا فِي مَعْرُوفٍ. فَمَنْ وَفَى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ فِي الدُّنْيَا فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا ثُمَّ سَتَرَهُ اللهُ فَهُوَ إِلَى اللهِ: إِنْ شَاءَ عَفَا عَنْهُ، وَ إِنْ شَاءَ عَاقَبَهُ).

فَبَايَعْنَاهُ عَلَى ذَلِكَ.

ئەمە بابێکە لە بارەی ناوبردنی ئەو کۆمەڵە پیرۆزە بە ئەنسار، وە پەیوەندی بە حەدیسی پێشووەوە ئاشکرایە.

حەدیسی پێشوو خۆش ویستنی ئەو کۆمەڵەی کرد بە نیشانەی ئیمان و لە حەدیسی ئەم بابەدا مەدح و سەنای ئەو کۆمەڵەی تێدایەو هۆی ناوبردنیان بە ئەنسار کە لەوەشدا ڕێزی پێدان و نرخی گرنگی تێدایە بۆیان -خوا لێیان ڕازی بێت-. جا لەم بارەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عوبادەی کوڕی صامتەوە کە یەکێکە لەوانەی لە غەزای بەدردا بووە، یەکێکە لەو ۱۲ نەقیبانەی کە پێغەمبەری ئازیزﷺ کردنی بە نەقیب بەسەر قەومەکانی‌یەوە لە شەوی عەقەبەدا وەک ئەفەرموێ: (وكان شهد بدرا وهو أحد النقباء ليلة العقبة).

ئەم هاوەڵە بەڕێزە هەواڵی دا (أن رسول اللهﷺ وحوله عصابة من أصحابه) پێغەمبەرﷺ لە کاتێکدا بە دەوری‌دا بوو کۆمەڵێک لە هاوەڵەکانی (قال: بايعوني على أن لا تشركوا بالله شيئا) پێی فەرمون: پەیمانم لەگەڵ ببەستن و پەیمانم بدەنێ لەسەر ئەوەی هیچ شتێ نەکەن بە هاوبەشی خواو هەر ئەو بپەرستن (ولا تسرقوا) دزی نەکەن (ولا تزنوا) زینا نەکەن (ولا تقتلوا أولادكم) ئەولادتان نەکوژن کە ئەوە یەکێکە لە باوە پیسەکانی چەرخی نەفامی کە ئەولادیان ئەکوشت لەبەر ڕەزیلی و چرووکی یان کچیان زیندە بە چاڵ ئەکرد لە ترسی ئەوەی نەک کاری زینای لەگەڵ بکرێ و ئابرووی کەس و کارو تائیفەکەی بچێ. کە هەرچەند ئەوە کارێکی بەدە، بەڵام باوی چەرخی نەفامی چەرخی بیستەم زۆر پیس ترو بۆگەن ترە کە کچ و ژنەکانیان ئەڕازێننەوەو بەرەڵای ئەکەن بە مینی جۆب و میکرۆجۆبەوە ئەگەڕێن بە دەشت و دەرا، بەڵکو دەست ئەخەنە ناو دەستی هەموو هەتیوێ کە حەزی لێ ئەکەن و ئەچن بۆ سەفەرا! کە ئەوەش ئەوپەڕی بێ غیرەتی و بێ شەرەفی‌یەو لەگەڵ ئادەمیدا ناگونجێ. وە کوشتنی ڕاستەقینە ئەم باوە پیسەی ئەم چەرخی تازەیە کە زۆر جار ئافرەتە فەقیرەکە خاوەنەکەی بەرەڵای ئەکات و دووچار ئەبێت بە حەرامی منداڵ تووڕ ئەدات و ئینجا لەبەر ئابروو ئەچوون ئەو منداڵە بێ تاوانە ئەکوژن!!

جا پێغەمبەری ئازیزﷺ لەو شەوی پەیمان بەستنەدا ئەوەی کرد بە بەندێکی تایبەت، (و لا تأتوا ببهتان تفترونه بين أيديكم و أرجلكم) درۆو بوختان لە لایەن خۆتانەوە هەڵمەبەستن بۆ خەڵکی، ئیتر بوختانی زیناو فاحیشە گەری یان هەر بوختانی تر. مەبەست بە

(بين أيديكم و أرجلكم) نەفسی بوختان کەرەکانە وە بەو وتە ئەفەرموێ، چونکە زۆربەی کردەوە بە دەست و قاچ ئەکرێ. یان مەبەست ئەوەیە بوختان لە دڵەوە دێت و پەیدا ئەبێ کە دڵ وا لە نێوان دەست و قاچدا (ولا تعصوا في معروف) سەرپێچی و نافەرمانی نەکەن لە هیچ کارو فەرمانێکی شەرعی‌دا بێگومان پێغەمبەری ئازیزﷺ هەرگیز فەرمانی نەداوە بە کارو کردەوەیەک کە شەرعی نەبێت، کەواتە وتەی (بالمعروف) لەبەر دڵدانەوەی ئەو کۆمەڵە بووە کە نەک خەیاڵی وا بکەن کە ئەبێ هەر گوێ رایەڵ بن بە بێ مەرج و قەید، (بیضاوی) بە رەحمەت بێ ئەڵێ: ئەم قەیدە لەبەر ئاگادار کردنەوەیە لەسەر ئەوەی کە گوێ رایەڵی بۆ هیچ کەس دروست نی‌یە لە کارێکدا بێ شەرعی بێت و ئەمە بەندێکە لە سنوورەکانی ئیسلام (لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق) (ئەمە ریوایەتی ئیمام ئەحمەدە ٥/٦٦). واتە لە فەرزێکدا ئەگەر پێغەمبەریش -خوا نەخواستە- فەرمان بدات بە بێ شەرعی نابێ لە گوێی بکرێ، کەواتە ئەم قەیدە بۆ موبالەغەیە لە پێویستی گوێ رایەڵی خوادا. ئینجا فەرمووی: (فمن وفى منكم فأجره على الله) هەرکام لە ئێوە وەفا بکات بەم بەندانەوە ئەجرو پاداشتی لەسەر خوایە. واتە خوا جل جلاله بڕیارو بەڵێنی داوە لەسەر خۆی ئەجرو پاداشتی ئەو کەسە بداتەوە (ومن أصاب من ذلك شيئا) هەرکەس شتێ لەوانە بەجێ نەهێڵێ بێجگە لە هاوبەشی ڕەوا نەدان و پەشیمان نەبوونەوە لێ‌ی کە ئەوە گەورەترین تاوانە خوا جل جلاله بڕیاری داوە لێ خۆش بوون بۆ ئەوە نی‌یە لەوە بەو لاوە دەست ئەدات بۆ لێ بوردن. جا بۆ گوناهانی تر کە کردی (فعوقب في الدنيا) ئینجا لە دنیادا تۆڵەی لێ سەنرا بە سزای دنیا (فهو كفارة له) ئەو سزای دنیایە ئەبێت بە کەفارەت بۆی (ومن أصاب من ذلك شيئا) وە هەرکەسێ لەو تاوانەنەی تری کرد (ثم ستره الله) ئینجا خوا سزای دنیای نەدا بەسەرداو سەتری کرد لە دنیادا (فهو إلى الله) ئەو کەسە کاری سزادانی یان سزا نەدانی لە ڕۆژی دواییدا عایدی خوایە (إن شاء عفا عنه) ئەگەر مەیلی بوو بە فەزڵ و میهرەبانی خۆی عەفوی ئەکات و لێ‌ی ئەبوورێ (و إن شاء عذبه) ئەگەر سزای بدات ئەوا بە عەدل و دادپەروەری‌یەکەی سزای ئەدات لە لوتفی خوا بە زیاد بێت.

ئینجا عوبادە -خوای لێ رازی بێت- ئەفەرموێ: (ثم بايعناه على ذلك) ئینجا

بەیعەت و پەیمانمان لەگەڵ بەست لەسەر ئەوەی کە گوترا. ئەوا ئەم حەدیسە بە روونی دەری خست کە کردەوە بەشێکە لە ئیمانی کامڵ، وەک لە پێشەوە گوتمان، ئیمامی بوخاری -خوای لێ رازی بێت- هەر حەدیسێکی دەست کەوتبێ لەسەر مەرجەکەی خۆی کە عەدالەت و تەلەقلی‌یە لەم کتێبە هێناویەتی لەبەر راگەیاندنی فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ کە فەرزە لەسەر ئومەت. لە هەمان کاتدا ئەوەی دەست کەوتبێ دابەشی کردووە بە پێی هەموو بابەکان.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٨٩٢، ٣٨٩٣، ٣٩٩٩، ٤٨٩٤، ٦٧٨٤، ٦٨٠١، ٦٨٧٣، ٧٠٥٥، ٧١٩٩، ٧٢١٣، ٧٤٦٨) دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٢ـ بابٌ مِنَ الدِّينِ الْفِرَارُ مِنَ الْفِتَنِ.

١٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مَسْلَمَةَ عَنْ مَالِكٍ عَنْ عَبْدِالرَّحْمَنِ بنِ عَبْدِاللهِ بنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ بنِ أَبِي صَعْصَعَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (يُوشِكُ أَنْ يَكُونَ خَيْرَ مَالِ الْمُسْلِمِ غَنَمٌ يَتْبَعُ بِهَا شَعَفَ الْجِبَالِ، وَمَوَاقِعَ الْقَطْرِ، يَفِرُّ بِدِينِهِ مِنَ الْفِتَنِ).

بەشێکە لە دین راکردن و فیرارکردن لە فیتنە. جا لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو سەعیدی خودری‌یەوە -خوای لێ رازی بێت- (أنه قال: قال رسول الله: يوشك أن يكون خير مال المسلم غنم يتبع بها شعف الجبال ومواقع القطر يفر بدينه من الفتن) ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نزیکە کاتێک بێت باشترینی ماڵی موسڵمان پارچە ئاژەڵێک بێت کە بیگێڕێ بەسەر شاخەکان و شوێنی باران، واتە ناو دۆڵ و شیوەکان و دەشتەکان لە کاتێکدا فیرار ئەکات بە دینەکەی لەبەر تۆزی شارەکان و دێهاتەکان و چەند فیتنەو فەسادێک کە روو ئەدات. واتە راکردن لەبەر پاراستنی دین هۆو مەبەستەکەی دینە، کەواتە لەگەڵ تەرجەمەکەی‌دا رێکە. بێگومان ئەو کەنار گیری و گۆشە نشینی‌یە چاکەو پێویستە کەسێ کە بێ دەسەڵات بێت و لەکاتی تێکەڵیدا نەتوانێ ئایینەکەی راگیر بکات. بەڵام ئەگەر وا نەبێت تێکەڵی چاکە وەک ئیمامی شافیعی ئەفەرموێ بۆ فێر کردنی نەزان یان فێر بوونی خۆی و لەبەر چەند هۆیەکی تر، بە کورتی تا دەسەڵات ببێ تێکەڵی چاکە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٣٠٠، ٣٦٠٠، ٦٤٩٥، ٧٠٨٨) دووبارە بووەتەوە.

## ١٣ـ بابُ قَولِ النَّبيِّ ﷺ: «أنَا أَعْلَمُكُمْ بِاللهِ».
## وأنَّ الْمَعْرِفَةَ فِعلُ الْقَلْبِ.

لِقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ﴾ (البقرة: ٢٢٥).

٢٠ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ سَلَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدَةُ عَنْ هِشَامٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَمَرَهُمْ أَمَرَهُمْ مِنَ الأَعْمَالِ بِمَا يُطِيقُونَ. قَالُوا: إِنَّا لَسْنَا كَهَيْئَتِكَ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللهَ قَدْ غَفَرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ. فَيَغْضَبُ حَتَّى يُعْرَفَ الْغَضَبُ فِي وَجْهِهِ ثُمَّ يَقُولُ: «إِنَّ أَتْقَاكُمْ وَ أَعْلَمَكُمْ بِاللهِ أَنَا».

(باب قول النبي ﷺ انا أعلمكم بالله) من زاناترو ئاشنا ترم له خوا له ئێوه (و أن المعرفة فعل القلب) واته له بابی ئەوەیە کە مەعریفەت کردەوەی دڵە، کەواتە ئیمان بە گوتنی تەنیـا تەواو نابێ تا تەسـدیق و باوەڕی لەگـەڵ نەبێ، کـەواتە ئەم حـەدیسـە مـەزهەبی (کەرامی)یە بەتاڵ ئەکاتەوە کە ئەڵێن ئیمان هەر گوتنە. بەڵکە لەسەر ئەوە کە باوەڕو عەقیدە پێویستە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿ و لکن یؤاخذکم بما کسبت قلوبکم ﴾ واتە خوا ناتانگرێ بە سوێندی لەغو واتە دەم سوێندو بە بێ عەزم و بڕیاری دڵ لەسەری، بەڵام ئەتان گرێ بەوەی کـە دڵتـان عـەزم و بڕیاری لەسـەر داوە. دەی ئەو عـەزم و بڕیارە کردەوەی دڵە، کەواتە ڕێکە لەگەڵ بابەکەدا، ئینجا ئەگەر کەسێ ئەڵێ حەدیسی سەحیح ئەفەرموێ: (إن الله تجاوز عن أمتي ما حدثت به نفسـها ما لم تكلم به ﴾ له وەڵامدا ئەڵێین بەوەی حەدیسەکە خەتەرەو خەیاڵێکە کە دێت بە دڵدا بە بێ عەزم و بڕیار، کەواتە هیچ دژایەتی نی‌یە لەگەڵ ئایەتەکە.

ئینجا لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران عائشـە -خوا لێی ڕازی بێت- کـە ئەفـەرموێ: (کـان رسـول الله ﷺ إذا أمرهم أمـرهم من الأعـمـال بما یطیـقـون) پێغەمبەر ﷺ باوی وابوو کاتێ کە فەرمانی بدایە بە خەڵکی فەرمانی پێ ئەدان بە شتێ کە توانا بوون پێی (فقالوا: یا رسـول الله إنا لسـنا کهیئتك و أن الله قد غفر لك ما تقدم من ذنبك وما تأخر) ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە نموونەی تۆ نین لە کاتێکدا خوا لە گوناهەکانی تۆ بردووە هینی لەوەو پێش و هینی لەوەو دوا. واتە تۆ پلەو پایەت بەرزەو پێـویسـتت نی‌یە بە هەوڵ و تێکۆشانی زۆرو زەحمەت، وە ئێمە ناتەواوین و پێویستین بە تەقالای زۆرو کردەوەی

زۆرو سەخت (فيغضب حتى يعرف الغضب في وجهه) پێغەمبەریش ﷺ لە وتەی ئەوانە خەشمناک بوو بە جۆرێ خەشمەکەی لە رووی پیرۆزیدا دەرکەوت. هەموو بە جارێ گومان کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ گوناهی نەبووە، بەڵام هەرکارێکی شەرعیشی کردبێ کە بارەکەی تری چاک تر بووبێ بۆ ئەوە بە گوناه دائەنرێ لەبەر پایەو پلەی بەرزی، ئێنجا ئەچینەوە سەر حەدیسەکە. (ثم يقول إن أتقاكم و أعلمكم بالله أنا) بێگومان لە خواترس و خۆپارێزترتان و ناشناو زاناترتان بە خوا منم. واتە من شایستەترم بە عیبادەت و خواپەرستی زیادە، چونکە من لە خوا ترس ترو ئاشنا ترم بە خوا لە ئێوە، وە بەندە تا خوا باشتر بناسێ عیبادەتی زۆرترو بەهێزترەو لەزەت و خۆشی عەبدایەتی لە دڵیدا بەهێزترە، ئینجا لە پاش ئەوەی لێ بوویەوە لەم حەدیسەکە باسی ئەوەی تێدا بوو هاوەڵەکان داوایان نەکرد کە زیاتر عیبادەت بکەن، چونکە خۆشی و لەزەتیان لە عیبادەت کردن دایە.

*** *** ***

١٤ـ بَابُ مَنْ كَرِهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ، مِنَ الإِيْمَانِ.

٢١ـ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ -رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ- عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (ثَلاَثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاَوَةَ الإِيْمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللّٰهُ وَ رَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا، وَمَنْ أَحَبَّ عَبْدًا لاَ يُحِبُّهُ إِلاَّ لِلَّهِ، وَ أَنْ يَكْرَهَ أَنْ يَعُودَ فِي الْكُفْرِ بَعْدَ إِذْ أَنْقَذَهُ اللّٰهُ كَمَا يَكْرَهُ أَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ).

ئەمە بابی کەسێکە بێزار بێت لەوەی بگەڕێ بە کافر وەک بێزارە لەوەی تووڕ بدرێتە ناو ئاگر، ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە -خوای لێ رازی بێت- کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ. ئەم حەدیسە هەرچەند لە ماناو مەبەستدا هەروەک حەدیسە پێشووەکە وایە، بەڵام هەندێ جیاوازی هەیە لە هێندێ لە وتەکانیدا، جا لەبەر ئەوەی پێویستە پارێزگاری بکرێ لەسەر نەفسی وتەکانیش هەردوو ریوایەتەکەی هێناوە، ئیتر ئەو جیاوازییە لە وتەکاندا ئەمەیە لە دوو مەجلیسدا پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی یان راوی یەکێکیان (نقل بالمعنى)ی کردبێ.

*** *** ***

## ١٥- باب تَفَاضُلِ أَهْلِ الإِيْمَانِ فِي الأَعْمَالِ.

٢٢- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنْ عَمْرِو بنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (يَدْخُلُ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ وَأَهْلُ النَّارِ النَّارَ، ثُمَّ يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ إِيْمَانٍ، فَيُخْرَجُونَ مِنْهَا قَدْ اسْوَدُّوا فَيُلْقَوْنَ فِي نَهْرِ الْحَيَا - أَوِ الْحَيَاةِ، شَكَّ مَالِكٌ - فَيَنْبُتُونَ كَمَا تَنْبُتُ الْحِبَّةُ فِي جَانِبِ السَّيْلِ، أَلَمْ تَرَ أَنَّهَا تَخْرُجُ صَفْرَاءَ مُلْتَوِيَةً؟)

قَالَ وُهَيْبٌ: حَدَّثَنَا عَمْرٌو «الْحَيَاةِ» . وَقَالَ: «خَرْدَلٍ مِنْ خَيْرٍ» .

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٥٨١، ٤٩١٩، ٦٥٦٠، ٦٥٧٤، ٧٤٣٨، ٧٤٣٩)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ عُبَيْدِاللهِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بنُ سَعْدٍ عَنْ صَالِحٍ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بنِ سَهْلٍ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ، مِنْهَا مَا يَبْلُغُ الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَا دُونَ ذَلِكَ، وَعُرِضَ عَلَيَّ عُمَرُ بنُ الْخَطَّابِ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ. قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: الدِّيْنَ).

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٦٩١، ٧٠٠٨، ٧٠٠٩)دا دووبارە بووەتەوە.

ئینجا بە بۆنەی جیاوازی ئیمانداران لە هێزو لاوازی ئیمانەکەیاندا دێتە سەر ئەم بابە کە ئەفەرموێ: (تفاضل أهل الإيمان في الأعمال) ئەمە بابی جیاوازی رادەو پلەی ئیماندارانە لە هۆی جیاوازیان لە کردەوەدا لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە -خوای لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: (يدخل أهل الجنة الجنة و أهل النار النار) ئەوەی کە ئەهلی بەهەشتە ئەچنە بەهەشت و ئەوەی ئەهلی جەهەنەمە ئەچنە ئاگر (ثم يقول الله تعالى: أخرجوا من كان في قلبه مثقال حبة من خردل من إيمان) دەربێنن لە دۆزەخدا هەرکەسێ لە دڵیدا هەبێ بە کێشانەی ناوکە خەرتەلەیەک لە ئیمان. ئەم حەدیسە بە روالەت پشتیوانە بۆ ئەوانە کە ئەفەرمون: ئیمان و باوەڕ دەست ئەدات بۆ زیادو کەم، بەلام لەبەر ئەوەی بێجگە لەم باوەڕە کە هیچ کردەوەیەکی تر لە دڵدا نییە، بەڵکو لە ئەندامەکانی

ردا هەن. ئەم حەدیسە نابێ بە پشتگیر بۆ ئەوانەی کە ئەفەرمون: ئیمان و باوەڕ دەست نەدات بۆ زیادەو کەم و لاوازی، بەڵکو پشت گیرە بۆ ئەوانەی کە ئەفەرمون: کردەوە بەشێکە لە ئیمان، بەڵام -وەک باس کرا- ئەبێ بەشێ بێ لە ئیمانی کامڵ، بە هەرحاڵ و لەسەر هەرهار باوەڕ ئەبێ بە هەموو شتێک ببێ کە ئیسلام هێناویەتی ، نەک مەبەست ئەوە بێ کە ئیمانی تەواو ئەوەیە باوەڕ ببێ بە هەموو ئەوەی ئیسلام هێناویەتی و ئیمانی ناتەواو ئیمانە بە هێندێکی، چونکە هەرکەسێ ئیمانی بە هەر بەش و پارچەیەک نەبێ بە ئیماندار دانانرێ و خاوەنی ئەو باوەڕە کافرە بە پێی ئایەت و حەدیس و فەرموودەی هەموو زانایانی ئەهلی سوننەت، باوەڕی وا خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرئەکات و بەتین ترین سزای هەیە لە ڕۆژی دوایی‌دا.

ئینجا ئەگەڕێینەوە بۆ خزمەتی حەدیسەکە کە ئەفەرموێ: (فیخرجون منها وقد اسودوا) دەر ئەهێنرێن لە کاتێکدا کە زۆر ڕەش بوونەتەوە وەک خەڵوز (فیلقون في نهر الحیا -أو الحیاة، شك مالك) ئینجا تور ئەدرێنە ناو ڕووباری (باران) یان ڕووباری (الحیاة) ژیان. مالیک کە ریوایەت ئەکات گومانی بووە لە وتەکەدا: (الحیا) یان (الحیاة) (فینبتون کما تنبت الحبة) بە هۆی ئەوەوە ئەڕوێن و سەوز ئەبنەوە بە وێنەی سەوز بوونەوەی بەزری گیاو گژە کە لە پاش وشک بوونی و باران بارین بەسەریدا دووبارە ئەڕوێتەوە، (في جانب السیل) لە قەراغی لافاو کەدێت (ألم تر أنها تخرج صفراء ملتویة؟) ئایا نابینی ئەو بەزرو ناوکانە بەرز دەبنەوە لە کاتێکدا زەردو لاوازو لار بوبوون؟

ئەم حەدیسە پیرۆزە مەزهەبی (مرجئة) بەتاڵ ئەکاتەوە کە ئەڵێن: گوناه زیان ناگەیەنێ بە ئیمانداران. هەروەها مەزهەبی موعتەزیلە کە ئەڵێن گوناهی کەبیرە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرئەکات و نایگێرێ بە کافر بەڵام ئەبەدی ئەبێت لە ئاگردا.

ئینجا حەدیسێکی تر ئەهێنێ کە ئەبێ بە بەڵگە لەسەر ئەم بابەی کە خەریکین پێیەوە. ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە کە ئەفەرموێ: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بینا أنا نائم رأیت الناس یعرضون علي و علیهم قمص) کاتێک من خەوتبووم هەڵکم دیت و نیشانم دران لە کاتێکدا کراسیان لەبەردا بوو (منها ما یبلغ الثدي ومنها ما دون ذلك) هەندێ ئەگەیشتە سەر مەمکیان و هینی واشیان هەبوو کەمترە لەوە (و عرض

علي عـمـر بن الخطاب و عليه قـمـيص يجـره) وه عـومـەرى كـوڕى خەتتـابم نيشـان درا له كاتێكدا كراسەكەى ئەخشان بە زەويدا (قالوا فما أولت ذلك يا رسـول الله؟) هاوەڵەكانيش گوتيـان ئەوەت بە چى خـەوبەرژين كرد ئەى پێـغـەمبـەرى خوا (قـال: الدين) فەرمـووى خەو پەرژينم كرد بە دين.

بە پێى ئەم حەديسە ئەو خەڵكە جياوازيان هەيە لە ديندا و ئەو جياوازيەيەش بە پێى جياوازيانە لە كردەوەى چاكدا، ئينجا ئەوە نابێ بە بەڵگە لەسەر ئەوەى عومەر گەورەتر بێت لە ئەبوبەكر -خوا لێيان رازى بێت- كە بە ئيتيفاقى زانايانى ئەهلى سوننەت گەورەترينى ئوممەت لە پاش پێغەمبەرﷺ ئەبوبەكرە -خوا لێى رازى بێت-. چونكە:

يەكەم: خاوەنى كـراسە درێژەكەى (حـصـر) نەكردووە لە عـومـەردا، بەڵكو ئەمە زيادە مژدەيەكە داى بە عومەر، ئيتر وێنەى عومەرو گەورەتر لە ئوممەتدا هەيە.

دووەم: عـومـەر بە هۆى تەمـەن درێژيى لە خەلافەتدا كردەوەى زۆرترى هەبێ، ئيـتـر با كردەوە كـەمـەكـانى ئـەبوبەكـر زۆر گەورەتر بێت لە كردەوە زۆرەكـانى عـومـەر، وەك خۆيشى ئەفەرموێ: سوێند بە خوا شەوو رۆژێكى ئەبوبەكر لە عـومەرو ئالى عومەر گەورەترە. شەوى كۆچەكەى كە لە خزمەت پێغەمبەردا كۆچى كردو هەموو ماڵ و منداڵ و هەموو شتى بەجێ هێشت. رۆژەكـەش رۆژى لـە دنيا دەرچوونى پێـغـەمـبـەرﷺ ئەگـەر ئەبوبەكـر نەبوايە زۆربەى ئوممەت سـەريان لێ تێك ئـەچوو، هەروەها كردەوەكـانى ترى كـە مـەسـەلەى خەلافـەت و رێك خستنى لەشكرەكەى ئوسامەو جەنگى ئەهلى ريدەو ...هتد.

*** *** ***

## ١٦ـ بابُ الْحَيَاءُ مِنَ الإِيْمَانِ.

٢٤ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكُ بنُ أَنَسٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ سَالِمِ بنِ عَبْدِاللهِ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ مَرَّ عَلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ -وَهُوَ يَعِظُ أَخَاهُ فِي الْحَيَاءِ- فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: (دَعْهُ، فَإِنَّ الْحَيَاءَ مِنَ الإِيْمَانِ).

ئەمە بابێكە لە بارەى حەياوە كە ئەفەرموێ: (الحياء من الإيمان) شەرم و حەيا بەشێكە لە ئيمان. لەم بارەوە حەديسێ ئەهێنێ لە عبداللەى كوڕى عومەرەوە -خوا لێيان رازى بێت- (أن رسـول اللهﷺ مر على رجل من الأنصـار -وهو يعظ أخـاه في الحيـاء- كە پێغەمبەرﷺ

ئەمەری بەلای پیاوێک لە ئەنساردا کە ئامۆژگاری برای خۆی ئەکرد لە بارەی شەرمەوە، بەم ڕەنگە ئەوەندە شەرم مەکە لە شەرمدا دووچاری زیان ببی (فقال رسول اللهﷺ : دعه فإن الحياء من الإيمان) ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرموی: لێی گەڕێ با لەسەر شەرم و حەیای خۆی بمێنێتەوە، چونکە شەرم و حەیا بەشێکە لە ئیمان. لەم حەدیسەشدا دەرکەوت کە ئیمان تەنیا تەسدیق و باوەڕ نی‌یە.

ئەم حەدیسە لە ژمارە: (٦١١٨)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

١٧ـ بابُ ﴿ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلاَةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ ﴾ (التوبة: ٥).

٢٥ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مُحَمَّدٍ الْمُسْنَدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو رَوحٍ الْحَرَمِيُّ بنُ عُمَارَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ وَاقِدِ بنِ مُحَمَّدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي يُحَدِّثُ عَنْ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ قَالَ: (أُمِرْتُ أَنْ أُقَاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ، وَيُقِيمُوا الصَّلاَةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وَأَمْوَالَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّ الإِسْلاَمِ، وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ).

ئەمە بابێکە لە تەفسیری ئایەتێکدا کە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کردەوە بەشێکە لە ئیمانی کامڵ. ئایەتەکە ئەمەیە: ﴿ فإن تابوا و أقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فخلوا سبيلهم ﴾ ئەگەر بت پەرستەکان تۆبەیان کردو گەڕانەوە لە بت پەرستی‌یەکەیان و باوەڕیان هێنا ئەو کاتە بەرەڵایان بکەن. ئەم ئایەتە هەرچۆنێ بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە کردەوە بەشێکە لە ئیمان لە هەمان کاتدا ئیمامی بوخاری هێناویەتی بە بەڵگە لەسەر بەتاڵی مەزهەبی (مرجئة) کە ئەڵێن کردەوەی خراپ زیان ناگەیەنێ بەبەندە ماتوڵ ئیمان و باوەڕیان هەبێ.

لە پاش ئەم ئایەتە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن و عومەرەوە -خوا لێیان رازی بێت- کە ئەفەرموێ: (أن رسول اللهﷺ قال: أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله، و أن محمدا رسول الله) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من ئەمرم پێ کراوە کە خەڵک بکوژم تا شایەتی ئەدەن کە هیچ خوایەک نی‌یە بێجگە لە (الله) وە محمد پێغەمبەری خوایە (و يقيموا الصلاةو يؤتوا الزكاة) وە نوێژ بە ڕێک و پێکی بەجێ ئەهێنن و زەکات ئەدەن (فإن فعلوا

ذلك عصموا مني دماءهم و أموالهم) ئەگەر ئەو شتانەیان کرد کە باسمان کردن ئەوا خوێنیان و ماڵیان ئەپارێزن لە من. واتە نە خوێنیان و نە ماڵیان حەلاڵ ناکەین (إلا بحق الإسلام) مەگەر خوێن و ماڵێ کە ئیسلام حەلاڵی کردبێ بەمە قەتلی ناهەق یان حەقێکی شەرعی کە بکەوێتە سەریان یان بژاردنی ماڵێ کە لە گەردنیاندا بێ، واتە ئیسلام بوونەکەیان تۆبە کردنیانە لە پەرستنی بت ئەبێ بە کەفارەتی هەرگوناهێ کردبێتیان لەوەوبەر بەڵام لەپاش ئیسلام بوونەکەیان هەر تاوان و گوناهێکی تازەیان کرد ئەوە بە گوێرەی بڕیاری ئیسلام تۆڵەیان لێ ئەسێنرێ. ئەگەر ئەوانە بە زاهیر موسڵمان بێ بە موسڵمان سەیریان ئەکەین، بەڵام نێوان خۆیان و خوا ئەگەر راست نەکەن لە موسڵمان بوونەکەیاندا ئەوا خوا ئاگادارە پێیان و لای ئەو موسڵمان نین. واتە ئەو کاتە بە پێی بەڵێن و بڕیاری خوا سزا ئەدرێن نەک پێویستە لەسەر خوا وەک وتەی (علي) ئەیگەیەنێ و موعتەزیلە لەسەر ئەوەن.

*** *** ***

## ١٨ـ بابُ مَنْ قَالَ إنَّ الإيْمَانَ هُوَ الْعَمَلُ

لِقَوْلِ اللهِ تَعَالَى ﴿وَ تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ﴾ (الزخرف:٧٢) وَ قَالَ عِدَّةٌ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى ﴿فَوَرَبِّكَ لَنَسْئَلَنَّهُمْ أَجْمَعِيْنَ * عَمَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ (الحجر: ٩٢ـ٩٣): عَنْ قَوْلِ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ. وَ قَالَ ﴿لِمِثْلِ هَذَا فَلْيَعْمَلِ الْعَامِلُونَ﴾ (الصافات:٦١).

٢٦ـ حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بنُ يُونُسَ وَ مُوسَى بنُ إِسْمَاعِيلَ قَالاَ حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيْمُ بنُ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابنُ شِهَابٍ عَنْ سَعِيْدِ بنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الْعَمَلِ أَفْضَلُ؟ فَقَالَ: إِيْمَانٌ بِاللهِ وَ رَسُولِهِ. قِيْلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: الْجِهَادُ فِي سَبِيْلِ اللهِ. قِيْلَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: حَجٌّ مَبْرُورٌ.

ئەمە بابی کەسێکە کە ئەڵێ ئیمان هەر کردەوەیە. (مرجئة) لە دووبارەوە راو بۆچوونی بەتاڵیان هەیە:

یەکەم: لەگەڵ بوونی ئیماندا کردەوەی خراپ زیان ناگەیەنێ، ئیمام خوای لێ رازی بێت لە ئایەت و حەدیسی پێشوودا ئەو رایەی بەتاڵ کردنەوە.

دووەم: ئەوەیە ئیمان هەر وتنە بە بێ کردەوە، ئەوا بەم کۆمەڵە ئایەتە سەلمێنرا کە ئیمان کردەوەیشە.

مەبەست ئەوە نییە هەرکام لەم ئایەتانە بە تەنیا بەڵگەیە لەسەر تەواوی مەبەستی لمنابی ئیمان کە ئێمە بە وردی خەریکین پێیەوە، بەڵکو ئەم کۆمەڵە هەمووی بەڵگەن لەسەر هەموو بەشی کیتابی ئیمان کە ئیمان حەقیقەتەکەی باوەڕو گوتنی شایەتومان مەرجە بۆ تطبیقی احکام، کردەوەش بەشێکە لە ئیمان و باوەڕی کامڵ و تەواو. جا ئەوا دەست ئەکات بە هێنانی ئایەتەکان ﴿تلك الجنة التي أورثتموها بما كنتم تعملون﴾ ئەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێ دراوە ئەو بەهەشتەیە کە بە کەلەپوورو میراتی دراوە پێتان بە هۆی کردەوەکەتان لە کردتان لە جیهاندا. واتە بە هۆی ئیمانەکەتانەوە کە وەک گوتمان حەقیقەتی ئیمان باوەڕەرو گوتن مەرجە بۆ تطبیقی ئەحکام و کردەوە بەشێکە لە ئیمانی کامڵ.

ئینجا لێرەدا پرسیار ئەکرێ لەوەی لە حەدیسی سەحیحدا هاتووە هیچ کەس کردەوەکەی نایخاتە بەهەشت، بەڵکو هۆی چوونە بەهەشت هەر رەحمەت و میهرەبانی خوایە. لە وەڵامدا ئەڵێین: مەبەست بە کردەوە لەئایەتەکەدا کردەوەی وەرگیراوە کە وەرگرتنەکەی هەر بە هۆی میهرەبانی خواوەیە ئەگینا خوا هیچ پێویستی بە کردەوەی بەندەو هیچ شتێک نییە، نەبوونی باوەڕو کردەوە هیچ زیانێک ناگەیەنێ بە خوا وەک بوونیشیان هیچ سوودێ نادا بە خوایەتی خوا، مەبەست بە کردەوە لە حەدیسەکەدا کردەوەی تەنهایە. کەواتە حەدیسەکە دەستە مل بوو لەگەڵ ئایەتەکەداو هیچ گرێیەک نییە.

ئینجا دێتە سەر ئایەتەکانی تر کە هێنانی بە بەڵگە ئەفەرموێ: (و قال عدة من أهل العلم في قوله تعالى:) چەند کەسێک لە زانایان فەرمویانە لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: ﴿فوربك لنسئلنهم أجمعين عما كانوا يعملون﴾ سوێند بە پەروەردگارت ئەی پێغەمبەر پرسیار ئەکرێ لە هەموویان لە کردەوەیەک کە کردوویانە لە جیهاندا.

لە تەفسیری ئەو کردەوانەدا فەرموویانە: (عن قول لاإله إلا الله) وە گوتنی ئەو وتەش کردەوەیەو ئیمانە. هەرچەند بە پێی رای ئەو کۆمەڵە زانایانە دەلیل و بەڵگەکە تەواوە بەڵام لەبەر ئەوەی ئایەتەکە پرسیارە لە هەموو کردەوە، کەواتە وەک ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێ: تایبەتی کردنەکە بێ بەڵگەیەو وەرناگیرێ. بەڵام ئەو کەسەی تایبەتی کردووە رێگای هەیە بڵێ: پرسیار لە تەوحیدو خواپەرستی شتێکە بێگومانەو هیچ کەس خیلافی نییە تیایدا، بەڵام

پرسیار له شته‌كانی تر خیلافی تێدایه له‌ناو زانایاندا، له‌به‌رئه‌وه تایبه‌تی كردووه له‌م شته‌دا كه هیچ خیلافی تێدا نی‌یه.

ئینجا لێره‌شدا شوێنی پرسیارێكه: ئه‌م ئایه‌ته وا نیشان ئه‌دات كه له ڕۆژی دواییدا پرسیار ئه‌كرێ له هه‌موو كه‌س ، وه ئایه‌تی ﴿فیومئذ لا یسئل عن ذنبه إنس و لا جان﴾ وا نیشان ئه‌دات كه پرسیار ناكرێ. له وه‌لامدا ئه‌لێن: له ڕۆژی دواییدا چه‌نده‌ها هه‌لوێست و چه‌رخی دوورو درێژ هه‌یه، كه‌واته پرسیار نه‌كردن ئه‌برێن به‌سه‌ر هێندێ هه‌لوێست و چه‌رخدا، وه پرسیار كردنه‌كه‌ش به‌سه‌ر هه‌ندێ هه‌لوێست و چه‌رخه‌كانی تردا. یان ده‌لێن: مه‌به‌ست پرسیار كردنه‌كه ئه‌برێن به‌سه‌ر پرسیارێ كه بۆ هه‌وال دانه‌وه بێت.

ئینجا به‌لگه‌یه‌كی تر ئه‌هێنێ ئه‌فه‌رموێ: ﴿وقال لمثل هذا فليعمل العاملون﴾ با هه‌ر بۆ گه‌یشتن به وێنه‌ی ئه‌م ئامانجه كاركه‌ران كرده‌وه بكه‌ن. به پێی مه‌به‌ستی ئیمام واته با ئیمان بێنن ئیمانداران. چونكه ئه‌و رای وایه كه ئه‌م باب و باسه بۆ باسی ئیمانی حه‌قیقی و كامله ده‌ی ئه‌و كاته وه‌ك كرده‌وه‌ی دلی تێدایه كه‌باوه‌ڕه‌كه‌یه كرده‌وه‌ی زمان و ئه‌ندامه‌كانیش تێدایه، كه‌واته ڕێگه نی‌یه بۆ هیچ ره‌خنه‌یه‌ك.

ئینجا ئه‌م حه‌دیسه‌ش ئه‌هێنێ له ئه‌بو هوره‌یره‌وه كه (أن رسول الله ﷺ سئل: أي العمل أفضل؟) پرسیار كرا له پێغه‌مبه‌رﷺ: كام كرده‌وه گه‌وره‌تره‌و ئه‌جری زۆرتره؟ (قال: إيمان بالله ورسوله) ئه‌ویش فه‌رموی: ئیمان به خواو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی. (قيل ثم ماذا؟ قال: الجهاد في سبيل الله) ئینجا عه‌رزی كرا: دوای ئه‌وه چی؟ ئه‌ویش فه‌رمووی: جیهادو تێكۆشان له ڕێی خودا. له هێندێ حه‌دیسدا له وێنه‌ی ئه‌م پرسیاره‌دا له وه‌لامدا ئه‌فه‌رموێ: ئازاد كردنی به‌نده. له هێندێ تردا شتی تری فه‌رمووه. وه ئه‌و جۆره وه‌لامانه به پێی حالی پرسیاره‌كه جیاوازی په‌یدا ئه‌كات. وه‌ك له حه‌دیسێكدا یه‌كێ پرسیاری كرد كه فه‌رمانێكم پێ بده ئیتر دوایی پێویستیم نه‌بێ به پرسیار كردن، ئه‌ویش فه‌رموی: (قل آمنت بالله ثم استقم) یان یه‌كێكی تر داوای كرد ئامۆژگاریم بكه ئه‌ویش فه‌رمووی: (لا تغضب) تا دوو سێ جار داواكه‌ی كرده‌وه ئه‌و هه‌ر فه‌رمووی: (لا تغضب). جه‌نابی ئازیزمان دكتۆری دل و ده‌روونمانه وا ده‌رئه‌كه‌وێ خاوه‌نی پرسیاری یه‌كه‌م ئه‌خۆشی بێ ئیستیقامه‌تی و دانه‌مه‌زراوی بووه‌و دووه‌م ئه‌خۆشی رق و غه‌زه‌بی بووبێ. (قيل: ثم ماذا؟ قال: حج مبرور) پاشان عه‌رزی

کرا: پاشان چی تر؟ فەرموی: حەجێکی قبوڵ کراو لای خوای گەورە.

ئەم حەدیسە لە ژمارە: (١٥١٩)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٩ـ باب إِذَا لَمْ يَكُنِ الإِسْلاَمُ عَلَى الْحَقِيقَةِ، وَكَانَ عَلَى الإِسْتِسْلاَمِ أَوِ الْخَوْفِ مِنَ الْقَتْلِ

لِقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿ قَالَتِ الأَعْرَابُ آمَنَّا قُلْ لَمْ تُؤْمِنُوا وَلَكِنْ قُولُوا أَسْلَمْنَا ﴾ (الحجرات: ١٤) فَإِذَا كَانَ عَلَى الْحَقِيقَةِ فَهُوَ عَلَى قَوْلِهِ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ إِنَّ الدِّيْنَ عِنْدَ اللهِ الإِسْلاَمُ ﴾ (آل عمران: ١٩)

٢٧ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَامِرُ بنُ سَعْدِ ابنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَنْ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَعْطَى رَهْطًا -وَسَعْدٌ جَالِسٌ- فَتَرَكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ رَجُلاً هُوَ أَعْجَبُهُمْ إِلَيَّ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ مَا لَكَ عَنْ فُلاَنٍ؟ فَوَاللهِ إِنِّي لأَرَاهُ مُؤْمِنًا. فَقَالَ: أَوْ مُسْلِمًا. فَسَكَتُّ قَلِيلاً. ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ، فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي فَقُلْتُ: مَا لَكَ عَنْ فُلاَنٍ؟ فَوَاللهِ إِنِّي لأَرَاهُ مُؤْمِنًا. فَقَالَ: أَوْ مُسْلِمًا. فَسَكَتُّ قَلِيلاً. ثُمَّ غَلَبَنِي مَا أَعْلَمُ مِنْهُ، فَعُدْتُ لِمَقَالَتِي، وَعَادَ رَسُولُ اللهِ ﷺ. ثُمَّ قَالَ: يَا سَعْدُ، إِنِّي لأُعْطِي الرَّجُلَ وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْهُ، خَشْيَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللهُ فِي النَّارِ.

وَرَوَاهُ يُونُسُ وَصَالِحٌ وَمَعْمَرٌ وَابْنُ أَخِي الزُّهْرِيِّ عَنِ الزُّهْرِيِّ.

ئەمە بابێکە کە ئیمان و ئیسلام ئەبێ بە راستی و لە دڵەوە بێت نەک لەبەر هیچ هۆیەکی تر. وەک ئەفەرموێ: (إذا لم یکن الإسلام علی الحقیقة و کان علی الإستسلام أو الخوف من القتل) کاتێ ئیسلام بە پێی حەقیقەتە شەرعی‌یەکەی نەبێ و لەبەر ناچاری مل کەچ بێت یان لەبەر مەترسی بێ لە کوشتن. ئەو جۆرە ئیسلامە لە رۆژی دواییدا هیچ سوودی نابێ. ئەو جۆرە موسڵمان بوونە رواڵەتی ئەبێ و بەڵام بە ئیمان دانانرێ ﴿و قالت الأعراب آمنا﴾ عەرەبە کۆچەری‌یەکان بە دەم گوتیان ئێمە باوەڕمان هێناو باوەڕمان هەیە. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە لە یەکەم جارەوە دەربارەی چەند کەسێ لە بەنی ئەسلەم کە لەساڵێکی گرانیدا هاتن بۆ مەدینەی منەوەرەو بە دەم شایەتومانیان هێناوە گوتیان بە پێغەمبەر ﷺ. ئێمە بە ماڵ

و عەیالەوە، جەنگمان لەگەڵ نەکردی وەک خەڵکی تر، وە مەبەستیان خێرو سەدەقە بوو، وە منەتیان ئەنا بەسەر پێغەمبەرداﷺ، ﴿قل لم تؤمنوا﴾ ئەی پێغەمبەر بڵێ پێیان ئێوە باوەڕتان نەهێناوە، چونکە ئەبێ بە راستی و لە دڵەوە بێت و گەردن کەچی دڵی لەگەڵدا بێت ﴿ولكن قولوا أسلمنا﴾ بەڵکو بڵێن: مل کەچ و ناچار بووین. بە رواڵەت ئەبوو بە درۆ خستنەوەکەو بەرپەرچ دانەوەکە بەم جۆرە بوایە: (قل: لا تقولوا أمنا ولكن قولوا أسلمنا إذ لم تؤمنوا و لكن أسلمتم) بڵێ نەڵێن باوەڕمان هێنا، بەڵکو بڵێن ناچارو مل کەچ بووین. بە دیەن و رواڵەت ئەبوو بەم جۆرە بەرپەرچ بدرانایەوە، بەڵام کە بیر ئەکەینەوە هەر ئەوە رێک و بەجێیە کە قورئانەکە ئەفەرموێ، چونکە بەو جۆرە لافەکەیان ئەخاتەوە بە درۆوەو لە ریشەی ئەهێنێ و بێگومان قسە هەر قسەی قورئانە.

ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ناڕاستی و بەتاڵی رای (کەرامی)یەو (مرجئة) کە ئەڵێن: باوەڕ تەنها ئیقرارو گوتنە بە زمان هەروەها ئایەتی: ﴿أولئك كتب في قلوبهم الإيمان﴾ بەڵگەیەکی تێرو تەواوە لەسەر ناڕاستی راکەیان. هەروەها بڕیاری هەمووان لەسەر کفری موناڤیقەکان بەڵگەیە لەسەر ناڕاستی ئەوانە. چونکە ئەو موناڤیقانە بێجگە لە شایەتومان نوێژو کردەوەیشیان هەبوو.

ئینجائەفەرموێ: (فإذا كان على الحقيقة فهو على قوله جل ذكره:) ئەگەر ئیسلام لەسەر بارە راستەقینەکەی بێت و بەو شێوە مەبەست بێت ﴿إن الدين عندالله الإسلام﴾ ئەو کاتە لەسەر بارە راستەقینەکەی و لەگەڵ ئیماندا یەک شتن و سوودی هەیە لای خوا. ئیمامی بوخاری ئەم ئایەتە ئەکات بە دەلیل و بەڵگە لەسەر ئەوەی ئیسلامی راستەقینە هەر ئەوە دینەو لەسەر ئەوە ئیسلام و ئیمان هەردوو یەکن. ئەوەش رای زۆر لە زانایانی حەدیسەو کۆڕو جەماوەری (موعتەزیلە)و (متکلمین)ەو هەم بەڵگە ئەهێننەوە بە ئایەتی: ﴿فأخرجنا من كان فيهما من المؤمنين وما وجدنا غير بيت من المسلمين﴾ وە دیارە ئەسڵ لە ئیستیسنادا موتەسیلە. کەواتە ئیسلام و ئیمان یەکن. ئیمامی بوخاری بەڵگەیەکی تر دێنێتەوە لەسەر مەزهەبەکەی خۆی بەم ئایەتە: ﴿ومن يبتغ غير الإسلام دينا فلن يقبل منه﴾ هەرکەس بێجگە لە ئیسلام دینێکی تر قبوڵ بکات هەرگیز لێی وەرناگیرێ، ئەگەر ئیسلام و ئیمان یەک نەبن ئەبێ ئیمان وەرگیراو نەبێ، چونکە دین هەر ئیمانەو دینیش هەر ئیسلامە.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە سەعدی کوڕی ئەبی وەقاسەوە -خوا لێی رازی بێت-:
(أن رسول الله أعطى رهطا) کە پێغەمبەرﷺ هێندێ لە ماڵ و سامانی دا بە چەند کەسێک لە (المؤلفة قلوبهم) و سەعد ئامادە بوو لەوێدا (فترك رجلا) ئینجا بەشی پیاوێکی نەدا کە داوای لێ کرد (هو أعجبهم إليَّ) ئەو پیاوە بەلامەوە شایستە تر بوو (فقلت: يا رسول الله ما لك عن فلان؟ فو الله إني لأراه مؤمنا) گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ئایا هۆی چی‌یە بەشی فلانەکەست نەدا سوێند بە خوا من بە ئیمانداری ئەزانم (أو مسلما) یان فەرمووی بە موسڵمانی دەزانم (فسكت قليلا) ئینجا کەمێ بێ دەنگ بووم (ثم غلبني ما أعلم منه) ئینجا ئەوەی کە من دەمزانی لە بارەی ئەو پیاوەوە زۆری بۆ هێنام (فعدت لمقالتي) بە هۆی ئەوە وتەکەم دووبارە کردەوە تا (وعاد رسول اللهﷺ. ثم قال: يا سعد، إني لأعطي الرجل) ئەی سەعد من ئەبەخشم بە کەسێ (و غيره أحب إلي منه) کە خەڵکی تر خۆشەویست ترە بە لامەوە لەو (خشية أن يكبه الله في النار) لەبەر مەترسی ئەوەی کە خوا بیخاتە ئاگر. واتە ئەوەی کە بەشی نادەم ئیمانی بەهێزەو پێویست نی‌یە بە بەخشینی شت دامەزراوی بکەم لەسەر ئیمانەکەی، بەڵام ئەوەی کە شتی پێ ئەدەم ئیمانی لاوازەو ئەمەوێ بەو بەخشینە دامەزراوی بکەم نەک واز لە ئیمانەکەی بێنێ و خوا بیخاتە ناو ئاگر.

پەیوەندی ئەم حەدیسە بە بابەکەوە ئەوەیە ئەو کەسەی کە ئیعلانی ئیسلام ئەکات بە موسڵمان دائەنرێ، ئیتر با نەزانی لە دڵەوە چۆنە؟ بەڵام دڵ و دەمی یەک نەبن سوود لەو ئیسلامە وەرناگرێ لە رۆژی دواییدا.

ئەم حەدیسە لە ژمارە: (١٤٧٨)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٠ـ بابُ إفْشَاءُ السَّلامِ مِنَ الإسْلامِ

وَ قَالَ عَمَّارٌ: ثَلاثٌ مَنْ جَمَعَهُنَّ فَقَدْ جَمَعَ الإيْمَانَ: الإنْصَافُ مِنْ نَفْسِكَ، وَبَذْلُ السَّلامِ لِلْعَالَمِ، وَالإنْفَاقُ مِنَ الإقْتَارِ.

٢٨ـ حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ يَزِيْدَ بنِ أبِي حَبِيبٍ عَنْ أبِي الْخَيْرِ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْرٍو أنَّ رَجُلاً سَألَ رَسُولَ اللهِ ﷺ: أيُّ الإسْلامِ خَيْرٌ؟ قَالَ: (تُطْعِمُ الطَّعَامَ وَتَقْرَأُ

السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَمْ تَعْرِفْ).

ئەمە بابێكە كە فەرموی: (إفشاء السلام من الإسلام) بلاو كردنەوەی سەلام بە بێ فەرق وجیاوازی لە هەموو موسڵمانێک بەشێكە لە ئیسلام (و قال عمار:ثلاث من جمعهن فقد جمع الإيمان) عەماری كوڕی یاسر ئەفەرموێ: سێ شت هەیە هەركەسێ كۆیان بكاتەوە ئەو كەسە ئیمانی كۆكردووەتەوە -واتە ئیمانی كامڵە-:

١- (الإنصاف من نفسك) عەدل لەگەڵ نەفسی خۆت، بەم رەنگە هەموو فەرمانە واجبەكان بەجێ بێنی، خۆت بپارێزی لە هەرچی جڵەوگیرییت لێ كراوە.

٢- (و بذل السلام للعالم) سەلام كردن لە هەموو موسڵمانێک ناسراو بێت لات یان نەناسراو. وتەی (عالم) ئەگەر چی گشتی‌یە بۆ كافریش، بەڵام بە چەند بەڵگەیەک تایبەتی ئەكرێ بە موسڵمانەوە، كەواتە یان (عامی مخصوص)ە یان (عام مراد بالمخصوص)ە.

٣- (و الإنفاق من الإقتار) بەخشین لە كاتی نەبوونی و فەقیریدا. ئیتر بەخشینی بە ماڵ و منداڵ یان بە میوان و هەر موستەحقێک.

ئینجا لەپاش ئەم ئەسەرە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە عبداللەی كوڕی عەمری كوڕی عاصەوە (أن رجلا سأل النبيﷺ : أي الإسلام خير، قال: تطعم الطعام و تقرأ السلام على من عرفت و من لم تعرف) ئەویش فەرمووی خۆراک دەرخواردی خەڵكی بدەیت و سەلام بكەیت لەسەرهەركەسێ كە ناسیوتە یان نەتناسی. دیارە مەبەست كەسی موسڵمانە وەک باسمان كرد. ئەم حەدیسە لە بابی (إطعام الطعام)دا هێنای، بەڵام لێرەشدا هێنای بە پێی باوی خۆی لە شوێنی تریشدا كاتێ لە ریوایەتی دووەمدا زیادە فائیدەی تیدا بێت ئەگینا بە بێ هۆیەک حەدیس دووبارە ناكاتەوە.

*** *** ***

٢١ـ بابُ كُفْرَانِ الْعَشِيرِ، وَكُفْرٍ دُونَ كُفْرٍ

فِيهِ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

٢٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللَّهِ بنُ مَسْلَمَةَ عَنْ مَالِكٍ عَنْ زَيْدِ بنِ أَسْلَمَ عَنْ عَطَاءِ بنِ يَسَارٍ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ : (أُرِيتُ النَّارَ، فَإِذَا أَكْثَرُ أَهْلِهَا النِّسَاءُ يَكْفُرْنَ. قِيلَ: أَيَكْفُرْنَ بِاللَّهِ؟

قَالَ: يَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَيَكْفُرْنَ الإِحْسَانَ، لَوْ أَحْسَنْتَ إِلَى إِحْدَاهُنَّ الدَّهْرَ ثُمَّ رَأَتْ مِنْكَ شَيْئًا قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ مِنْكَ خَيْرًا قَطُّ).

ئەمە بابی سپڵەیی و دان نەنانە بە ماف و چاکەی هاوسەر. وا دەرئەکەوێ مەبەست بەم (عشیر)ە لێرەدا مێردە (و كفر دون الكفر) ئەم وتەیە ئیختیلاف هەیە لە خوێندەنەوەو مەبەستەکەیدا، لە بارەی خوێندنەوەکەیەوە جەماوەر لەسەر ئەوەیە بە ژێرە ئەخوێنرێتەوەو بە ژێرەو عەتف لەسەر (كفران) وشەی (كفر) و (كفران) لە زمانی عەرەبیدا بریتییە لە داپۆشین و داشاردنەوە. بەو بۆنەوە دژی ئیمان ناوبراوە بە کوفر، چونکە داشاردن و داپۆشینی هەقە کە خواپەرستییە. ئینجا لە عورفدا (كفران) زۆرتر بەکار ئەهێنرێ بۆ دان نەنان بە ماف و چاکەو کوفر دائەنرێ بە باوەڕ نەبوون بە ئایینی ئیسلام. ئینجا مەبەستی ئیمامی بوخاری لێرەدا ئەمەیە هەرچۆنێ تاعەت و گوێ ڕایەڵییەکان ناو ئەبرێن بە ئیمان، هەروەها گوناهەکانیش ناو ئەبرێن بە کوفر. گوناهەکان بێجگە لە باوەڕ نەبوون بە ئیسلام کە ناو ئەبرێن بە کوفر مەبەست ئەو کوفرە نییە کە خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرئەکات. جا کەواتە مەبەست وتەی (كفر دون كفر) هەر کوفرانی عەشیرەکەیە، واتە ئەمە بای ئەو گوناهەیە کە بریتییە لە سپڵەیی و دان نەنان بە مافی مێرد کە ئەو گوناهە نزیک ترینە لە کوفرەوە.

خولاسەی ئەمەی گوتمان ئەمەیە: هەرچۆنێ گوێ ڕایەڵی و تاعەت و کردەوە چاکەکان ناو ئەبرێن بە ئیمان. هەروەها گوناهو تاوانەکانیش ناو ئەبرێن بە کفر بەو شێوەی باس کرا. جا لەم بابەدا بە تایبەتی باسی تاوانی سپڵەیی ئافرەت ئەهێنێ لەبەر حەدیسێکی درێژ کە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەگەر فەرمانم بدایە بە هەرکەس کە سوژدە ببا بۆ هەرکەسێ فەرمانم ئەدا بەوە ئافرەت سوژدە ببات بۆ مێردەکەی. لە حەدیسێکی تردا فەرموی: دۆزەخم نیشان درا زۆربەی دۆزەخییەکان ئافرەت بوو عەرزیان کرد بۆچی؟ فەرموی: چونکە نەفرین و لەعنەت زۆر ئەکەن و سپڵەن لەگەڵ هاوسەردا.

ئینجا ئایا بۆچی کفرانی عەشیری دانا بە نزیکترین کردەوەی بەد، هێندێ ئەفەرمون قازی ئەبوبەکر ئەفەرموێ: لەبەر ئەوەی حەدیسەکە کە ئەفەرموێ: ئەگەر فەرمانم بە سوژدە بدایە بۆ هەرکەسێ فەرمانم ئەدا بە سوژدە بردنی ئافرەت بۆ مێردەکەی، کەواتە مافی مێردی هاوسەری کرد بە مافی خواو تا ئەو رادەیە پلەی بەرز کردەوە، کەواتە سەرپێچی کردن لە

بەجێ هێنانی مافی مێردەکەی بەڵگەیە لەسەر سستی و گوێ نەدانی بە مافی خوا وەک ئەم حەدیسەش بۆ پشتگیرە کە ئەفەرموێ: (من لم يشكر الناس لم يشكر الله). (ریوایەتی ئەبو داود-أدب- ١١).

ئینجا ئەوا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن وعەباسەوە -خوا لێیان رازی بێت- کە ئەفەرموێ: قال النبيﷺ پێغەمبەرﷺ فەرموی: (أريت النار) دۆزەخم پیشان درا، (فإذا أكثر أهلها النساء) کە بینیم زۆربەی دۆزەخی‌یەکان ئافرەت بوون (يكفرن) هۆی ئەوەش ئەوەیە سپڵەن (کافرن) (قيل أيكفرن بالله؟) پرسیار کرا ئایا کافرو بێ باوەڕن بە خوا (قال يكفرن العشير و يكفرن الإحسان) سپڵەو کافرە بە هاوسەرو کافرن و دان نانێن بە چاکەی مێردا (لو أحسنت إلى إحداهن الدهر ثم رأت منك شيئا قالت: ما رأيت منك خيرا قط) ئەگەر چاکە بکەی دەربارەی یەکێکیان ماوەی ژیانت، پاشان شتێکت لێ ببینێت کە ناڕێک بێ لەگەڵ ئارەزوویدا، ئەڵێت: هەرگیز هیچ خێرو چاکەیەکم لە تۆ نەدیوە.

لەم حەدیسە پیرۆزەوە ئەمانە وەرئەگیرێ:

١) سەرۆک ئەبی ڕێنمونی و ئامۆژگاری ژێر دەستە بکات.

٢) قوتابی و ژێر دەستە پرس و راو مراجعەی سەرۆک و مامۆستا بکات ئەگەر تێنەگەیشتبێ لە فەرمودەکەی.

٣) دروستە گوناە ناو ببرێ بە کوفرو ناو بردنی سپڵەیی بە کوفر.

٤) گوناە ئەبێ بە هۆی کەم و کوڕی ئیمان.

٥) ئیمانی ئافرەت زیاد ئەبێ بە شوکری هاوسەرەکەی، کەواتە کردەوە بەشێکە لە ئیمان.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٣١، ٧٤٨، ١٠٥٢، ٥١٩٧،٣٢٠٢)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٢ـ بابُ الْمَعَاصِي مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ، وَلاَ يُكَفَّرُ صَاحِبُهَا بِارْتِكَابِهَا إِلاَّ بِالشِّرْكِ

لِقَوْلِ النَّبِيِّﷺ: (إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ) وَقَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿إِنَّ اللهَ لاَيَغْفِرُ أَنْ

يشرك به ويَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ﴾ (النساء: ٤٨، ١١٦)

٣٠ـ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ وَاصِلٍ الأَحْدَبِ عَنْ الْمَعْرُورِ قَالَ: لَقِيتُ أَبَا ذَرٍّ بِالرَّبَذَةِ وَعَلَيْهِ حُلَّةٌ وَعَلَى غُلاَمِهِ حُلَّةٌ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: إِنِّي سَابَبْتُ رَجُلاً فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ، فَقَالَ لِيَ النَّبِيُّ ﷺ: (يَا أَبَا ذَرٍّ، أَعَيَّرْتَهُ بِأُمِّهِ؟ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ. إِخْوَانُكُمْ خَوَلُكُمْ، جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِمَّا يَأْكُلُ، وَلْيُلْبِسْهُ مِمَّا يَلْبَسُ، وَلاَ تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ).

ئەمە بابێکە لە حەدیسی پێشەوە باسی ئەوەی کرد کە گوناهەکان ناوبران بە کوفر بە مەجاز نەک بە حەقیقەت، بەم رەنگە مەبەست سپڵەیی و دان نەنانە بە هەقدا.

ئینجا ئەوا لێرەدا روونی ئەکاتەوە کە ئەو گوناهانە بێجگە لە گەورەکەیان کە خوا لێ ی ناپوورێ، ئیتر ئەوانی تر خاوەنەکەی دەرناکات لە ئیسلام، ئەفەرموێ: (المعاصي من أمر الجاهلية) گوناهەکان بە گەورەو بچووکەوە کارو پیشەی جاهیلی‌یەکانە، واتە چەرخی پێش ئیسلام (و لا يكفر صاحبها بارتكابها إلا بالشرك) خاوەنی ئەو گوناهانە بە کردنیان کافر نابن یان بە کافر دانانرێ بێجگە لە هاوبەش رەوادان بۆ خوا، بێگومان تاوانی ئیلحادو بێ باوەڕی گوناهێکی پیس ترو بۆگەن ترە، جا لەبەر نەبوونی ئەم تاوانە پیسە هەر باسی هاوبەش رەوادانی باس کرد، کەواتە مەبەست بە شیرک کوفرە.

عینوانی ئەم بابەو حەدیسەکەی کە دێت بۆچوون و رای خەواریج بەتاڵ ئەکەنەوە کە ئەڵێن خاوەنی گوناهە گەورەکان کافرن و لە ئیسلام دەردەچن، هەروەها (موعتەزیلە) بە درۆ ئەخاتەوە کە ئەڵێن بەو گوناهە گەورانە لە ئیسلام دەرئەچن، بەڵام ناچێتە ناو کوفر.

ئینجا ئیمام دەلیل و بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەر راستی مەزهەبی ئەهلی هەق و بەتاڵی ئەهلی ناهەق بە ئایەت و حەدیس، گوناهەکان لە کارو کردەوەی جاهیلی‌یەتن (لقول النبي ﷺ إنك امرؤ فيك جاهلية) فەرمووی بە ئەبو زەڕ بەراستی تۆ پیاوێکی جاهیلیەتت تێدایە. خاوەنی ئەو گوناهانە کافر نابن (لقول الله تعالى: ﴿إن الله لا يغفر أن يشرك به و يغفر ما دون ذلك لمن يشاء﴾ ئینجا حەدیسەکە ئەهێنێ لە ئەبوە زەڕ خۆیەوە، ئەفەرموێ: (قال معرور: لقيت أبا ذر بالربذة) مەعرور وتی: تووشی ئەبو زەڕ بووم لە (رەبزە)دا کە سێ

قۆناغ لە مەدینەوە دوور بوو حەزرەتی عوسمان نەفی کردبوو بۆ ئەوێ وە ئەو زاتە رای لەسەر ئەمەیە زیاد لە ئەندازەی پێویست دروست نی‌یە ماڵ و سامان راگیر بکرێ. (و علیه حلة و علی غلامه حلة) لە کاتێکدا لەبەری ئەبو زەڕدا بوو دوو پۆشاک وە لەبەر غولامەکەیشیدا دوو پۆشاک بوو. واتە پۆشاکی خۆی بە وێنەی پۆشاکی غولامەکەی بوو کە باو وابووە پۆشاکی خاوەن و پۆشاکی غولام جیاواز بووە، بەڵام ئەو پەیرەوی حەدیسی کردبوو، وەک دەقەکەی دێت لە خۆیەوە: (فسألته عن ذلك) ئینجا پرسیارم کرد لەوەی بۆچی پۆشاکەکانتان یەکسانە بە پێچەوانەی باوی خەڵکی (فقال: إني سابت رجلا فعيرته بأمه) بەراستی من شەرە جنێوم کرد لەگەڵ پیاوێکداو ئینجا تەشەرم لێدا بەدایکی، بەم جۆرە گوتم کوڕی قولە رەشەکە (فقال لي النبيﷺ: يا أبا ذر، أعيرته بأمه؟ إنك امرؤ فيك جاهلية) بە هۆی ئەوەوە پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ئەی ئەبو زەڕ ئایا تەشەرت لێدا بەدایکی، بەراستی تۆ پیاوێکی جاهیلیەتت تێدایە. (إخوانكم خولكم جعلهم الله تحت أيديكم) ئەمانە براتانن و خوا خستوونیەتە ژێر دەستتان (فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يأكل و ليلبسه مما يلبس) کەواتە هەرکەسێ برای خۆی لە ژێر دەستیدا بێت با خواردنی بداتێ لەوەی خۆی ئەیخواو پۆشاکی پێ بپۆشێ لەوە خۆی ئەیپۆشێ (و لا تكلفوهم ما يغلبهم، فإن كلفتموهم فأعينوهم) ئەرک و ئیشێکیان لێ داوا مەکەن کە زۆریان پێ بهێنێ، ئەگەر کارێکی سەختتان لێ داواکردن کە زۆریان پێ بهێنێ کۆمەکیان بکەن و یارمەتیان بدەن.

هەرچۆنێ لەگەڵ غولامدا ئەبێ بەو جۆرە شیرینە رەفتار بکرێ و کاری سەختی پێ نەکرێ، هەروەها کرێکارو خادەم و میوان و هەرکەسێکی تر. وە نابێ تاتەو تەشەرو جوێن بدرێ بە خەڵکی. هیچ کەسێ لە هیچ کەسێکی تر زیاتر نی‌یە لای خوا بە تەقوا نەبێ وەک دەقی ئایەت ئەوە ئەفەرموێ. هەروەها ئەم حەدیسە تاکید ئەکات لەسەر پارێزگاری فەرمان بە چاکەو جڵەوگیریی لە خراپە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٥٤٥، ٦٠٥٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

٢٢م- باب ﴿وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا﴾ (الحجرات: ٩) فَسَمَّاهُمُ الْمُؤْمِنِينَ

٣١- حَدَّثَنَا عَبْدُالرَّحْمَنِ بْنُ الْمُبَارَكِ حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ حَدَّثَنَا أَيُّوبُ وَ يُونُسُ عَنْ الْحَسَنِ عَنِ الأَحْنَفِ / بْنِ قَيْسٍ قَالَ: ذَهَبْتُ لأَنْصُرَ هَذَا الرَّجُلَ. فَلَقِيَنِي أَبُو بَكْرَةَ فَقَالَ: أَيْنَ تُرِيدُ؟ قُلْتُ أَنْصُرُ هَذَا الرَّجُلَ. قَالَ: ارْجِعْ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ: هَذَا الْقَاتِلُ، فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ).

ئەمە بابێکە کە بەڵگەو پشتگیرە بۆ ئەوەی کە لە بابی پێشوودا وەرمان گرت کە گوناهەکان بێجگە لە کوفر خاوەنەکەی لە ئیمان دەرناکەن. ئەفەرموێ: (﴿و إن طائفتان من المؤمنين اقتتلوا فأصلحوا بينهما﴾ فسماهم المؤمنين) ئەگەر دوو تائیفە لە ئیمانداران تێ جەنگێن یەکیان بخەن و سوڵحیان بکەن.

ئەوەتا لەگەڵ ئەو شەرتی جەنگینەدا بە ئیمانداریان دائەنێ، چەند جارێک گوتمان بۆ هەر باس و مەبەستێک هەرئایەت و حەدیسێکی دەست کەوتبێ هێناویەتی، لەبەر ئەوەی پێویستە لەسەر موسڵمانان راگەیاندنی ئایەت و ئەوەی دەست ئەکەوێ لە حەدیس و سوننەت، کەواتە نابێ رەخنە بگیرێ بەمەی لە کتێبەکەیدا تیکرار هەیە، جا لەبارەی تێ جەنگینی موسڵمانانەوە ئەم حەدیسەی دەست کەوتووە لە ئەحنەفی کوڕی قەیسەوە (قال ذهبت لأنصر هذا الرجل) ئەحنەف ئەڵێ: رۆیشتم بۆ ئەوەی یارمەتی ئەم پیاوە بدەم، واتە ئیمامی عەلی کاتی جەنگی جەمەل بەرپا بوو (فلقيني أبو بكرة فقال: أين تريد؟) ئینجا ئەبوبەکرەم تووش بوو وتی پێم: نیازی کوێت هەیە؟ (قلت أنصر هذا الرجل) گوتم ئەڕۆم یارمەتی ئەم پیاوە ئەدەم (قال ارجع. فإني سمعت رسول الله ﷺ يقول: إذا التقى المسلمان بسيفيهما فالقاتل و المقتول في النار) گوتی: بگەڕێرەوە، چونکە من لە پێغەمبەری خوام بیست ئەگەر دوو موسڵمان بە شیرەکەیانەوە تێ جەنگێن، بکوژو کوژراو وان لە ئاگردا. (فقلت هذا القاتل. فما بال المقتول) منیش عەرزم کرد ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەمە بکوژ مافی خۆیەتی ئەی بۆچی کوژراویش هەر لەناو ئاگردایە (قال إنه كان حريصا على قتل صاحبه) فەرمووی وا لە

ئاگردا لەبەر ئەوەی سوور بووە لەسەر کوشتنی هاورێکەی.کەواتە ئەم حەدیسەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە موسڵمان بە کردەوەی خراپ بێجگە لە کوفر لە ئیسلام دەرناچێ و ئیمان و ئیسلامیش هەر یەکن.

لەم بارەوە ئەوەی لێ وەرئەگیرێ، بەڵام لە باری ترەوە حوکمی ئەو حەدیسە روونکاتە یارەکانی پێغەمبەرﷺ بە تایبەتی عەلی و کۆمەڵەکەی، چونکە بە بەیعەتێکی شەرعی ئاشکرا لە مزگەوتەکەی پێغەمبەرﷺ بوو بە ئەمیرو ئەو تاقمەکەی ترکە بە تأویل جەنگیان ئەکرد گوناهبار نین، بەڵکو ئەجرو پاداشتی ئیجتیهادەکەیان هەیە، بەڵام کۆمەڵی ئەمیر دوو ئەجریان هەیە. بەڵێ بە پێی شەرع باغین -خوا لە هەردوو لایان رازی بێ-. لە لوتفی خوا بەزیاد بێ کوژراو و بکوژ وان لەگەڵ گشتدا، وان لەناو سەحرای باخی بەهەشتدا. راستی فەرموو ئەمیر کە کاتێ ئەم ئایەتە خوێنرایەوە ﴿و نزعنا ما في صدورهم من غل إخوانا على سرر متقابلين﴾ فەرمووی: (أرجوا أنا و طلحة و زبير من هؤلاء) بێگومان هەر وایشە لە حەدیسی قودسیدا هاتووە (إذا هم عبدي بسيئة فلم يعملها فلا تكتبوها عليه) ئەم حەدیسە دژی ئەمە نییە کە لەم حەدیسەدا فەرمووی کوژراویش وا لە ئاگردا، چونکە سوور بوە لەسەر کوشتنی هاورێکەی، چونکە وشەی (هم) بریتییە لە خەتەرەو نیازێکی رووت بەبێ ئەوەی بڕیاری لەسەر بدات، بەڵام وتەی (حريصا) بریتییە لە عەزم و بڕیاری تەواو.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٦٨٧٥، ٧٠٨٣)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٣ـ بابُ ظُلْمٌ دُونَ ظُلْمٍ

٣٢ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيْدِ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ . ح .

قَالَ وَحَدَّثَنِي بِشْرٌ قَالَ حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ عَنْ شُعْبَةَ عَنْ سُلَيْمَانَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنْ عَلْقَمَةَ عَنْ عَبْدِاللهِ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ ﴿الَّذِيْنَ آمَنُوا وَلَمْ يَلْبِسُوا إِيْمَانَهُمْ بِظُلْمٍ﴾ (الأنعام:٨٢) قَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِﷺ : أَيُّنَا لَمْ يَظْلِمْ؟ فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ (لقمان:١٣)

ئەمە بابێکە (ظلم دون ظلم) زوڵمی وا هەیە سووک ترە، واتە زوڵم چەند جۆرێکی

هەیە، هێندێ لە جۆرەکانی سووک ترە تا ئەگاتە زوڵمی هەرە گەورە کە هاوبەش ڕەوا دانە بۆ خواو بڕوا نەبوونە بە ئایینی خوا. ئەم ڕستەیە لە حەدیسێکدا هاتووەو ئیمامی بوخاری کردوویەتی بە عینوان بۆ باسەکەی.

ئینجا حەدیسێ ئەهێنێ لە عبداللەی کوڕی مەسعودەوە، ئەفەرموێ: کاتێ ئەم ئایەتە خوارەوە ﴿الذين أمنوا و لم يلبسوا إيمانهم بظلم﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو ئیمانەکەیان تێکەڵی زوڵم نەکردووە. ئەم ئایەتە زۆر قورس و سامناک بوو لە دڵی هاوەڵەکانداو گوتیان جا کام لە ئێمە زوڵمی نەکردووەو ئیمانەکەی پاک و خاوێن کردووە لە هەرجۆرە زوڵمێک، واتە وایان زانی کە مەبەست هەر جۆرە زوڵمێکە (فأنزل الله:﴿إن الشرك لظلم عظيم﴾) ئینجا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: بەڕاستی هاوبەش ڕەوادان بۆ خوا زوڵمێکی گەورەیە.

لەو ئایەتەوە بۆیان دەرکەوت مەبەست بەو زوڵمە کوفرە. واتە ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو لە کاتێکدا ئیمانەکەیان تێکەڵی کوفر نەکردووە، بەم ڕەنگە لە پاش ئیمان هێنانەکەیان پاشگەز نەبوونەتەوە، یان بەم جۆرە ئیمانەکەیان ڕاست بوو بە دەم و بە دڵ نەک ناپاک بووبن ﴿أولئك لهم الأمن و هم مهتدون﴾ بە کورتی وتەی (ظلم) لە ئایەتەکەدا مەبەستی گەورەترینیانەو باری دووەم موناسیب ترە بەو بۆنەوە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٣٦٠، ٣٤٢٨، ٣٤٢٩، ٤٦٢٩، ٤٧٧٦، ٦٩١٨، ٦٩٣٧)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٤ـ بابُ عَلَامَاتِ الْمُنَافِقِ

**٣٣ـ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ أَبُو الرَّبِيعِ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بنُ جَعْفَرٍ قَالَ حَدَّثَنَا نَافِعُ بنُ مَالِكِ بنُ أَبِي عَامِرٍ أَبُو سُهَيْلٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاثٌ: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ).**

باسی مونافیق ئەهێنێ بە دوایداو ئەفەرموێ: (باب علامات المنافق) ئەمە بابی نیشانەی مونافیق و ناپاکە. ئینجا حەدیسێ ئەهێنێ بە بەڵگە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ : (قال: آية المنافق ثلاث: إذا حدث كذب) فەرموی: نیشانەی مونافیق

سیانە: کاتێ قسەی کردو هەواڵی دا درۆ ئەکات (و إذا وعد أخلف) ئەگەر بەڵێنی دا خیلاف وەعد ئەکات (و إذا ائتمن خان) کاتێ کە کرا بە ئەمیندار لەسەر شتێ خیانەت ئەکات.

لەم حەدیسەشەوە دەرکەوت کە ئیمان کۆ ئەبێتەوە لەگەڵ زوڵم و گوناهەکاندا بێجگە لە گەورەترینداا. ئینجا مەبەست ئەوە نیە هەرکەسێ ئەو نیشانانەی تێدا بوو ئەو کەسە ناپاک و مونافیقە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە نیشانەی ناپاکی پێوەیە، یان مەبەست ئەو کەسە ئەو سیفەتە پیسانەی کردبێ بە باو بۆ خۆی و هەمیشە ئەوە خو و پیشەی بێت، بێگومان هەرکەس ئیماندار بێ ناگاتە ئەو رادەیە، یا مەبەست ئەوەیە خاوەنی ئەو سیفەتە بەوانە شێوەیان لە مونافیق ئەکات، چونکە نیشانەو دروشمی مونافیقی پێوە هەیە. یان مەبەست ئەوەیە لە کردەوەدا مونافیقە نەک لە عەقیدەدا. یان مەبەست ترساندنە لەوەی موسڵمان نزیکی ئەو سیفەتانە بکەوێتەوە یان بە پێی ئەو چەرخ و کاتەیە کە موسڵمانان بە راستی موسڵمان بوون و پاک و خاوێن بوون و بێجگە لە مونافیقەکان کەسانی تر ئەو خو و سیفەتە پیسانەی نەبووە. لەسەر هەر بار بە کورتی بە پێی دیەن و رواڵەتەکە مەبەست نیە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٦٨٢، ٢٧٤٩، ٦٠٩٥)دا دووبارە بووەتەوە.

٣٤- حَدَّثَنَا قَبِيصَةُ بنُ عُقْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ مُرَّةَ عَنْ مَسْرُوقٍ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْرٍو أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: (أَرْبَعٌ مَنْ كَانَ فِيهِ كَانَ مُنَافِقًا خَالِصًا، وَمَنْ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنْهُنَّ كَانَتْ فِيهِ خَصْلَةٌ مِنَ النِّفَاقِ حَتَّى يَدَعَهَا: إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ، وَإِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا عَاهَدَ غَدَرَ، وَإِذَا خَاصَمَ فَجَرَ).

تَابَعَهُ شُعْبَةُ عَنِ الأَعْمَشِ.

ئینجا حەدیسێ تر ئەهێنێ لە عبداللەی کوڕی عەمرو کوڕی عاسەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (أربع من كن فيه كان منافقا خالصا) چوار شت هەیە هەرکەس ئەو چوارەی تێدا بێ ئەو کەسە مونافیقی پەتی -تەواو-ە (ومن كانت فيه خصلة منهن كانت فيه خصلة من النفاق) هەرکەسێ یەکێکی لەوانەی تێدا بێ بەشێکی لە ناپاکی تێدایە (حتى يدعها) هەتا وازی لێ نەهێنێ (إذا ائتمن خان، وإذا حدث كذب، و إذا عاهد غدر، وإذا خاصم فجر) لەم حەدیسەدا یەک سیفەت و نیشانەی تری هێناوە ئەوەی لە حەدیسی پێشوودا گوترا بۆ

ئەوەشەو كەواتە هیچی تر ناڵێین بەس ئەڵێین سێ لەو سیفەت و نیشانانە لە هەردوو حەدیسەکەدا هەن یەکێکیان هەر لێرە هەیە وەک روونە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٤٥٩، ٣١٧٨)دا دووبارە بووەتەوە.

***　***　***

## ٢٥ـ بابُ قِيَامُ لَيْلَةِ الْقَدْرِ مِنَ الإِيْمَانِ

٣٥ـ حَدَّثَنَا أَبُو اليمانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (مَنْ يَقُمْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيْمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ).

لەپاش ئەوەی سیفەت و نیشانە بەدەکانی موونافیقی باس کرد، ئینجا دێتە سەر باسی نیشانەو سیفەتی ئیمانداران. ئەفەرموێ: (باب قيام ليلة القدر من الإيمان) شەو نوێژی (ليلة القدر) بەشێکە لە ئیمان. ئینجا لە رێگاکەی خۆیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە: (قال رسول الله ﷺ: من يقم ليلة القدر إيمانا واحتسابا غفر له ما تقدم من ذنبه) پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: هەرکەسێ شەوی (ليلة القدر) هەڵسێ بۆ عیبادەت کردن بە باوەڕێکی رێک و پێکەوەو هەر بە ئومێدی ئەجرو پاداشتەوە نەک لەبەر ریبا یان هەر نیازێکی تر ئەسڕێتەوە لێی گوناهی لەوەو پێشی.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٧، ٣٨، ٢٠٠٨، ٢٠٠٩، ٢٠١٤)دا دووبارە بووەتەوە.

***　***　***

## ٢٦ـ بابُ الْجِهَادُ مِنَ الإِيْمَانِ

٣٦ـ حَدَّثَنَا حَرَمِيُّ بْنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا عُمَارَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو زُرْعَةَ بْنُ عَمْرِو بْنِ جَرِيرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (انْتَدَبَ اللهُ لِمَنْ خَرَجَ فِي سَبِيلِهِ ـ لاَ يُخْرِجُهُ إِلاَّ إِيْمَانٌ بِي وَتَصْدِيقٌ بِرُسُلِي ـ أَنْ أُرْجِعَهُ بِمَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ، أَوْ أُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ. وَلَوْ لاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي مَا قَعَدْتُ خَلْفَ سَرِيَّةٍ، وَلَوَدِدْتُ أَنِّي أُقْتَلُ فِي سَبِيلِ اللهِ ثُمَّ أُحْيَا، ثُمَّ أُقْتَلُ ثُمَّ أُحْيَا ثُمَّ أُقْتَلُ).

ئەمە بابێکە وەک بابەکانی تر لە بارەی ئیمانەوە (الجهاد من الإيمان) جیهاد بەشێکە لە ئیمان. واتە ئیمان هۆیە بۆ جیهادو ئیمان ئەبینرێ و دەستی پێ هەڵئەگرێ لە رۆح و ماڵ و ئەولادی. ئینجا ئیمام لە رێگەی خۆیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (انتدب الله لمن خرج في سبيله) خوا کەفالەتی کردووە بۆ هەرکەس دەرچێ لە رێگای ئەودا، واتە بۆ جیهادو غەزا. وشەی (في سبيل الله) هەرچەند گشتی‌یە بۆ هەر خێرو چاکەیەک، بەڵام لە عورفی شەرعدا تایبەتی کراوە بە جیهادو غەزا. ئەوەتا زانایان زەکات ئەدەن بەوانەی کە ئەرۆن بۆ جیهادو غەزا، بەراستی هەر ئەوان شایانن بۆ ئەوە، چونکە لەو کردەوەدا راستی لێ برانی بەندە دەرئەکەوێ بۆ خوا. ئیسلام بە بێ ئەو خوا پێداوانە وجودی نەبووەو نابێ جا پێغەمبەری ئازیزﷺ لە زمانی خواوە شێوەی کەفالەتەکە نیشان ئەدات، ئەفەرموێ: (لا يخرجه إلا إيمان بي و تصديق برسلي) هیچ هۆو نیازێ دەری نەکات بێجگە لە ئیمان و بڕوا بە من و تەصدیقی پێغەمبەرەکانم (أن أرجعه بما نال من أجر أو غنيمة أو أدخله الجنة) واتە خوا ئەفەرموێ کەفالەت ئەکەم بۆ ئەو کەسە بە ئەجرو سەواب ئەگەر غەنیمەتی دەست نەکەوت و بە ئەجر لەگەڵ غەنیمەتدا ئەگەر دەست کەوتی بوو یا ئەگەر تێدا چوو شەهید بوو بیخەمە بەهەشت (لو لا أن أشق على أمتي ما قعدت خلف سرية) ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ زەحمەت و مەشەقەت بخەمە سەر ئومەتەکەم دانەئەنیشتم لە پاش هیچ سریەیەک کە دەرئەچوو بۆ غەزا، بەڵکو لەگەڵیان دەرئەچووم بە نەفسی خۆم. واتە ئەگەر من دەرچوومایە خەڵکی تریش دەرئەچوون، خەڵکی لەبەر نەخۆشی یان بێ دەسەڵاتی دەرچوونەکە ئەبوو بە زەحمەت و مەشەقەت و ئەویش رؤوف و رەحیمە بە ئیمانداران سەڵات و سەلامی خوای لێ بێ و خوا پاداشتی بداتەوە، ئینجا فەرمووی: (ولوددت أني أقتل في سبيل الله ثم أحيا، ثم أقتل ثم أحيا، ثم أقتل) سێ جار فەرمووی پێم خۆشە بکوژرێم لە رێگای خواداو ئینجا زیندوو بکرێمەوە. ئەوەش لەبەر گەورەیی ئەجرو پاداشتی شەهید. واتە ئاواتەکەی بۆ دەست کەوتنی ئەو ئەجرەیە نەک بۆ ئاواتی گوناهی بکوژەکە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٧٨٧، ٢٧٩٧، ٢٩٧٢، ٣١٢٣، ٧٢٢٦، ٧٢٢٧، ٧٤٥٧، ٧٤٦٣)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٧ـ بابٌ تَطَوُّعَ قِيَام رَمَضَانَ مِنَ الإِيمَانِ

٣٧ـ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ حُمَيْدِ بنِ عَبْدِالرَّحْمنِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: (مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ).

ئەمە بابێکە لە وێنەی بابەکانی تر گەیاندنی ئەوە بە کردەوە بەشێکە لە ئیمانی کامڵ (تطوع قيام رمضان من الإيمان) واتە زەحمەت کێشان بۆ تەروایح بەشێکە لە ئیمان.

ئینجا لەم بارەیەوە لەسەر شەرتی خۆی ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە: (أن رسول الله ﷺ قال: من قام رضان إيمانا و احتسابا غفر له ما تقدم من ذبه) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەرکەسێ شەو نوێژو تەراویحی رەمەزان بەجێ بهێنێ بە باوەڕێکی راستەوەو بە نیازی ئەجرو پاداشتی خوا ئەسڕێتەوە لێی گوناهی لەوەو پێشی. هەرچەند بە رواڵەت گوناهە گەورەکانیش ئەگرێتەوە، بەڵام لە هەندێ حەدیسدا گوناهە گەورەکان مەبەست نییەو تایبەتییە بە گوناهە بچووکەکانەوە، چونکە گەورەکان تەوبەو حەدی شەرعی پێویستە. بەڵام فەزڵ و رەحمی خوا بێ سنوورە ئەوانیش مەبەست بێ جێی سەرسوڕمان نییە.

***　***　***

## ٢٨ - بَابُ صَوْمُ رَمَضَانَ احْتِسَابًا مِنَ الإِيمَانِ

٣٨- حَدَّثَنَا ابْنُ سَلَامٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بنُ فُضَيْلٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بنُ سَعِيدٍ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».

ئەم حەدیسە لە پێشەوە ئاماژەی پێ کراو بە درێژتریش لە بابی رۆژوودا باسی لێوە دەکرێت.

***　***　***

## ٢٩ـ بابُ الدِّينُ يُسْرٌ

وَقَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ : (أَحَبُّ الدِّينِ إِلَى اللهِ الْحَنِيفِيَّةُ السَّمْحَةُ)

٣٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدُالسَّلامِ بنِ مُطَهَّرٍ قَالَ حَدَّثَنَا عُمَرُ بنُ عَلِيٍّ عَنْ مَعْنِ بنِ مُحَمَّدٍ

الْغِفَارِيُّ عَنْ سَعِيدِ بنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (إِنَّ الدِّينَ يُسْرٌ، وَلَنْ يُشَادَّ الدِّينَ أَحَدٌ إِلاَّ غَلَبَهُ، فَسَدِّدُوا، وَقَارِبُوا، وَأَبْشِرُوا، وَاسْتَعِينُوا بِالْغَدْوَةِ وَالرَّوْحَةِ وَشَيْءٍ مِنَ الدُّلْجَةِ).

حەدیسەکانی رابردوو هاندان بوو لەسەر تێکۆشان لە عیبادەتدا. ئینجا لێرەدا ئەم بابە ئەهێنێ لە بارەی ئەوەوە کە نابێ موسڵمان خۆی برەنجێنێ ئەفەرموێ: (باب الدین یسر) ئەمە بابێکە لە بارەی ئەوەوە کە ئەم ئیسلامە سووک و ئاسانەو توندو تیژیی تێدا پەسەند نی‌یە. ئەفەرموێ ئایینی ئیسلام ئاسانە (وقول النبيﷺ: أحب الدين إلى الله الحنيفية السمحة) وە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ: خۆشەویست ترین دین بە لای خواوە ئەو ئایین و میللەتەیە کە راست و رێکەو دوورە لە هەموو بەتاڵێک و سووک و ئاسانە. لەم بارەوە بە پەسەندی خۆی ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە -خوای لێ رازی بێت- لە پێغەمبەرەوەﷺ کە فەرموی: (إن الدين يسر ولن يشاد الدين أحد إلا غلبه) بەراستی ئایینی خوا سووک و ئاسانەو هەرکەسێ بە قوڵی بچێ و بیەوێ هەموو شتێ بەجێ بێنێ و زاڵ بێ بێگومان ئەو کەسە سەرناکەوێ و ئایینەکە زاڵ ئەبێ بەسەریداو ئەو کەسە لە دوارۆژدا پەکی ئەکەوێ و واز ئەهێنێ لە هەمووی یان لە هێندێکی (فسددوا وقاربوا) کەواتە ئیماندارەکان میانەو ناوەڕاست بگرن و کە ئەتانتوانی بگەنە پلەیەک ئەوا کەمتر لەوە بگرن و نزیک بکەونەوە لەو. (وأبشروا) مژدە بەخش بن بە ئەجرو پاداشتی ئەوەی کە ئەیکەن (واستعينوا بالغدوة و الروحة) وە کۆمەکی وەرگرن بە ئەندازەی خەریک بوون لە لای بەیانی و لە لای ئێوارە (و شيئ من الدلجة) ئەندازێک لەشەو بۆ عیبادەت و شەو نوێژ، بێگومان ئەم جیهانە جێگاو شوێنی سەفەری‌یە هەموو رێکەوتوون بەرەو رۆژی دوایی، کەواتە ئەگەر ئیسراحەتێ ئەکرێ و هەمیشە لەگەڕاندا بێ ماندوو ئەبێ و پەکمان ئەکەوێ و ئەبێ بە قۆناغ قۆناغ رێگەکە ببڕین. بەم فەرمودە پێغەمبەرﷺ تەمێمان ئەکات کە خۆمان تەنگەتاو نەکەین.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٥٦٧٣، ٦٤٦٣، ٧٢٣٥)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣٠- باب الصلاة من الإيمان

وقولُ اللهِ تعالَى: ﴿وما كانَ اللهُ ليُضيعَ إيمانَكُمْ﴾ (البقرة:١٤٣)، يعني: صلاتَكُمْ عِنْدَ البَيْتِ.

٤٠- حدثنا عمرو بنُ خالدٍ قال: حدثنا زُهَيرٌ قال: حدثنا أبو إسحاقَ عن البراءِ أنَّ النبيَّ ﷺ كانَ أوَّلَ ما قدِمَ المدينةَ نزلَ على أجدادِه -أو أخوالِه- من الأنصارِ، وأنَّهُ صلَّى قِبَلَ بيتِ المقدسِ ستَّةَ عشرَ شهراً، أو سبعةَ عشرَ شهراً، وكانَ يُعجبُهُ أن تكونَ قبلتُهُ قِبَلَ البيتِ، وأنَّهُ صلَّى أوَّلَ صلاةٍ صلَّاها صلاةَ العصرِ، وصلَّى معهُ قومٌ، فخرجَ رجلٌ ممَّن صلَّى معهُ فمرَّ على أهلِ مسجدٍ وهم راكعونَ فقالَ: أشهدُ باللهِ لقدْ صلَّيتُ معَ رسولِ اللهِ ﷺ قِبَلَ مكَّةَ، فداروا -كما هم- قِبَلَ البيتِ. وكانتِ اليهودُ قد أعجبَهُم إذ كانَ يُصلِّي قِبَلَ بيتِ المقدسِ، وأهلُ الكتابِ، فلمَّا ولَّى وجهَهُ قِبَلَ البيتِ أنكروا ذلكَ.

قالَ زُهَيرٌ: حدثنا أبو إسحاقَ عن البراءِ في حديثِه هذا أنَّهُ ماتَ على القبلةِ قبلَ أن تُحوَّلَ رجالٌ وقُتِلوا، فلم ندرِ ما نقولُ فيهم، فأنزلَ اللهُ تعالى: ﴿وما كانَ اللهُ ليُضيعَ إيمانَكُمْ﴾.

بێگومان ئەم پێنج فەرزی نوێژە گەورەترین عیبادەتە لەشیەکانە کە لەم پێنج کاتەدا بەجێ ئەهێنرێن. لەبەر ئەوە ئیمامی بوخاری ئەم بابەی کرد بە باسی نوێژو ئەفەرموێ: (باب الصلاة من الإيمان) نوێژکە بەشێکە لە ئیمان: بەڵکو نوێژ بە ئیمان ناوبراوە وەک ئەفەرموێ: (وقول الله تعالى: ﴿وما كان الله ليضيع إيمانكم﴾) هەرگیز نەبووەو باوی خوا ئەوە نی‌یە کە ئیمانەکەتان زایە بکات. بوخاری ئەفەرموێ: (يعني صلاتكم عند البيت) واتە نوێژەکانتان لە مەککە لای بەیتدا.

لێرەدا چەند قسەو رایەک هەیە کە ئایا پێغەمبەرو یارەکانی ﷺ روویان بۆ کوێ کردووە، هێندێ ئەفەرموون روویان ئەکردە کەعبە، لە پاشان فەرمان کرا روو بکەنە بيت المقدس تا ١٦ یان ١٧ مانگ پاش کۆچ کردن لە پاشان ئەوە نەسخ کرایەوە بە فەرماندان بە روو کردنە کەعبە هەتا هەتایە. لەسەر ئەم رایە ئەبێ دووجار نەسخ رووی دابێ لە مەسەلەی رووگەدا. بۆ سێ شتی تر نسخ دووجار بووەتەوەوکراوە بە شیعر:

و أربع تكرر النسخ لها جائت بها الأخبار والآثار

فقبلة و متعة والخمر كذا الوضوء مما تمس النار

بەلام رای بەهێزو سەحیح لەسەر ئەوەیە کە یەکجار نەسخ بووە بۆ رووگە. بەم رەنگە لە یەکەم جارەوە لە مەکەیش هەر رووکراوەتە بیت المقدس کە رووگەو قیبلەی هەموو پێغەمبەران بووە -علیهم الصلاة و السلام- تا ئەو کاتەی کۆچیان کرد بۆ مەدینەی مونەوەرە.

ئینجا چۆنیەتی رووکردن لە مەککەوە بۆ بیت المقدس بە جۆرێ بووە پشت نەکراوەتە کەعبە، بەڵکو کەعبە خراوەتە بەینی، کە ئەم رایە بەهێزەو ئیمامی بوخاری لەسەرە. واتە ئەو نوێژانەتان کە لە مەککەدا کردووتانە بەرەو بیت المقدس خوا زایەیان ناکات، کەواتە باشتر زایەیان ناکات کە لە دووری مەککەوە کردوتانە بەرەو بیت المقدس.

بە کورتی نوێژەکانتان لە پاڵی بەیتدا بۆ غەیری کەعبە ماتوڵ راست و رەوا بووبێ ئەبێ باشتر کە دوور کەوتوون زایە نەبێ. وەک لەم حەدیسەشدا روون ئەبێتەوە لە (بەرائی کوڕی عازب)ەوە کە: (أن النبيﷺ كان أول ما قدم المدينة) پێغەمبەرﷺ لە یەکەمجاری هاتنی بۆ مەدینە (نزل على أجداده -أو أخواله- من الأنصار) نیشتە جێ بوو لای باوانی یان فەرمووی خاڵۆکانی لە ئەنسار (و أنه صلى قبل البيت المقدس ستة عشر شهرا أو سبعة عشر شهرا) بەرەو بیت المقدس نوێژی ئەکرد ماوەی ١٦یان١٧ مانگ (وكان يعجبه أن تكون قبلته قبل البيت) بە هەمیشەیی چاوەڕوان و پێی خۆش بوو قیبلەکەی بەرەو کەعبە بێت. (و أنه صلى أول صلاة صلاها صلاة العصر) یەکەم نوێژێ کە لە مەدینە کردی بەرەو کەعبە نوێژی عەسر بوو، (و صلى معه القوم، فخرج رجل ممن صلى معه) کۆمەڵێک لەگەڵی بوون لەو نوێژەداو یەکێ لەوانەی کە ئەو نوێژەیان ئەکرد لەگەڵی دوای نوێژەکەی رابورد بەلای کەسانێ کە نوێژیان ئەکرد لە مزگەوتێکدا بەرەو بیت المقدس (فقال أشهدوا بالله لقد صليت مع رسول اللهﷺ قبل مكة) گوتی شایەتی ئەدەم و سوێند بە خوا نوێژم کرد لەگەڵ پێغەمبەردا بەرەو مەککە (فداروا كما هم قبل البيت) ئینجا ئەوانیش هەر بەو شێوەی خۆیانە وەرگەڕانەوە بەرەو مەککە. کەواتە لەو نوێژەدا روو کرایە هەردوو قیبلەکە لەو کاتەوە ئەو مزگەوتە ناوبراوە بە (مسجد القبلتين) (و كانت اليهود قد أعجبهم إذ كان يصلي قبل

البـيت المقـدس و أهل الكتـاب، فلمـا ولى وجـهـه قـبل البـيت أنكروا ذلك) جوولەکە پێخۆشحاڵ بوون ئەو کاتەی کە رووی کردە بیت المقدس کە بە قیبلەی خۆیانیان دائەنا، وە بە گشتی هەمـوو نامـەدارەکـان ئەوەیان پێ خـۆش بوو کـە روو ئەکـاتە قـیبلەکـەی ئەوان، واتە ئەساراش پێیان خۆش بوو، ئەویش لەبەر ئەوەی وەک جوولەکە بە نامەدار دائەنران، کەواتە هەرچەند ئەوان (بیت المقدس)یان بە قیبلەی خۆیان دائەنا، یان لەبەر ئەوەی کەعبەیان بە قیبلەی عەرەب دائەناو پێیان خۆش بوو روونەکاتە قیبلەکەی ئەوان، کاتێ رووی کرد بەرەو کەعبە ئەوەیان بە کارێکی بێزراو دائەنا.

لە (بەرائی کوڕی عازب)ەوە لەم حەدیسەدا ئەمەش بوو: (أنه مات على القبلة قبل أن تحول رجال و قتلوا فلم ندر ما نقول فيهم فأنزل الله تعالى هذه الآية: ﴿وما كان الله ليضيع إيمانكم﴾) چەند پیاوێک کوژران کە بەرەو بیت المقدس نوێژیان کردبوو، ئینجا کە قیبلە گۆڕا بە کەعبە ئەمان ئەزانی چییان دەربارە بڵێین. ئینجا خوا ئەم ئایەتەی هێنایە خوارەوە ﴿وما كان الله ليضيع إيمانكم﴾.

ئەم حەدیسە چەند شتێک نیشان ئەدات:

١) بەرپەرچ دانەوەی مورجیئە کە دژی ئەوەن کردەوەکان ناو ببرێن بە ئیمان.

٢) ئاوات خـواستن بە گـۆڕان هەندێ جـار دروسـتـە ئەگـەر ئاشکرا بێت بەرژەوەندی تێدایە، ئەگەر وا نەبێ دروست نییە بۆ نموونە هەرکەسێ ئاوات بخوازێ و پێی خۆش بێ زینا حەڵاڵ بوایە ئەو کەسە کافر ئەبێ.

٣) دەرکەوتنی شەرەف و پلەو پایەی پێغەمبەری ئازیزﷺ ئەوەتا بە بێ داوا کردن بە دەم گۆڕانی قیبلەی بۆ کەعبە پێ بەخشی.

٤) دەرئەکەوێ کە هاوەڵەکانی چەندە بەهێزو سوور بوون لەسەر ئایینەکەیان و خاوەن سۆزو بەزەیی بوون دەربارەی برا ئیمـانییەکـانیـان خـوا لە هەموویان رازی بێ، وە وێنەی ئەو بەزەییەیان دەرکەوت لەسەر ئەو برا ئیمـانییەیان کە ئارەقیان خواردبووەوە پێش قەدەغە کردنی تا ئایەتی ﴿ليس على الذين آمنوا وعملوا الصالحات جناح فيما طعموا ...﴾.

بە بۆنەی ئەوەوە بە دوای ئەم بابە پێشووەدا ئەم بابەی هێنا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٩٩، ٤٤٨٦، ٤٤٩٢، ٧٢٥٢)دا دووبارە بووەتەوە.

## ٣١ـ باب حُسْنِ إسلامِ المَرْءِ

٤١ـ قَالَ مَالِكٌ: أَخْبَرنِي زَيْدُ بنُ أَسْلَمَ أَنَّ عَطَاءَ بنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (إِذَا أَسْلَمَ الْعَبْدُ فَحَسُنَ إِسْلاَمُهُ يُكَفِّرُ اللهُ عَنْهُ كُلَّ سَيِّئَةٍ كَانَ زَلَفَهَا، وَكَانَ بَعْدَ ذَلِكَ الْقِصَاصُ: الْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ، وَالسَّيِّئَةُ بِمِثْلِهَا، إِلاَّ أَن يَتَجَاوَزَ اللهُ عَنْهَا).

٤٢ـ حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بنُ مَنْصُورٍ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُالرَّزَّاقِ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنْ هَمَّامٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إِذَا أَحْسَنَ أَحَدُكُمْ إِسْلاَمَهُ فَكُلُّ حَسَنَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ، وَكُلُّ سَيِّئَةٍ يَعْمَلُهَا تُكْتَبُ لَهُ بِمِثْلِهَا).

ئەمە بابێکە (باب حسن إسلام المرء) ڕێک و چاکی ئیسلامی و موسڵمانیتی خەڵکی‌یە (إذا أسلم العبد حسن إسلامه) کاتێ بەندە موسڵمان بوو بەراستی و بێگومان و بە ئیخلاسەوە (یکفر الله عنه کل سیئة کان زلفها) خوا ئەسڕێتەوە لەو کەسە هەر گوناهو خراپەیە کە پێشی خستبێ و لەوەو پێش کردوویەتی (وکان بعد ذلك القصاص) ئینجا لەپاش ئەوە نووسینی چاکەو خراپە ئەبێ، بە وتەی ڕابردوو فەرمووی بە (کان) لەبەر ئەوە گومان نی‌یە لە بەدی هاتنی‌دا کە وێنەی ئەوە زۆر زۆرە لە قورئاندا. نووسینی ئەو چاکەو خراپەی پێش ئیسلام بۆی تێپەڕی کردو نووسینی نی‌یە، مەگەر ئەو چاکانەی کە ئیسلام بوونی بە دوادا هاتبێ تا مردن ئەوە بەڵگەی بەهێز هەیە کە خوا ئەوانەشی بۆ ئەنووسێ و ئەجرو پاداشتی پێ ئەدا. بەڵام خراپەکانی تۆڵەیان نی‌یە مەگەر ئەو کەسانەی کە داهێنەری کردەوەو باوەڕێکی بەدبووبن وەک لە حەدیسی سەحیحدا هەیە کە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: (رأیت عمر بن عامر الخزاعي یجر قصبه في النار لإنه أول من سیب السوائب) ئەم مەسەلەیە قسەوباس و لێکۆڵینەوەی زۆری تێدا هەیەو ئەمەی کە گوترا وا ئەزانم پاڵفتەکەیەتی و خواو پێغەمبەر باش ئەزانن.

ئینجا دێینەوە سەر چۆنێتی نووسینی کردەوەی تازەی موسڵمانەکان: (الحسنة بعشر أمثالها إلى سبعماة ضعف) چاکەیان لای خواروەکەی بە دە قاتەو تا ئەڕواتە حەوت سەد قات (والسیئة بمثلها) خراپە بە وێنەی خۆیەتی و یەک قاتە (إلا أن یتجاوز الله عنها) مەگەر خوا

ببوریّ لیّ‌ی ئەو کاتە هیچی لەسەر نانووسریّ لە لوتفی بە زیاد بێت و خوا بە میهرەبانی خۆی بەری ئەو لیّ بوردوانەمان بخات آمین.

ئینجا هێندیّ لەسەر ئەوەن کە لە حەوت سەد قات تێپەڕ ناکات، بەڵام ڕواڵەتی ئایەتی ﴿و الله یضاعف لمن یشاء﴾ هەڵئەگریّ بۆ زیاد لەوەو حەدیسی ئیبن و عەباس -خوا لێیان ڕازی بێت- کە لای بوخاریش هەیە کە ئەفەرمویّ: (کتب الله له عشر حسنات إلی سبعمأة ضعف إلی أضعاف کثیرة) پشتگیرە بۆ ئەوەی لە حەوت سەد قاتیش تێپەڕ ئەکات.

ئەم حەدیسەش مەزهەبی خەواریج و موعتەزیلە بەتاڵ ئەکاتەوە. ڕواڵەتی حەدیسەکە دەربارەی تازە موسڵمانەکانەو هەر باسی ئەوانە، بەڵام لە بارەی ئەوەش هەر بە موسڵمانەتی هاتبن هەمان حوکمیان بۆ هەیە وەک بەو شێوەش لە حەدیسدا هاتووە، یەکیّ لەو حەدیسانە ئەمەیە کە ئیمام لێرەدا هێناویەتی:

لە ئەبو هورەیرەوە: (قال رسول الله ﷺ: إذا أحسن أحدکم إسلامه) هەرکام لە ئێوە ئیسلامەکەی بە ڕێک و پێکی برد بەڕێوە بەراستی و ئیخلاسەوە (فکل حسنة یعملها تکتب له بعشر أمثالها إلی سبعمأة ضعف) هەرچاکەیەک بکات لای خوارووی بە دەقاتە بۆی ئەنووسریّ تا ئەگاتە حەوت سەد قات (وکل سیئة یعملها تکتب له بمثلها) هەر گوناهو خراپەیەک بکات بە یەک قات بۆی ئەنووسریّ.

دیارە ئەوەی لە حەدیسی پێشوودا فەرمووی: (إلا أن یتجاوز...) لێرەشدا مەبەستە.

***　　***　　***

## ٣٢- بابُ أَحَبُّ الدِّیْنِ إِلَی اللهِ أَدْوَمُهُ

٤٣- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ الْمُثَنَّی حَدَّثَنَا یَحْیَی عَنْ هِشَامٍ قَالَ أَخْبَرَنِي أَبِي عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ عَلَیْهَا وَعِنْدَهَا امْرَأَةٌ، قَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ قَالَتْ: فُلاَنَةُ -تَذْکُرُ مِنْ صَلاَتِهَا- قَالَ: (مَهْ، عَلَیْکُمْ بِمَا تُطِیْقُونَ، فَوَاللهِ لاَ یَمَلُّ اللهُ حَتَّی تَمَلُّوا). وَکَانَ أَحَبُّ الدِّیْنِ إِلَیْهِ مَادَامَ عَلَیْهِ صَاحِبُهُ).

ئەمە بابێکە هەر لە وێنەی ئەم بابانی ئێرە (أحب الدین إلی الله أدومه) خۆشەویست ترین دین بە لای خواوە بەردەوام ترینە، دیارە مەبەست بە دین لێرەدا کردەوەیە نەک باوەڕو

عەقیدە، چونکە ئەم جۆرە ئەبێ هەر هەمیشەیی و بەردەوام بێت، چونکە ئەگەر کاتێ بەردەوام نەبێ ئەبێ کوفر رووبدات، ئەوکاتە بوغزو قینی خوا ئەبێ و هیچ ویستن و رەزامەندی نابێ.
ئینجا ماتوڵ مەبەست بە دینەکە کردەوەیە ئەبێ هەمیشەیی و بەردەوامی عورفی بێت، چونکە ناگونجێ بەندە هەمیشە لە کردەوەدا بێت و خوایش داوای ئەوە ناکات، وەک لە دەقی ئەم حەدیسەشدا هەیە کە ئیمام لە دایکی ئیمانداران خاتو عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە: (أن النبي ﷺ دخل عليها وعندها امرأة، قال: من هذه؟) پێغەمبەر هات بۆ لای لە کاتێکدا ئافرەتێکی لا بوو، ئینجا فەرمووی ئەم ئافرەتە کێیە؟ (قالت: فلانة) گوتم ئەمە فلانە کەسە. (تذكر من صلاتها) باسی نوێژی زۆر کرد، یان خەڵکی باسی نوێژی زۆری ئەکەن، لە ریوایەتێکدا دایکی ئیمانداران فەرموی کاتێ کە ئافرەتەکە هەڵسا وتم: ئەمە فلانە کەسەو شەو نوێژی زۆر ئەکات و ناخەوێ و عابیدەیەکی ئەهلی مەدینەیە. لە ریوایەتێکی تردا هاتووە کە ئافرەتەکە هەڵسایە پێ لەپاشان دایکمان مەدح و سەنای کردبێ. کەواتە مەدحەکە جێی قسە نییە، (قال: مه عليكم بما تطيقون) واز بێنە لە مەدح کردن بەو زۆر تێکۆشان و ماندوو کردنە، ئەوەی لە تواناتاندا هەیە ئەو بکەن و زیادە رەوی مەکەن (فو الله لا يمل حتى تملوا) سوێند بە خوا خوا ماندوو نابێ هەتا ئێوە ماندوو ئەبن.

ئەم رستەو وێنەیان زۆرە لەزمانی عەرەب و لەئایەت و حەدیسدا، ئەم جۆرە وتانە لەو وتانەن کە پێیان ئەگوترێ متشابه و متشابهەکانیش دوو را هەیە تیایانداو هەردوو راکە یەک قسەن کە زاهیرو رواڵەتەکەیان مەبەست نین و لەمەدا جیاوازن کە یەکەم ئەڵێن باوەڕمان پێیان هەیە بەو جۆرە لای خوا مەبەستەو ئیتر ئێمە بێ دەنگ ئەبین لە تەئویلیان.

رای دووەم ئەمەیە تەئویلیان ئەکەن بە مەبەستێکی گونجاو جا لێرەدا چەند شتێ گوتراوە کە باسیان ئەکەین، یەکێ لەوانە پێی ئەگوترێ (مشابه) واتە گێرانی شتێک بە وێنە بۆ شتێکی ترو بەناوی ئەو شتەوە ناو ببرێ، بۆ وێنە وەک ناوبردنی تۆڵەی کارێکی بەد بەناوی کارە بەدەکە وەک ئایەتی ﴿وجزاء سيئة سيئة مثلها﴾. لێرەدا بڕینی ئەجرو سەوابە لە کەسێ کە وازبێنێ و ماندوو ببێ لە عیبادەت. ناو بردنی ئەو بڕینی ئەجرو سەوابە بەماندوویی، واتە سوێند بە خوا خوا ئەجرو پاداشت لە ئێوە نابڕێت تا ئێوە ماندوو ئەبن و واز ئەهێنن لە عیبادەت لەبەر ماندوو بوونتان هەرچەند تەئویلی تر زۆر گوتراوە، بەڵام لام وایە

ئەمە بەسە.

ئینجا خۆش ویستن کە لە ئێمەدا حاڵەتی دەروونی‌یە بەکارهێنانی ئەوەش بۆ خوا لەسەر باری حەقیقەت نابێ، بەڵکو ئاسارەکەی لێ وەرئەگیرێ کە بریتی‌یە لە ئیرادەی خێر. هەروەها سیفەتی رەحم و غەزەب بەکار ئەهێنرێن بۆ خوا هەموو مجازن.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (١١٥١)دا دووپات بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣٣ـ بابُ زِيَادَةِ الإِيْمَانِ وَ نُقْصَانِه

وقَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿ وَ زِدْنَاهُمْ هُدًى ﴾ (الكهف: ١٣)، ﴿ وَ يَزْدَادُ الَّذِيْنَ آمَنُوا إِيْمَانًا ﴾ (المدثر: ٣١) وَقَالَ: ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِيْنَكُمْ ﴾ (المائدة: ٣) فَإِذَا تَرَكَ شَيْئًا مِنَ الْكَمَالِ فَهُوَ نَاقِصٌ.

٤٤ـ حَدَّثَنَا مُسْلِمُ بن إِبْرَاهِيْمَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ شَعِيْرَةٍ مِنْ خَيْرٍ، وَيخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ بُرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَفِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرَّةٍ مِنْ خَيْرٍ).

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٤٧٦، ٦٥٦٥، ٧٤١٠، ٧٤٤٠، ٧٥٠٩، ٧٥١٠، ٧٥١٦)دا دووبارە بووەتەوە.

قَالَ أَبُو عَبْدِاللهِ: قَالَ أَبَانُ حَدَّثَنَا قَتَادَةَ حَدَّثَنَا أَنَسٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: (مِنْ إِيْمَانٍ) مكان (مِنْ خَيْرٍ).

٤٥ـ حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بنُ الصَّبَّاحِ سَمِعَ جَعْفَرَ بنَ عَوْنٍ حَدَّثَنَا أَبُو الْعُمَيْسِ أَخْبَرَنَا قَيْسُ بنُ مُسْلِمٍ عَنْ طَارِقِ بنِ شِهَابٍ عَنْ عُمَرَ بنِ الْخَطَّابِ أنَّ رَجُلاً مِنَ الْيَهُودِ قَالَ لَهُ: يَا أَمِيْرَ الْمُؤْمِنِيْنَ، آيَةٌ فِي كِتَابِكُمْ تَقْرَءُونَهَا لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ نَزَلَتْ لاتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيْدًا. قَالَ: أَيُّ آيَةٍ؟ قال: ﴿ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِيْنَكُمْ، وَ أَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَ رَضِيْتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيْنًا ﴾ (المائدة: ٣) قَالَ عُمَرُ: قَدْ عَرَفْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ وَالْمَكَانَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيْهِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ: وَهُوَ قَائِمٌ بِعَرَفَةَ، يَوْمَ جُمُعَةٍ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٧٠٤٤، ٦٠٦٤، ٧٦٦٨)دا دووبارە بووەتەوە.

ئینجا دێتە سەر بابێکی تر ئەفەرموێ: (باب زيادة الإيمان و نقصانه) بابی زیادو کەم و کوڕی ئیمان (وقول الله تعالى: ﴿وزدناهم هدى﴾) بابی فەرمودەی خوایە کە ئەفەرموێ: ئەوانەمان زیاد کردووە لە بارەی ڕێنمووونی‌یەوە، هەروەها فەرمودەی خوا کە ئەفەرموێ: ﴿و يزداد الذين آمنوا إيمانا﴾ بۆ ئەوانەی ئیمانیان هێناوە زیاد ئەکەین لە بارەی ئیمانەوە. هەروەها خوا ئەفەرموێ: ﴿اليوم أكملت لكم دينكم﴾ ئیمامی بوخاری شازدە باب پێش ئەمە فەرمووی: (باب تفاضل أهل الإيمان في الأعمال) وە حەدیسی ئەبو سەعیدی خودری هێنا کە وەک ئەم حەدیسی ئەنەسە وایە کە لێرەدا هێناویەتی. جا بە هۆی ئەوەوە ڕەخنە گیراوە بەمەی تیکرارە. وە وەڵام دراوەتەوە بەمەی زیادو کەمی هەرچۆنێ بە پێی کردەوە ئەبێ هەروەها ئەگونجێ بە پێی باوەڕەکە بێ، لەبەر ئەوە بۆ هەرکام بابێکی دانا. بابی پێشوو بۆ ئەوەی زیادو کەمی‌یەکە لە ئەسڵی باوەڕەکەدا، بابەکەی ئێرە بۆ ئەوەیە زیادو کەمەکە بە پێی کردەوە بێت، کەواتە تیکرار نەبوو. لەم ئایەتی سێ‌یەمەدا شێوەکەی گۆڕی لە دوانەکەی پێشوو بەم ڕەنگە بۆ ئەوان فەرموی: (قول الله تعالى) لەم سێ‌یەمەدا فەرموی: (و قال تعالى). هۆی ئەوەشی ئەمەیە دوانە پێشووەکە دەق و سەرنجن لە زیادو نوقساندا، بەڵام سێ‌یەم دەق نی‌یە بەڵکو لێ‌یەوە لازم دێت، بەم ڕەنگە کەماڵ وەرئەگیرێ، دەست دان بۆ نەقس و دەست دان نەقسیش دەست دان بۆ زیاد ئەگەیەنێت، لەبەر ئەوە بە دوای ئەم سێ‌یەمەدا ئەمەی هێنا: (فإذا ترك شيئا من الكمال فهو ناقص) هەرکاتێ شتێکی لە کەماڵ بەجێ نەهێنا ئەو کاتە ئەو کەسە نوقسان و ناتەوە، وە بەمە دەلیلەکە تەواو بوو.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوەو ئەویش (عن النبيﷺ قال: يخرج من النار من قال لا إله إلا الله وفي قلبه وزن شعيرة من خير) دەرئەچێ لە ئاگر یان دەرئەکرێ لە ئاگر هەرکەسێ کە گوتبێتی (لا إله إلا الله) واتە شایەتومانی هێنا بێ بە خوایەتی خوا لە پێش مردنیدا، لە کاتێکدا کێشانەی دەنکە گەنمێک خێرو چاکە لە دڵیدا بووبێ، (يخرج من النار من قال لا إله إلا الله وفي قلبه وزن برة من خير) دەرئەکرێ لە دۆزەخ هەرکەسێ شایەتومانی هێنابێ و لە دڵیدا کێشانەی لە خێرو چاکە بووبێ. يخرج من النار من قال لا إله إلا الله وفي

فلیه وزن ذرة من خیر ) دەرنەکرێ لە ئاگر هەرکەسێ کە شایەتومانی هێنابێ و لە دڵیدا کێشانەی زەڕەیەک لە خێرو چاکە بووبێ. زەڕە لەزمانی عەرەبدا بە دوو شت راڤە کراوە: مێرووڵەیەکی زۆر ورد هەیە کە بە حاڵ بە چاو ئەبینرێ. وە بەو وردیلکانەی کە لە تاق و دەلاقەوە دەرئەکەون کاتێ تیشکی خۆر دێتە ژوورەوە.

(وقال ابان عن قتادة حدثنا أنس عن النبي ﷺ : (من إيمان) مكان (من خير).

(ابان) لە (قتادە)وە ئەگێڕێتەوە کە ئەڵێ ئەنەسی کوڕی مالیک لە پێغەمبەرەوە ﷺ بۆمان ئەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی (من إيمان) لە جیاتی (من خير).

فائیدە لە هێنانی ئەم فەرمودەیە ئەمەیە کە مەبەست بە وتەی (خير) (إيمان)ە، بێگومان ئیمان بەشی تەسدیق و باوەڕەکەی کەم و کوڕی تێدا نابێ، مەگەر بە هۆی بەشی کردەوەکەی، کەواتە حەدیسەکە رێک بوو لەگەڵ بابەکەداو دەلیلە لەسەر رای ئیمامی بوخاری -خوای لێ رازی بێت-

ئینجا لە بارەی ئەو ئایەتەی ﴿اليوم أكملت لكم دينكم﴾ کە هێنای بە بەڵگە لەسەر مەبەستی بابەکە ئەم حەدیسە ئەهێنێ: (عن عمر بن الخطاب: أن رجلا من اليهود قال له) لە عومەری کوڕی خەتتابەوە -خوای لێ رازی بێت- کە پیاوێک لە جوولەکە گوتی بە عومەر: (يا أمير المؤمنين، آية في كتابكم تقرءونها لو علينا معشر اليهود نزلت لاتخذنا ذلك اليوم عيدا) ئایەتێک هەیە لە نامەکەتاندا دەیخوێننەوە ئەگەر ئەو ئایەتە بۆسەر ئێمە بهاتایە ئەو رۆژەمان ئەگێڕا بە جەژن. (قال: أي اية؟) عومەریش فەرموی: کام ئایەت؟ (قال:) پیاوەکەش وتی: ﴿اليوم أكملت لكم دينكم﴾ (قال عمر قد عرفنا ذلك اليوم والمكان الذي نزلت فيه) عومەر فەرموی بەراستی ئەو رۆژە ئەزانین و ئەو شوێنەش کە تیایدا هاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ (وهو قائم بعرفة، يوم جمعة) لە کاتێکدا لە (عەرەفات) بەپێوە وەستابوو لە رۆژی جومعەیەکدا ئامۆژگاری دەکرین. ئیمامی عومەر -خوای لێ رازی بێت- دەست نیشانی کرد بەوەی گێڕاومانە بە جەژن بەوەی ئەو رۆژە رۆژ عەرەفە بوو کەشەوەکەی شەوی جەژنی قوربان بوو، کە گەورەترین جەژنە لە ئیسلامدا.

لێرەدا ئیشارەتی فەرمو، بەلام لە چەند ریوایەتێکی تر بە رێکی فەرموی ئەو رۆژەمان

گیرا به جەژن.

ئینجا ئایا هێنانی ئەم قسەیە چۆن ئەبێ بە بەڵگە لەسەر مەبەستی بابەکە. لەوەڵامدا ئەڵێین: ئەبێ بە بەڵگە لەم بارەوە کە ئەو ئایەتە لە (حجة الوداع)دا هاتە خوارەوەو چەند رۆژێک پاش ئەوە پێغەمبەرﷺ لە دنیا دەرچوو و ئەرکان و شەریعەتی بە تەواوی هاتە خوارەوەو شەریعەتەکە تەواو بوو. (سدی) بە جەزمی ئەفەرموێ: لەپاش ئەو ئایەتە ئیتر هیچ ئایەتێک نەهاتووە لە بارەی حەرام و حەڵاڵەوە.

*** *** ***

## ٣٤ـ بابُ الزَّكَاةِ مِنَ الإسْلاَمِ

وَ قَوْلِهِ: ﴿وَمَا أُمِرُوا إلاَّ لِيَعْبُدُوا اللهَ مُخْلِصِيْنَ لَهُ الدِّيْنَ حُنَفَاءَ وَ يُقِيْمُوا الصَّلاَةَ وَ يُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَ ذَلِكَ دِيْنُ الْقَيِّمَةِ﴾ (البينة: ٥).

٤٦ـ حَدَّثَنَا إسْمَاعِيْلُ قَالَ حَدَّثَنِي مَالِكُ بنُ أنَسٍ عَنْ عَمِّهِ أبِي سُهَيْلِ بنِ مَالِكٍ عَنْ أبِيْهِ أنَّهُ سَمِعَ طَلْحَةَ بنَ عُبَيْدِ اللهِ يَقُولُ: (جَاءَ رَجُلٌ إلَى رَسُولِ اللهِﷺ مِنْ أهْلِ نَجْدٍ ثَائِرَ الرَّأْسِ يُسْمَعُ دَوِيُّ صَوْتِهِ وَلاَ يُفْقَهُ مَا يَقُولُ، حَتَّى دَنَا، فَإذَا هُوَ يَسْألُ عَنِ الإسْلاَمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: خَمْسُ صَلَوَاتٍ فِي الْيَوْمِ وَ اللَّيْلَةِ. فَقَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: لاَ، إلاَّ أنْ تَطَوَّعَ. قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: وَ صِيَامُ رَمَضَانَ. قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهُ؟ قَالَ: لاَ، إلاَّ أنْ تَطَوَّعَ. قَالَ وَ ذَكَرَ لَهُ رَسُولُ اللهِﷺ الزَّكَاةَ، قَالَ: هَلْ عَلَيَّ غَيْرُهَا؟ قَالَ: لاَ، إلاَّ أنْ تَطَوَّعَ. قَالَ فَأدْبَرَ الرَّجُلُ وَهُوَ يَقُولُ: وَاللهِ لاَ أزِيْدُ عَلَى هَذَا وَلاَ أنْقُصُ. قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ أفْلَحَ إنْ صَدَقَ).

ئەمە بابێکە (الزكاة من الإسلام) زەکات بەشێکە لە ئیسلام (و قول الله: ﴿وما أمروا إلا ليعبدوا الله مخلصين له الدين حنفاء و يقيموا الصلاة و يؤتوا الزكاة و ذلك دين القيمة﴾) واتە هەر بەوە فەرمانیان پێ دراوە کە خوا بپەرستن لە کاتێکدا ئایینەکە بۆ پاک و خاوێن کردنە لە هەر شتێ کە شایستە نەبێ بۆی کە لادەرین لە هەموو ئایین و بیروباوەڕێک بێجگە لەئایینە پاکەکەی ئەو، وە فەرمانیان پێ دراوە کە نوێژ بە رێک و راستی بەجێ بهێنن وزەکات بدەن وە ئەوەی کەباس کرا ئەوەیە ئایین و میللەتی دامەزراو لەسەر رێگەی راست.

ئینجا لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە طلحەی کوڕی عبیداللەوە دەڵێ: (جاء رجل إلى رسول اللهﷺ من أهل نجد ثائر الرأس يسمع دوي صوته و لا يفقه ما يقول حتى دنا) پیاوێک هات لە ئەهلی نەجد بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ کە مووی سەری گرژو دانەهێنراو بوو گرمەی دەنگەی ئەبیسترا و حاڵی نەبووین لەوەی چی دەڵێت، لە دوورەوە بەو شێوە بوو هەتانزیک بوویەوە (فإذا هو يسأل عن الإسلام) کە ئەزانین پرسیار ئەکات لە ئیسلام و لە ئەرکان و واجبەکانی (فقال رسول اللهﷺ: خمس صلوات في اليوم و الليلة) پێغەمبەریشﷺ فەرموی: پێنج نوێژ لە هەموو شەوو رۆژێکدا (فقال هل علي غيرها؟) ئینجا کابرا گوتی: بێجگە لەو پێنجە هیچی ترم لەسەرە (فقال لا، إلا أن تطوع) لە وەڵادا فەرموی نەخێر مەگەر بە ئارەزووی خۆت نوێژی زیادە بکەیت، (قال رسول اللهﷺ: وصيام رمضان) پێغەمبەرﷺ فەرموی رۆژووی رەمەزانت لەسەرە (قال هل علي غيره؟) کابرا گوتی: بێجگە لەوە هیچی ترم لەسەرە (قال لا، إلا أن تطوع) پێغەمبەریشﷺ فەرموی: نەخێر، مەگەر خۆت زیادە بکەیت. (طلحە) کە حەدیسەکە ریوایەت ئەکات ئەفەرموێ: (و ذكر له رسول اللهﷺ الزكاة) پێغەمبەرﷺ باسی زەکاتی بۆ کرد (قال هل علي غيرها؟) ئایا بێجگە لەمە هیچی ترم لەسەرە، (قال لا، إلا أن تطوع) پێغەمبەرﷺ فەرموی: نەخێر مەگەر خۆت زیادە بکەیت، (قال فأدبر الرجل وهو يقول: والله لا أزيد على هذا ولا أنقص) ئینجا پیاوەکە هەڵساو رۆیشت لە کاتێکدا ئەیگوت: والله نە زیادی ئەکەم و نە کەم (قال رسول اللهﷺ: أفلح إن صدق) پێغەمبەرﷺ فەرموی ئەو پیاوە رزگاری ئەبێ ئەگەر راست بکات لە بەجێ هێنانی ئەو فەرزانەدا، لێرەدا پرسیار ئەکرێ کە بە تەنیا بەجێ هێنانی فەرزەکان ئەبێ بە ئەهلی فەلاح بەبێ هەموو واجباتی ئیسلام و جڵەوگیریی لێ کراوەکان و هەموو سوننەتەکان؟ لە وەڵامدا ئەڵێین: بوونی ئەهلی فەلاح بە هۆی بەجێ هێنانی ئەو واجباتانەیە لەگەڵ باقی کاروباری شەریعەتی ئیسلامدا کە هاتووە لە حەدیسێکی تردا کە بە لای بوخاری‌یەوە راستەو لەو ریوایەتەدا ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ هەواڵی پێدا بە هەموو کاروبارەکانی شەریعەت. ئینجا پرسیارێکی تر هەیە کە رزگار بوونی کابرا بە هۆی کەم و کوڕی نەکردن لەوەی پرسیاری لێ کرد شتێکی روونە ئەی ئایا زیاد نەکردن چۆن ئەبێ بە هۆی

رزگار بوون؟ ئیمامی نەوەوی لە وەڵامدا ئەفەرموێ: هەڵسانی تەنیا بەو واجباتەی کردووە بە هۆی رزگار بوون ئیتر بێ دەنگە لەوەی هەڵسێ بە زیادەو ئاشکرایە هەستانی بە زیاد تر ئەوە باشتر هۆیە بۆ رزگار بوون. لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە سەفەرو گەران بە شوێنی عیلمدا شتێکی چاکەو هەروەها وەرئەگیرێ کە سوێند خواردن لەسەر شتی شەرعی با دوایش بێ ئەکرێ.

*** *** ***

## ٣٥ـ بابُ اتِّبَاعُ الْجَنَائِزِ مِنَ الإِيْمَانِ

٤٧ـ حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بنُ عَبْدِاللهِ بنِ عَلِيٍّ الْمَنْجُوفِيُّ قَالَ حَدَّثَنَا رَوْحٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ عَنِ الْحَسَنِ وَ مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: (مَنِ اتَّبَعَ جَنَازَةَ مُسْلِمٍ إِيْمَانًا وَ احْتِسَابًا، وَكَانَ مَعَهُ حَتَّى يُصَلَّى عَلَيْهَا وَيُفْرَغَ مِنْ دَفْنِهَا، فَإِنَّهُ يَرْجِعُ مِنَ الأَجْرِ بِقِيرَاطَيْنِ كُلُّ قِرَاطٍ مِثْلُ أُحُدٍ. وَمَنْ صَلَّى عَلَيْهَا ثُمَّ رَجَعَ قَبْلَ أَنْ تُدْفَنَ فَإِنَّهُ يَرْجِعُ بِقِيرَاطٍ).

تَابَعَهُ عُثْمَانُ الْمُؤَذِّنُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَوْفٌ عَنْ مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوَهُ.

ئەمە بابێکە (اتباع الجنائز من الإيمان) شوێن کەوتنی جەنازە بەشێکە لە ئیمان. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (أن رسول اللهﷺ قال: من اتبع جنازة مسلم ایمانا و احتسابا) کە پێغەمبەرﷺ فەرموی: هەرکەس شوێنی مەیتی موسڵمانێک بکەوێ بۆ سەر قەبران لەبەر ئیمان و باوەرو بە نیازی ئەجرو پاداشت لای خوا، نەک لەبەر هەر نیازێکی تر (وکان معه حتی یصلی علیها و یفرغ من دفنها) وە لەگەڵ ئەو جەنازەدا بێت هەتا نوێژی لەسەر ئەکرێ و دەست خاڵی ئەبێ لە شاردنەوەی (فإنه یرجع من الأجر بقیراطین کل قراط مثل أحد) بێگومان ئەو کەسە ئەگەرێتەوە بە دوو قیرات لە ئەجر کە هەرکام لەو دووانە بە قەدە رشاخی ئوحودە (ومن صلی علیها ثم رجع قبل أن تدفن فإنه یرجع بقیراط) وە هەرکەسێ نوێژی لەسەر بکات و ئینجا بگەرێتەوە پێش ئەوەی بشاررێتەوە ئەو کەسە ئەگەرێتەوە بە قیراتێ لە ئەجر. ئەجرو پاداشتیش شتێکی عەقلییەوە لەبەر نزیک خستنەوەی رادەو پلەی ئەو ئەجرو پاداشتە تەشبیهی ئەکات و وێنەی بۆ ئەهێننەوە بە شتێکی قەبارەداری

فورس وەک شاخی ئوحود لێرەدا. لە ئەبوهورەیرەوە لە رێگەیەکی ترەوە وێنەی هاتووە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٣٢٣، ١٣٢٥)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣٦ـ بابُ خَوْفِ الْمُؤْمِنِ مِنْ أَنْ يَحْبَطَ عَمَلُه وَهُوَ لاَ يَشْعُرُ

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ التَّيْمِيُّ: مَا عَرَضْتُ قَوْلِي عَلَى عَمَلِي إِلاَّ خَشِيْتُ أَنْ أَكُونَ مُكَذِّبًا. وَقَالَ ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ: أَدْرَكْتُ ثَلاَثِيْنَ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ كُلُّهُمْ يَخَافُ النِّفَاقَ عَلَى نَفْسِهِ، مَا مِنْ أَحَدٍ يَقُولُ: إِنَّهُ عَلَى إِيْمَانِ جِبْرِيْلَ وَ مِيْكَائِيْلَ.

وَ يُذْكَرُ عَنِ الْحَسَنِ: مَا خَافَهُ إِلاَّ مُؤْمِنٌ، وَلاَ أَمِنَهُ إِلاَّ مُنَافِقٌ. وَمَا يُحْذَرُ مِنَ الإِصْرَارِ عَلَى النِّفَاقِ وَالْعِصْيَانِ مِنْ غَيْرِ تَوْبَةٍ، لِقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ﴾ (آل عمران:١٣٥).

٤٨ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ عَرْعَرَةَ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ زُبَيْدٍ قَالَ: سَأَلْتُ أَبَا وَائِلٍ عَنِ الْمُرْجِئَةِ، فَقَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُاللهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: (سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَ قِتَالُهُ كُفْرٌ).

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٦٠٤٤، ٧٠٧٦)دا دووبارە بووەتەوە.

٤٩ـ أَخْبَرَنَا قُتَيْبَةُ بنُ سَعِيْدٍ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيْلُ بنُ جَعْفَرٍ عَنْ حُمَيْدٍ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَادَةُ بنُ الصَّامِتِ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ يُخْبِرُ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَتَلاَحَى رَجُلاَنِ مِنَ الْمُسْلِمِيْنَ، فَقَالَ: (إِنِّي خَرَجْتُ لأُخْبِرَكُمْ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، وَ إِنَّهُ تَلاَحَى فُلاَنٌ وَفُلاَنٌ فَرُفِعَتْ، وَعَسَى أَنْ يَكُونَ خَيْرًا لَكُمْ، الْتَمِسُوهَا فِي السَّبْعِ وَ التِّسْعِ وَ الْخَمْسِ).

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٠٢٣، ٦٠٤٩)دا دووبارە بووەتەوە.

ئەمە بابێکە هاتووە لە بارەی مەترسی کردن لە بەتاڵ کردنەوەی ئەجر بەهۆی کردەوەی بەدو خراپەوە لەکاتێکدا خاوەن کردەوەکە هەستی پێ ناکات. لێرەدا پرسیارێک هەیە کە ئەوەی ئیمام ئەیفەرمو پشتگیرە بۆ مەزهەبی ئیحباطی‌یەکان کە ئەڵێن: کردەوە چاکەکان بە هۆی کردەوەی بەدو گوناهەوە نامێنن بە تەواوی لەبەر ئەوە گوناهبار بە کافر دائەنێن؟ لە وەڵامدا ئەڵێین وەک ئیمامی ئەوەوی ئەفەرموێ مەبەستی ئیمامی بوخاری ئەوەیە نەهێشتنی سەوابی کردەوەی چاکەیەتی بەس. بۆ نموونە کەسێ سەدەقە بکات ریای تێکەڵ بکات سەوابی

ئەو سەدەقەیە کەم ئەبێتەوە یان هەر نامێنێ نە کردەوە چاکەکانی تر.

ئینجا مەبەست لەم بابە کە ئیمام هێناویەتی لێرەدا بە درۆ خستنەوەی مەزهەبی (مرجئة)کانە کە ئەڵێن ئیمان هەر تەسدیق و باوەڕی دڵەو گوناه هیچ کارێ ناکات. خولاسە ئیمام ئەم بابەی هێناوە بە تایبەت بۆ بەتاڵ کردنەوەی مەزهەبی مورجئە، هەرچەند لەممو پێش لە چەند بابێکدا ئەو مەزهەبەی بەتاڵ کردووەتەوە، بەڵام لەو بابانی ترەدا هەرچۆنێ ئەم مەزهەبەی بەتاڵ ئەکردەوە مەزهەبی ئەهلی بیدعەتی تریشی بەتاڵ کردەوە. ئەم کۆمەڵەیە بەناویانگن و مەزهەبێکی زۆر دوور لە راستیان بووەو ئەڵێن گوناه بە هیچ رەنگ زیان ناگەیەنێ بە ئیماندار.

ئینجا ئیمام رای ئەم دووانەش ئەهێنێ بۆ تایید کردنی مەبەستی بابەکە: یەکەم: ئیبراهیم تەیمی کە لە ناو عابیدە بەرزەکانی تابیعیەیە. دووەم ئیبن و ئەبی مولکە... یەکەم ئەفەرموێ: (ما عرضت قولي على عملي إلا خشيت أن أكون مكذبا) واتە قسەو وتەی خۆم بەراود نەکردووە لەگەڵ کردەوەم ئەگەر دژو پێچەوانە بوو لەگەڵ گوتنم پێم بڵێ ئەگەر راستت بکردایە ئەو کارەت نەئەکرد کە دژی گوتنەکەتە. وە ئەوەشی ئەگوت لەبەر ئەوەی کە واعیز بوو، واتە لەگەڵ ئەوە کە ئامۆژگاری ئەکردو فەرمانی بە چاکە ئەداو جڵەوگیریی ئەکرد لە خراپە ئەترسا بەری ئەو کەسانە بکەوێ کە خوا زەمیان ئەکات بە ﴿أتأمرون الناس بالبر و تنسون أنفسكم﴾ وە بە ﴿لم تقولون مالا تفعلون﴾ (و قال ابن أبي مليكة) ئەم زاتە ئەیفەرموو: (أدركت ثلاثين من أصحاب النبيﷺ) گەیشتووم بە سی کەس لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ (كلهم يخاف على نفسه) هەرکام لەوانە مەترسی ئەکرد لە نیفاق، واتە نیفاق لە کردەوەدا کە خالس نەبێ و نیازی غەیری خوای تێدا بێ نەک مەبەست نیفاق لە ئیمان و باوەڕا، ئەو هاوەڵانەی کە ئەفەرموێ بە خزمەتیان گەیشتووم دایکی ئیمانداران عائشە و خوشکی ئەسماء و أم سلمة والعبادلة الأربعة و أبو هريرة و عقبة بن الحارث والمسور بن مخرمة. ئەمانە لە خۆیانی بیستووە، کۆمەڵێ لە یارە زۆر گەورەکان کە بە تەمەن گەیشتووە پێیان وەک عەلی کوڕی ئەبو تالیب و سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص و ئەوانە مەترسیان ئەکرد لە نیفاق لە کردەوەدا وە لەو مەترسیەوە لازم ناکات کە خوا نەخواستە ئەوەیان بووبێ، بەڵکو ئەوە نیشانەی ئەوپەڕی راستی و وەرعیان بووە -خوا لێیان رازی بێ- وەک

ئەفەرمویٚ: (ما منهم أحد يقول إنه على إيمان جبريل و ميكائيل) هیچ کام لەوانە نەیانگوتووە کە وەک جوبرەئیل و میکائیل وابوو وە لەوانە نەبوو وەک ئەوان بووبێ.

لەم فەرمودەوە دەرئەکەوێ ئەو زاتانە لەسەر ئەوەن کە ئیمان قابیلی زیادو کەمە. کەواتە مورجئە هەڵەن کە لایان وایە ئیمانی هیچ کەس زیاتر بەهێزتر نی‌یە لە هیچ کەسێکی تر (و يذكر عن الحسن) لە حەسەنەوە ئەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (ما خافه إلا مؤمن و لا أمنه إلا منافق) لە خواناترسێ بێجگە لە ئیمانداری راستەقینە، وە هیچ کەس لێی بێ باک نی‌یە بێجگە لە ناپاک و موناڤیق (وما يحذر من الإصرار على النفاق والعصيان من غير توبة) ئەمە بابی ترساندنە لە بەردەوامی لەسەر ناپاکی و گوناه بەبێ گەڕانەوەو تۆبە کردن (لقوله تعالى: ﴿ولم يصروا على ما فعلوا وهم يعلمون﴾) خوای میهرەبان مەدحی ئەو کەسانە دەکات کە تۆبە ئەکەن لە گوناهو بەردەوام نابن لەسەر گوناه کردن و لەویشەوە وەرئەگیرێ زەمی ئەوانە کە بەردەوامن و تۆبە ناکەن، کەواتە مورجئە هەڵەن و مەزەبەکەیان بەتاڵە کە ئەڵێن لەگەڵ بوونی ئیماندا گوناه زیانی نی‌یە. ئینجا ئەم ئەسەرە ئەهێنێ لە ئەبو وائلەوە لە زەیدەوە کە ئەفەرموێ: پرسیارم کرد لە ئەبو وائیل لەبارەی مورجئەوە ئەویش فەرمووی: عبدالله بۆی گێڕامەوە کە: (سباب المسلم فسوق و قتاله كفر) جوێن دان بە موسڵمان فیسق و فجورە وە جەنگ لەگەڵ کردنی کوفرە،کەواتە قسەی مورجئە بە درۆ دەرچوو کە ئەڵێن: خاوەنی گوناهی گەورە فاسق نی‌یە. لێرەدا پرسیار هەیە کە ئەم حەدیسە وا نیشان ئەدات مەزهەبی خەواریج راستە کە ئەڵێن خاوەنی گوناهە گەورەکان کافرن. لە وەڵامدا ئەڵێین: مەبەست کوفری راستەقینە نی‌یە کە دەرچوونە لە ئیسلام بەڵکو مەبەست ترساندن و زیادە موبالەغەیە لەوتاوانەدا بە قەرینە چەند ئەسڵ و قاعیدەیەک لە ئیسلامدا هەیە بەڵگەیە لەسەر کافر نەبوون بە گوناه.

لەم حەدیسەدا بە گەورەگرتنی رێزو مافی موسڵمان هەیەو بڕیاردانی فیسق بەسەرکەسێ کە جوێن ئەدا بە موسڵمان. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە ئەویش لە عیبادەی کوڕی صامیتەوە کە (أن رسول الله ﷺ خرج يخبر بليلة القدر) پێغەمبەر لە ماڵەوە دەرچوو کە هەواڵ بدا بە دیاری کردنی شەوی (ليلة القدر) (فتلاحى رجلان من المسلمين) ئینجا لەو کاتەدا دوو نەفەر لە موسڵمانان ئاژاوەیان دەکرد (فقال إني خرجت

لأخبركم بليلة القدر فتلاحى فلان و فلان) ئينجافەرموی بۆ ئەوە هاتم شەوی (ليلة القدر)تان بۆ دیاری بکەم (فرفعت) واتە بە هۆی ئەوە لە بیرم نەما (وعسى أني يكون خير لكم) ئومێدم وایە ئەو لە بیر چوونە چاکتر بێت بۆتان (التمسوها في السبع و التسع والخمس) بە دوایدا بگەڕێن (٢٥ و ٢٧ و ٢٩) واتە بە دوایدا بگەڕێن لە شەوی بیست و حەوت و بیست و نۆ و بیست و پێنج) بێگومان ئەگەر شەوەکە دیاریی بوایە هەر لەو شەوەدا هەوڵ ئەدرا، بەڵام کە دیاریی نەبوو چەند شەو تێکۆشان ئەکرێ ئەجرەکە زۆرترە، کەواتە ئەمە خێرو باشترە. پەیوەندی ئەم حەدیسە بە بابەکەوە لەم بارەیەوە کە ئەو دوو کەسە دەنگیان بەرزکردووەتەوە لە خزمەت پێغەمبەرداﷺ، وە قورئانیش ئەفەرموێ: ﴿لا ترفعوا أصواتكم فوق صوت النبي ولا تجهروا له بالقول كجهر بعضكم لبعض أن تحبط أعمالكم و أنتم لا تشعرون﴾.

***　　***　　***

٣٧ـ بابُ سُؤَالُ جِبْرِيلَ النَّبِيَّ ﷺ عَنِ الإِيْمَانِ، وَالإِسْلَامِ، وَالإِحْسَانِ، وَعِلْمِ السَّاعَةِ وَبَيَانِ النَّبِيِّ ﷺ لَهُ. ثُمَّ قَالَ: جَاءَ جِبْرِيلُ ﷺ يُعَلِّمُكُمْ دِيْنَكُمْ، فَجَعَلَ ذَلِكَ كُلَّهُ دِيْنًا. وَمَا بَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ لِوَفْدِ عَبْدِالْقَيْسِ مِنَ الإِيْمَانِ. وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلَامِ دِيْنًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ﴾ (آل عمران: ٨٥)

٥٠ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيْلُ بْنُ إِبْرَاهِيْمَ أَخْبَرَنَا أَبُو حَيَّانَ التَّيْمِيُّ عَنْ أَبِي زُرْعَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ بَارِزًا يَوْمًا لِلنَّاسِ، فَأَتَاهُ رَجُلٌ فَقَالَ: مَا الإِيْمَانُ؟ قَالَ: الإِيْمَانُ أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَبِلِقَائِهِ، وَرُسُلِهِ، وَتُؤْمِنَ بِالْبَعْثِ. قَالَ: مَا الإِسْلَامُ؟ قَالَ: الإِسْلَامُ أَنْ تَعْبُدَ اللهَ وَلَا تُشْرِكَ بِهِ، وَ تُقِيْمَ الصَّلَاةَ، وَتُؤَدِّيَ الزَّكَاةَ الْمَفْرُوضَةَ، وَ تَصُومَ رَمَضَانَ. قَالَ: مَا الإِحْسَانُ؟ قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ. قَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ قَالَ: مَا الْمَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنَ السَّائِلِ: وَ سَأُخْبِرُكَ عَنْ أَشْرَاطِهَا: إِذَا وَلَدَتِ الأَمَةُ رَبَّهَا، وَإِذَا تَطَاوَلَ رُعَاةُ الإِبِلِ الْبُهْمِ فِي الْبُنْيَانِ، فِي خَمْسٍ لَا يَعْلَمُهُنَّ إِلَّا اللهُ. ثُمَّ تَلَا النَّبِيُّ ﷺ: ﴿إِنَّ اللهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ﴾ (لقمان: ٣٤). ثُمَّ أَدْبَرَ.

فَقَالَ رُدّوهُ. فَلَمْ يَرَوا شَيْئاً. فَقَالَ: هَذَا جِبْرِيلُ جَاءَ يُعَلِّمُ النَّاسَ دِينَهُم.

قَالَ أَبُو عَبْدِاللهِ: جَعَلَ ذَلِكَ كُلَّهُ مِنَ الإِيْمَانِ.

ئەمە بابی پرسیاری جوبرەئیلە لە پێغەمبەرﷺ لە بارەی ئیمان و ئیسلام و ئیحسان و زانینی کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی (و بیان النبيﷺ) وە باسی وەڵام دانەوەی پێغەمبەرەﷺ لە پرسیارەکانی جوبرەئیل (ثم قال: جاء جبريل & يعلمكم دينكم فجعل، ذلك كله دينا) ئینجا فەرموی: جوبرەئیل هات دینەکەتانی نیشاندان و فێری کردن. ئینجا ئەوەی هەمووی گێڕاوە بە دین. کە هێندێ لەوانە باوەڕە بە بەدی هاتنی ڕۆژی دوایی و نەزانینی کاتەکەی بۆ هیچ کەس بێجگە لە خوا، کە ئەوەش بەشێکە لە دین و ئەوەیە مەبەست بە بەیانەکەی پێغەمبەرﷺ (وما بين النبيﷺ لوفد عبدالقيس من الإيمان) واتە ئەمە بابی پرسیاری جوبرەئیلە لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ باسی کرد بۆ وەفدی عبدالقیس کە ئیمان هەر ئیسلامە، وە هەروەها بابی ئەم ئایەتەیە: ﴿ومن يبتغ غير الإسلام دينا فلن يقبل منه﴾ کە ئەم ئایەتەش ئیسلامی کردووە بە دین. بە کورتی مەبەستی ئیمامی بوخاری ئەوەیە کە ئیمان و ئیسلام یەک شتن و جیا نین لە یەک. بێگومان هەرکام لە ئیمان و ئیسلام مانایەکیان هەیە لە زمانی عەرەبدا، هەروەها مانایەکی شەرعیشیان هەیە، وە هەرکام لازمە بۆ ئەوی تر و بە بێ یەکتری بەدی نایەن. واتە لە شەرعدا ناگونجێ بڵێین فلان مؤمنەو موسلیم نی یە، یان موسلیمەو مؤمن نی یە.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە ئەفەرموێ: (كان النبيﷺ بارزا يوما للناس، فأتاه جبريل فقال:) ڕۆژێک پێغەمبەرﷺ بە ئاشکرا لەناو خەڵکیدا بوو خۆی دەرخست کە جوبرەئیل هاتە خزمەتی وتی: (ما الإيمان؟) ئینجا پرسیاری لێ کردو گوتی ئیمان چی یە؟ (قال: الإيمان أن تؤمن بالله وملائكته ، و كتبه، ورسله، وتؤمن بالبعث.) ئیمان ئەوەیە: باوەڕت ببێ بە خواو بە مەلائیکەتەکەی و بە دیتنی خوا لە ڕۆژی دواییداو بە پێغەمبەرەکانی و باوەڕ بێنی بە زیندوو بوونەوە. دواخستنی پێغەمبەران لەبەر ئەوەیە مەلائیکە لە پێش ئەماندا دروست کراوە نەک لەبەر ئەوەیە کە ئەوان گەورەتر بن. مەبەست بە دیتنی خوا باوەڕ کردنەوە بەوەی دیتنی خوا بەدی دێت، ئیتر با تایبەتی بێت بەباوەڕدارانەوە.

وە باوەڕت ببێ بە زیندوو بوونەوە. (قال: ما الإسلام؟) جوبرەئیل پرسیارێکی تری کردو گوتی: ئیسلام چی‌یە؟ (قال: أن تعبد الله ولا تشرك به، وتقيم الصلاة، وتؤدي الزكاة المفروضة، وتصوم رمضان) پێغەمبەریش ﷺ لە وەڵامدا فەرموی: ئەمەیە خوا بپەرستی و هیچ شتێک نەکەیت بە هاوبەشی و نوێژ بە رێک و راستی بەجێ بهێنی، وە زەکاتە فەرزەکان بدەیت، وە رۆژووی رەمەزان بگریت. (قال: ما الإحسان؟) پرسیارێکی تری کردو گوتی: ئیحسان چی‌یە؟ (قال: أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تراه فإنه يراك) لە وەڵامدا فەرمووی: ئیحسان ئەمەیە کە خوا بپەرستی بە جۆرێک وەک بە چاو بیبینی،واتە بەوپەڕی شەرم و شکۆو سام وهەیبەتەوە، چونکە ئەگەر تۆ ئەو نابینی بێگومان ئەو تۆ ئەبینێ. (قال: متى الساعة؟) پرسی کەی رۆژی دوایی ئەبێ و بەدی دێت؟ (قال: ما المسئول عنها بأعلم من السائل) لە وەڵامدا وتی: پرسیار لێ کراو زاناتر نی‌یە لە پرسیارکەر. واتە هەروەک یەک نازانین و زانینی کاتی هاتنی تایبەتی‌یە بە خواوە (سأخبرك عن أشراطها) فەرموی هەواڵت پێ ئەدەم لە نیشانەکانی. قورتوبی فەرموی نیشانەکانی دوو جۆرن: بەشێکیان عادەتین و بەشێکیان غەیرە عادەتین، وەک هەڵهاتنی خۆر لە مە غریبەوەو دەرچوونی دابة الأرض لێرەدا مەبەست عادەتی‌یەکانە کە دەرئەکەوێ ئەوەیە کە ئەفەرموێ: (إذا ولدت الأمة ربها) کاتێ کە جاری‌یە خاوەنەکەی خۆی لێ پەیدا ببێ. ئەم رستەیە بە چەند جۆرێ تەفسیر کراوەتەوەو ئەگەڕێتەوە بۆ سێ مەبەست:

١) مەبەست فراوان بوونی خاکی ئیسلامەو داگیر کردنی وڵاتی کوفرو گیرانی ئەولادیان بە جاریەو عەبد، ئینجا کاتێ کە خاوەن جاری‌یەکە چووە لای بە نیازی ئەوەی ئەولادی لێ پەیدا ببێ ئەو منداڵە وەک خاوەن بێ بۆ دایکەکەی، چونکە ئەولادی خاوەن و سەیدەکەیەتی.

٢) مەبەست ئەوەیە نافرەتی غەیرە عەرەبی لێ پەیدا ببێ. بەم جۆرە پادشاکان جاری‌یە بخوازن، ئەو کاتە ئەولادەکان ئەبن بە خاوەنی دایکەکانیان.

٣) مەبەست زۆربوونی خراپی ئەولادە لەگەڵ دایکیدا بە نازاردان و جوێن. وەک ئەولادەکان خاوەن و گەورە بن و دایکەکان کارەکەرو ژێر دەستە بن.

(و إذا تطاول رعاة الإبل البهم في البنيان) کاتێ شوانی حوشترە بێ نیشانەکان درێژە

بدەن بە کۆشک و بینای زۆر، واتە لادێی و کۆچەرو ژێر دەستەکان زاڵ بوون و بوون بە کاربەدەست (في خمس لا يعلمهن إلا الله) واتە زانینی کاتی هاتنی رۆژی دوایی لەو پێنج شتەیە کە بێجگە لە خوا کەس نایزانێ (ثم تلى النبي ﷺ : ﴿إن الله عنده علم الساعة ...﴾ ئینجا پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە (ثم أدبر. فقال: ردوه. فلم يروا شيئا) ئینجا ئەو پرسیار کەرە پشتی هەڵکردو رۆیشت، ئینجا فەرمووی بیگێرنەوە، ئەوانیش هیچ شتێکیان نەبینی (فقال: هذا جبريل جاء يعلم الناس دينهم) ئینجا فەرموی: ئەمە جوبرەئیل بوو هات خەڵکی زانا کرد بە ئایینەکەیان. (قال: أبو عبدالله: جعل ذلك كله من الإيمان) ئەبوعبداللەی بوخاری فەرموی، واتە من کە دانەری ئەم کتێبەم ئەڵێم ئەمەی کە لەم حەدیسەدا باس کرا گێراویەتی بە بەشێ لە ئیمانی کامڵ. واتە بەبێ ئەو کردەوە چاکانە ئیمان تەواو نابێت،لەم حەدیسەدا چەند شتێ وەرئەگیرێ:

گەورەیی و گرنگی موراقەبە لە ئیسلامدا. هەروەها هەرکەسێ پرسیارێکی لێ کرا ئەگەر وەڵامی نەزانی ئەبێ بڵێ نازانم. هەروەها ئەمەش وەرئەگیرێ کە مەلائیکە خۆیان ئەبەنە شێوەی ئینسان و غەیری شێوە ئەسڵی‌یەکەی خۆیان وەک لە حەدیس یان ئەثەردا هاتووە: (الملائكة أجسام نورانية تشكل بأشكال مختلفة سوى الكلب و الخنزير). ئەم حەدیسە زۆر گەورەو بەنرخە. رەحمەتی خوا لە قورتوبی کە ئەفەرموێ: ئەم حەدیسە شایانە بەوەی ناوببرێ (أم السنة). چەند جارێکی تر گوتمان ئیمامی بوخاری بۆ هەر باب و بەشێک هەرچەند حەدیسی دەست کەوتبێ هێناویەتی لەبەر بەهێزکردنی باب و مەبەستەکە، وە لەبەرئەوەی راگەیاندن و بڵاو کردنەوەی حەدیس پێویستی سەرشانی زانایانی ئیسلامە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی (٤٧٧٧)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣٨ـ باب

٥١ـ حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بنُ حَمْزَةَ قَالَ حَدَّثَنَا إِبرَاهِيمُ بنُ سَعْدٍ عَنْ صَالِحٍ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِ اللهِ أَنَّ عَبْدَاللهِ بنَ عَبَّاسٍ أَخبَرَهُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو سُفْيَانَ أَنَّ هِرَقْلَ قَالَ لَهُ: سَأَلْتُكَ هلْ يَزِيْدُونَ أَمْ يَنْقُصُونَ فَزَعَمْتَ أَنَّهُمْ يَزِيْدُونَ، وَ كَذَلِكَ الإِيْمَانُ حَتَّى يَتِمَّ. وَسَأَلْتُكَ هَلْ

يَرْتَدَّ أَحَدٌ سَخْطَةً لِدِيْنِهِ بَعْدَ أَنْ يَدْخُلَ فِيهِ؟ فَزَعَمْتَ أَنْ لاَ، وَكَذَلِكَ الإِيْمَانُ حَتَّى تُخَالِطَ بَشَاشَتُهُ الْقُلُوبَ لاَ يَسْخَطُهُ أَحَدٌ.

ئەمە بابێکە وەک بابەکانی پێشوو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کردەوە بەشێکە لە ئیمانی تەواو. لە هەندێ ریوایەتدا وتەی باب نی‌یە بەوجۆرەش هەر ئەگونجێ. وە بۆ ئەم بابە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن و عەباسەوە -خوا لێیان رازی بێت- (قال: أخبرني أبو سفيان: أن هرقل: قال له:) ئەفەرموێ ئەبو سوفیان هەواڵی پێدام کە هیرەقل چەند پرسیاری لێ کردین لە بارەی پێغەمبەرەوەﷺ یەکێ لە پرسیارەکان ئەمە بوو: (سألتك هل يزيدون أم ينقصون فزعمت أنه يزيدون) ئایا شوێن کەوتووەکانی زیاد ئەکەن یان کەم ئەبنەوە. ئەویش وەڵامی دایەوە کە زیاد ئەکەن.هیرەقیلیش وتبوی: (وكذلك الإيمان حتى يتم) کاری ئیمان بەو جۆرەیە هەتا تەواو ئەبێ و ئەگاتە پایان. وە پرسیارێکی تری ئەمە بوو: (و سألتك هل يرتد أحد سخطة لدينه بعد أن يدخل فيه؟ فزعمت أن لا) ئایا هیچ کەس هەڵئەگەڕێتەوە لەبەر ناڕەزایی لە دینەکەی، ئەمیش وەڵامی دابوویەوە: نەخێر. (و كذلك الإيمان حين تخالط بشاشته القلوب لا يسخطه أحد) هیرەقلیش گوتبوی بە ئەبو سوفیان: ئیمان کاتێ تەواو بوو لەبەرەوە پەرە ئەسێنێ، وە نووری ئیمان هەرکاتێ تێکەڵی دڵ بوو پەشیمان بوونەوەی نابێ. هیرەقل ئەمانەی کرد بەبەڵگە لەسەر پێغەمبەرێتی پێغەمبەری ئازیزﷺ.

ئینجا لێرەدا قسەیەک هەیە کە چۆن قسەی هیرەقل ئەبێ بە بەڵگە؟ لەوەڵامدا ئەڵێین یەکێ بووە لە زاناکانی ئەهلی کیتاب، کەواتە لە نامەی پێغەمبەران وەری گرتووە، وە پەیوەندیشی ئەمەیە کە ئایینی گێڕاوە بە ئیمان.

ئەم حەدیسە لە ژمارە (٧)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣٩ـ بَابُ فَضْلِ مَنِ اسْتَبْرَأَ لِدِيْنِهِ

٥٢ـ حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ عَنْ عَامِرٍ قَالَ سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بنَ بَشِيرٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: (الْحَلاَلُ بَيِّنٌ، وَالْحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشَبَّهَاتٌ لاَ يَعْلَمُهَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ. فَمَنِ اتَّقَى الْمُشَبَّهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِيْنِهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ كَرَاعٍ

يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ. أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلاَ إِنَّ حِمَى اللهِ فِي أَرْضِهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ».

ئەمە بابێکە سەبارەت بە کەسێ کە ئاینەکەی بە پاک وخاوێن بگرێ. بێگومان ئەوەش بەشێکە لە ئیمانی تەواو، لەو بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە نوعمانی کوڕی بەشیرەوە کە ئەفەرموێ: (سمعت رسول الله ﷺ يقول: الحلال بين، والحرام بين) بیستم لە پێغەمبەری خواﷺ ئەیفەرمو: ئەوەی حەڵاڵە ئاشکرایە، وە ئەوەی حەرامە ئاشکرایە. (و بينهما مشبهات لا يعلمها كثير من الناس) لە نێوان ئەو دووانەدا چەند شتێک هەیە روون نین و ئەشوبهێن بەوان. واتە هەڵئەگرێ حەرام بن یان حەڵاڵ بن و بەڵگەیەکی تەواو نییە لەسەر بارێکیان. (فمن اتقى المشبهات استبرأ لدينه وعرضه) واتە هەرکەسێ خۆی بپارێزێ لەو گومان لێ کراوانە ئەو کەسە دین و ناموسی خۆی پاراستووە لە عەیب و لەکەو ئەیەوێ دینەکەی بە پاک وخاوێن راگرێ و خۆیشی ئەکات بە جێگەی تانەو تەشەر. ﴿ومن وقع في الشبهات كراع يرعى حول الحمى يوشك أن يوقعه) هەرکەس بکەوێتە ناو ئەو گومان لێ کراوانەوە وەک شوانێکە کە لە دەوری قەدەغەیەکدا ماڵاتەکەی بلەوەڕێنێ کە نزیکە بکەوێتە ناویەوە (ألا و إن لكل ملك حمى، ألا و إن حمى الله في أرضه محارمه) بێدارینەوە کە هەر پادشایەک قەدەغەی خۆی هەیە وە بێدار بن کە قەدەغەی خوا حەرامەکانیەتی (إلا و إن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله و إذا فسدت فسد الجسد كله ألا وهي القلب) لەناو لەشدا پارچە گۆشتێک هەیە ئەگەر چاک بێت هەموو لەش چاک دەبێت وە ئەگەر خراپ بوو هەموو لەش خراپ دەبێت وە ئەو پارچە گۆشتەش دڵە.

ئەم حەدیسە لە ژمارە (٢٠٥١)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٤٠ـ بَابُ أَدَاءِ الْخُمُسِ مِنَ الإِيمَانِ

٥٣ـ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ الْجَعْدِ قَالَ أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ: كُنْتُ أَقْعُدُ مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ يُجْلِسُنِي عَلَى سَرِيرِهِ، فَقَالَ: أَقِمْ عِنْدِي حَتَّى أَجْعَلَ لَكَ سَهْمًا مِنْ مَالِي. فَأَقَمْتُ مَعَهُ

شَهْرَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: إِنَّ وَفْدَ عَبْدِالْقَيْسِ لَمَّا أَتَوا النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنِ الْقَوْمُ -أَوْ مَنِ الْوَفْدُ؟- قَالُوا: رَبِيْعَةُ. قَالَ: مَرْحَبًا بِالْقَوْمِ -أَوْ بِالْوَفْدِ- غَيْرَ خَزَايَا وَلاَ نَدَامَى. فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّا لاَ نَسْتَطِيْعُ أَنْ نَأْتِيَكَ إِلاَّ فِي الشَّهْرِ الْحَرَامِ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هَذَا الْحَيُّ مِنْ كُفَّارِ مُضَرَ، فَمُرْنَا بِأَمْرٍ فَصْلٍ نُخْبِرُ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا، وَنَدْخُلُ بِهِ الْجَنَّةَ وَسَأَلُوهُ عَنِ الأَشْرِبَةِ. فَأَمَرَهُمْ بِأَرْبَعٍ وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ:

أَمَرَهُمْ بِالإِيْمَانِ بِاللهِ وَحْدَهُ، قَالَ: أَتَدْرُونَ مَا الإِيْمَانُ بِاللهِ وَحْدَهُ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: شَهَادَةُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامُ الصَّلاَةِ، وَإِيْتَاءُ الزَّكَاةِ، وَصِيَامُ رَمَضَانَ، وَأَنْ تُعْطُوا مِنَ الْمَغْنَمِ الْخُمُسَ.

وَنَهَاهُمْ عَنْ أَرْبَعٍ: عَنِ الْحَنْتَمِ، وَالدُّبَّاءِ، وَالنَّقِيْرِ، وَالْمُزَفَّتِ -وَرُبَّمَا قَالَ: الْمُقَيَّرُ- وَقَالَ: احْفَظُوهُنَّ، وَأَخْبِرُوا بِهِنَّ مَنْ وَرَاءَكُمْ.

ئەمە بابێکە لە بارەی بەجێ هێنان و تەسلیم کردنی پێنج یەکی غەنیمەت بە بیت المال بەشێکە لە ئیمان، واتە ئیمانی تەواو. وە لەم بارەوە حەدیس ئەهێنێ لە ئەبو جەعدەوە کە (قال: کنت أقعد مع ابن عباس یجلسني علی سریره) جارێ دانیشتبووم لەگەڵ ئیبن عەباس لە کاتێکدا دای نیشاند بووم لەسەر کورسییەکەی خۆی (فقال: أقم عندي حتی اجعل لك سهما من مالي) ئینجا فەرمووی پێم: بمێنەوە لام هەتا بەشێ لە ماڵی خۆمت پێ ئەدەم (فأقمت معه شهرین) منیش مامەوە لەگەڵی دوو مانگ (ثم قال: إن وفد عبدالقیس لما أتوا النبي ﷺ) وەفدی بەنی عبدالقیس کاتێ هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی (من القوم-أو الوفد-؟) فەرمووی ئێوە لە چ قەومێکن، یان فەرمووی ئێوە چ وەفدێکن و وەفدی چ هۆزو تائیفەیەکن؟ (قالوا: ربیعة) گوتیان: رەبیعە) ئەویش: (قال: مرحبا بالقوم -أو بالوفد-) فەرمووی: مەرحەبا لەو قەومە یان لەو وەفدە -واتە بەخێر بێن لە کاتێکدا ڕێز گیراون و خۆشحاڵ ئەبێن بە هاتنەکەتان. (فقالوا: یا رسول الله، إنا لا نستطیع أن نأتیك إلا في الشهر الحرام) ئینجا گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا: ئێمە ناتوانین بێین بۆ خزمەتت مەگەر لەو چوار مانگەدا کە جەنگ تیایاندا قەدەغەیە (و بیننا و بینك هذا الحي من کفار مضر)

لە کاتێکدا لە نێوان ئێمەو تۆدا ئەم خێڵە هەیە لە کافرەکانی تائیفەی مضر (فمرنا بأمر فصل نخبر به من وراءنا وندخل به الجنة) کەواتە فەرمانمان پێ بدە بە کارێکی روون کە هەق و ناهەقمان بۆ جیا بکاتەوەو ئەو فەرمانە راگەیەنین بە خەڵکی ناوچەکەمان و پێی بچینە بەهەشت. (و سألوه عن الأشربة) پرسیاریان لێ کرد لە شەرابەکان کامی حەڵاڵەو کامی حەرامە (فأمرهم بأربع و نهاهم عن أربع) ئەویش فەرمانی پێدان لە خواردنەوەی چوارو جڵەوگیریی لێ کردن لە چوار (أمرهم بالإيمان بالله وحده) ئەویش فەرمانی پێدان بە باوەڕ بە خوا بە تاک و تەنیا، (فقال: أتدرون ما الإيمان بالله وحده؟) ئینجا ئایا دەزانن باوەڕ هێنان بە خوا بە تەنیا چییە؟ (قالوا: الله و رسوله أعلم) ئەوانیش وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی باش ئەزانن چییە. (قال: شهادة أن لاإله إلا الله وأن محمدا رسول الله، و إقام الصلاة، و إيتاء الزكاة، وصيام رمضان، و أن تعطوا من المغنم الخمس) واتە: شایەتومانەو بەجێ هێنانی نوێژ بە رێکی و زەکات دانەو رۆژووی رەمەزانەو ئەبێ پێنج یەکی غەنیمەت بدەن. (ونهاهم عن أربع:) وە جڵەوگیریی کردن لە چوار شت: (عن الحنتم) لە خواردنی ئەبیز (سرکە) لە گۆزەڵەیەکی دیاریی کراودا کە باوو بووە لایان و ناسراو بووە لایان (و الدباء) وە لە کولەکەدا (و النقير) وە ئەبیز خواردنەوە لەوەدا هەڵی ئەکۆڵن لە بێخی دارخورماو (و المزفت) لەو قاپ و قاچاخەی کە بە قیرو زەفت ئەیهەنوون. لەناو ئەوانەدا باو بووەو ئەبیزیان لەناو ئەو شتانەدا ئەگرتەوەو ئەیان خوارد. وا دەرئەکەوێ ئەو ئەبیزەی کە لەناو ئەوانەدا پەروەردە ئەکرا خەڵکی پێ سەرخۆش ئەبوو وەک عارەق کە خەڵکی پێ مەست و سەرخۆش ئەبوو، وە هەرشتێ خەڵکی سەرخۆش بکات حوکمی عارەقی هەیە (قال: احفظوهن، و أخبروا بهن من وراءكم) فەرمووی ئەوانەی کە فەرمانم پێدان لەبەری بکەن و رایگەیەنن بە دوای خۆتان.

هەرکەس ئەیەوێ بە درێژی حاڵی بێ لەو شتانەی کە قەدەغە کراوە ئەبیزیان تێدا پەروەردە بکرێت، با تەماشای (فتح الباري) بکات لەبەر درێژە نەدان ئەوانەم نەهێنا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٨٧، ٥٢٣، ١٣٩٨، ٣٠٩٥، ٣٥١٠، ٤٣٦٨، ٤٣٦٩، ٦١٧٦، ٧٢٦٦، ٧٥٥٦)دا دووبارە بووەتەوە.

٤١ـ بابٌ مَا جَاءَ: إنَّ الأعْمَالَ بالنِّيَّةِ وَالْحِسْبَةِ، وَلِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى

فَدَخَلَ فِيهِ الإيْمَانُ وَالْوُضُوءُ وَالصَّلاَةُ وَالزَّكَاةُ وَالْحجُّ وَالصَّوْمُ وَالأحْكَامُ. وَقَالَ اللهُ تَعَالَى: ﴿قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَى شَاكِلَتِهِ﴾ (الإسراء: ٨٤) عَلَى نِيَّتِهِ. وَ نَفَقَةُ الرَّجُلِ عَلَى أَهْلِهِ -يَحْتَسِبُهَا- صَدَقَةٌ.

وَقَالَ: وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ.

٥٤ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بن مَسْلَمَةَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ يَحْيَى بنِ سَعِيدٍ عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ ابْرَاهِيمَ عَنْ عَلْقَمَةَ بنِ وَقَّاصٍ عَنْ عُمَرَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: (الأعْمَالُ بالنِّيَّةِ، وَلِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَ هِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ).

ئەم حەدیسە لە ژمارە (١)دا دووبارە بووەتەوە.

٥٥ـ حَدَّثَنَا حَجَّاجُ بنُ مِنْهَالٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ أَخْبَرَنِي عَدِيُّ بنُ ثَابِتٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَاللهِ بنِ يَزِيدَ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (إِذَا أَنْفَقَ الرَّجُلُ عَلَى أَهْلِهِ يَحْتَسِبُهَا فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ).

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٠٠٦، ٥٣٥١)دا دووبارە بووەتەوە.

٥٦ـ حَدَّثَنَا الْحَكَمُ بنُ نَافِعٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: حَدَّثَنِي عَامِرُ ابْنُ سَعْدٍ عَنْ سَعْدِ بنِ أَبِي وَقَّاصٍ أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: (إِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللهِ إِلاَّ أُجِرْتَ عَلَيْهَا، حَتَّى مَا تَجْعَلُ فِي فِي امْرَأَتِكَ).

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٢٩٥، ٢٧٤٢، ٢٧٤٤، ٢٩٣٦، ٤٤٠٩، ٥٣٥٤، ٥٦٥٩، ٥٦٦٨، ٦٣٧٣، ٦٧٣٣)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب / ما جاء : أن الأعمال بالنية و الحسبة) ئەمە بابێکە لە بارەی ئەوەی کە کردەوە شەرعیەکان بە پێی نیازو نیەتەکانەو بە پێی ئیخلاص و راستیە. وەک ئەفەرموێ: (لکل امرئ مانوى) بۆ هەرکەس هەر ئەوەی بۆ هەیە کە نیازی کردووە (فیدخل فیه الإيمان و الوضوء و الصلاة والزكاة والصوم والحج والأحكام) ئیمامی بوخاری

نەفەرموێ: کەواتە لەو کردەوە شەرعی‌یانەیە ئیمان و دەست نوێژو نوێژو زەکات و حەج و ڕۆژو و هەموو مامەڵەو کڕین و فرۆشتن و نیکاح و ئیقرارو شتەکانی تریش کە بە درێژیی باس کراون لە کتێبەکانی زاناکانی ئیسلامدا. ئیبن المنیر پاسایەکی داناوە بۆ ئەوانەی پێویستیان هەیە بە نیەت و ئەوانەی پێویستیان نی‌یە، بە شێوەیەک هەر کردەوەیەک وەک مەبەست پێ‌ی پاداشت و سەواب بێت پێویستە بە نیەت و هەر کردەوەیەک وا نەبێ نیەتی ناوێ، هەروەها ئەو کارو کردەوە سروشتی‌یانە کە لە پێش هاتنی شەریعەتدا بوون. ئینجا پێویستی ئیمان بە نیەت بە پێ‌ی رای ئیمامی بوخاری‌یە کە کردەوە بەشێکە لە ئیمان. ئەگەر ئیمان بگێڕین بە باوەڕو تەسدیق ئەوە بێگومان نیەتی ناوێ وەک نەفسی نیەت کە پێویستی نی‌یە بە نیەت. (و قال الله تعالی: ﴿قل کل یعمل علی شاکلته﴾) لە کاتێکدا خوا فەرموی بە پێغەمبەرﷺ بڵێ هەموو کەس کردەوە ئەکات لەسەر نیازو نیەتی خۆی وەک بەوە تەفسیری (شاکلة) ئەکاتەوە کە ئەفەرموێ: نیەتە. واتە ئەم ئایەتەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کردەوەکان بەستراون بە نیەتەکانەوەو بە پێ‌ی ئەو نیەت و نیازانەن وەک تێپەڕی کرد لە حەدیسەکەی حەزرەتی عومەرەوە لە سەرەتای وەحی‌یەوە.

تەفسیری (شاکلة) بە نیازو نیەت لە حەسەنی بەصری و قتادەو چەند کەسێکی ترەوە هاتووە. وە موجاهید تەفسیری ئەکاتەوە بە تەریقەو رەوشت. وە هەندێ بە پارەو ناحیە. هەموو نزیکن لە یەکترەوە. (و نفقة الرجل علی أهله -یحتسبها- صدقة) لەفیقە دانی پیاو بە ماڵ وخێزانی لەبەر خواو بە نیازی فەرمانبەری خوا سەدەقەیە (وقال:) ئیمامی بوخاری ئەفەرموێ: (ولکن جهاد ونیة) ئەم فەرمودەیە بەشێکە لە حەدیسێ کە ئیبن عباس ریوایەتی ئەکات: (لا هجرة بعد الفتح) کۆچ کردن لە مەککەوە بۆ مەدینە کە لە ئیسلامدا پایەو پلەیەکی بەرزی هەیە لە پاش فەتحی مەککە نەما. واتە لە پاش ئەو ئەو گەورەیی‌یەی نەما، چونکە ئەو هونەرو فیداکاری‌یە ترس و بیمی نەما. جا لەبەر ئەوە ئیمام ئەم بەشەی نەهێنا بەبەڵگە بۆ مەبەستەکە بەڵکو لەم شوێنەدا هەر ئەم بەشەی پێویستە (ولکن جهاد ونیة) بەڵکو لەپاش فەتح کردەوەی بەنرخ و گەورە غەزاو تێکۆشان و نیازی چاکە هەیەو ئەمێنێتەوە تا رۆژی دوایی. وە مەبەستی ئیمام ئەمەیە: کە غەزاو نیازی چاک کراوە بە بەشێک لە ئیمانی تەواو. جا بۆ ئەم مەبەستە کە نیەت بەشێکە لە ئیمان ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە

حەزرەتی عومەرەوە کە تێپەڕی کرد: (عن عمر أن رسول اللهﷺ قال: الأعمال بالنية، ولكل امرئ مانوى فمن كانت هجرته إلى الله ورسوله فهجرته إلى الله ورسوله ومن كانت هجرته لدنيا يصيبها أو امرأة يتزوجها فهجرته إلى ما هاجر إليه) ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە عدی کوڕی سابیتەوە کە ئەویش ئەیهێنێ لە ئیبن مەسعودەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ کە ئەفەرموێ: (و إذا أنفق الرجل على أهله يحتسبها فهو له صدقة) ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە سەعدی کوڕی ئەبو وەقاصەوە کە (أن رسول اللهﷺ قال: إنك لن تنفق نفقة تبتغي بها وجه الله إلا أجرت عليها حتى ما تجعل في في امرأتك).

*** *** ***

٤٢ـ بابُ قَوْلِ النَّبيِّﷺ «الدِّيْنُ النَّصِيْحَةُ: لله ولِرَسُولِهِ ولأئمةِ الْمُسْلِمِيْنَ وَعَامَّتِهِمْ».

وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿إِذَا نَصَحُوا لله وَرَسُولِهِ﴾ (التوبة: ٩١)

٥٧ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنِي قَيْسُ بنُ أَبِي حَازِمٍ عَنْ جَرِيْرِ بنِ عَبْدِاللهِ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ عَلَى: إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٥٢٤، ١٤٠١، ٢١٥٧، ٢٧١٤، ٢٧١٥، ٧٢٠٤)دا دووبارە بووەتەوە.

٥٨ـ حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ زِيَادِ بنِ عِلَاقَةَ قَالَ: سَمِعْتُ جَرِيْرَ بنَ عَبْدِاللهِ يَقُولُ يَوْمَ مَاتَ الْمُغِيْرَةُ بنُ شُعْبَةَ، قَامَ فَحَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ وَقَالَ: عَلَيْكُمْ بِاتِّقَاءِ اللهِ وَحْدَهُ لاَ شَرِيْكَ لَهُ، وَالْوَقَارِ وَالسَّكِيْنَةِ، حَتَّى يَأْتِيَكُمْ أَمِيْرٌ، فَإِنَّمَا يَأْتِيكُمُ الآنَ، ثُمَّ قَالَ: اسْتَعْفُوا لأَمِيْرِكُمْ، فَإِنَّهُ كَانَ يُحِبُّ الْعَفْوَ. ثُمَّ قَالَ: أَمَّا بَعْدُ فَإِنِّي أَتَيْتُ النَّبِيَّﷺ قُلْتُ: أُبَايِعُكَ عَلَى الإِسْلَامِ. فَشَرَطَ عَلَيَّ «النُّصْحُ لِكُلِّ مُسْلِمٍ» فَبَايَعْتُهُ عَلَى هَذَا، وَرَبِّ هَذَا الْمَسْجِدِ إِنِّي لَنَاصِحٌ لَكُمْ. ثُمَّ اسْتَغْفَرَ وَنَزَلَ.

ئەمەبی بابی فەرمودەکەی پێغەمبەرەﷺ کە فەرموی: دین بریتییە لە ئیخلاص بۆ خواو پێغەمبەرەکەی و بۆ ئیمام و پێشەواکانی موسڵمانان و بۆ کۆمەڵی موسڵمانان بە

کشتی. هێندێ فەرموویانە: ئەمەی کە دین ئەکات هەر بە ئیسلام لەسەر موبالەغەیەو گرنگی ئیخلاص نیشان ئەدات تا ئەو رادەیەی وەک دین هەر ئەوە بێت، بەڵام لە راستیدا ئەگەر بیر بکەینەوە لەم فەرمودەیەو تەفسیری بکەینەوە بەم جۆرەی کە دێت ئەزانین ئەم فەرمودەیە لەسەر حەقیقەتە، چونکە مەبەست بە ئیخلاص بۆ خوا بریتییە لە باوەڕ هێنان بە خواو ناسینی بەو سیفەتانەی کە بۆ خۆی داناوەو فەرمانبەری خوا لە هەموو فەرمانەکانیداو تێکۆشان لەرێگای بڵاوکردنەوەی ئایینەکەی و گێڕانەوەی بەندەکان بۆ لای. پەرستن و گوێڕایەڵی. وە ئیخلاص بۆ پێغەمبەرەکەیﷺ ئەمــــەیە پەیڕەوی ئەو بکرێ و هەوڵ بدرێ بە هەمــــوو توانا لە رێگەی بڵاوکردنەوەی ئایین و شەریعەتەکەی و باودانی رەزامەندی و خۆشویستنی ئەو بەسەر هەموو دروست کراوەکانی خوادا. ئیخلاص بۆ پێشەواکانی موسڵمانان و یارمەتی دان و کۆمەکی کردنیان بۆ ئەو ئەمانەتەی کە خراوەتە سەر شانیان و ئاگادار کردنەوەیان لە هەرکارێکی شەرعی پێویست. وە ئیخلاص بۆ موسڵمانان بەگشتی بریتییە لە خۆش ویستن و چاکە کردن لەگەڵیان و بە پێی توانا یارمەتی دانیان لە هەر کارێکی خێردا. دەی بەم جۆرە کە باس کردنی هەموو مەبەستی دین کۆ ئەبێتەوە وەک ئەبێ بە بەڵگە لەسەر مەبەستەکەی ئیمامی بوخاری کە کردەوە بەشێکە لە ئیمانی تەواو.

ئەم بابە ئەم فەرمودەی خوا (وقوله تعالى: ﴿إذا نصحوا لله رسوله﴾) ئەهێنێ بە دوای حەدیسەکەدا بۆ پشتگیری. بە بۆنەی مەبەستی بابەکەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە جەریری کوڕی عبداللەوە کە ئەفەرموێ: (بايعت رسول اللهﷺ على إقام الصلاة و إيتاء الزكاة، والنصح لكل مسلم) پەیمانم دا بە پێغەمبەری خواﷺ لەسەر نوێژ بەجێ هێنان بە رێکی و زەکات دان و ئیخلاص بۆ هەموو موسڵمانێک. هەروەها حەدیسێکی تر ئەهێنێ لە جەریری کوڕی عبداللەوە: (يقول: يوم مات المغيرة بن شعبة قام فحمد الله و أثنى عليه و قال عليكم باتقاء الله وحده لاشريك له والوقار والسكينة حتى يأتيكم أمير، فإنما يأتيكم الآن، ثم قال استعفوا لأميركم فإنه كان يحب العفو ثم قال أما بعد فإني أتيت النبيﷺ قلت: يا رسول الله أبايعك على الإسلام. فشرط علي النصح لكل مسلم، فبايعته على هذا، ورب هذا المسجد إني لناصح لكم. ثم استغفر ونزل. ئەفەرموێ لەو رۆژەدا کە موغیرەی کوڕی شوعبە وەفاتی کرد جەریری کوڕی عبداللە هەستا خوتبەی دا، بەم جۆرە

حەمدو سوپاسی خوای کردو فەرمووی: لەسەرتانە تەقوای خوای تاک و تەنیای بێ هاوبەش، نەبێ ویقارو ئارامتان هەبێ هەتا فەرماندەکەتان دێت و ئێستا دێت، ئینجا فەرمووی داوای عەفو و لێبوردن بکەن بۆ ئەمیرەکەتان کە وەفاتی کرد، چونکە خوا عەفوی پێ خۆشە، لە پاش ئەوە من لە پێغەمبەرم بیست ﷺ عەرزم کرد ئەی پێغەمبەری خوا پەیمانت پێ ئەدەم لەسەر ئیسلام. ئەویش مەرجی لەسەر دانام کە ئەبێ ئیخلاصم ببێ بۆ هەموو موسڵمانێک، ئینجا منیش پەیمانم پێدا لەسەر ئەوە، وە سوێند بە خوای ئەم مزگەوتە من موخلیسێکی راستم بۆتان، ئینجا داوای لێ خۆش بوونی کرد بۆ دانیشتوان، ئینجا لە مینبەرەکە هاتە خوارەوە. پەیوەندی ئەم حەدیسە روونە بە باب و مەبەستەکەوە. بە تایبەتی ناوی موسڵمانی برد، چونکە زۆرتر موسڵمان پێویستە ئەگینا بۆ کافریش پێویستە ئیخلاص بەمەی بە رێک و پێکی بانگ بکرێت بۆ ئیسلام.

*** *** ***

(٣)

# كتابُ الْعِلْمِ

## ١ـ بابُ فَضْلِ الْعِلْمِ،

وَقَولُ اللّهِ تَعَالَى: ﴿يَرْفَعِ اللّهُ الَّذِيْنَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَالَّذِيْنَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ وَاللّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيْرٌ﴾ (المجادلة:١١)

وَ قَوْلِهِ عَزَّوَجَلَّ: ﴿رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ (طه:١١٤)

(باب فضل العلم) ئەمە بابێکە فەزڵ و گەورەیی عیلمە، بۆ ئەم مەبەستە لێرەدا دوو ئایەت ئەهێنێ وەک ئەفەرموێ: (وقول اللّه تعالى: ﴿يرفع اللّه الذين أمنوا والذين أوتوا العلم درجات﴾) واتە بابی فەرمودەی خوایە کە ئەفەرموێ: ئەوانەتان باوەڕتان هێناوە پلەو رادەتان بەرز ئەکاتەوە بە یارمەتی دان و ناوبانگی چاک لە دنیادا، وە نیشتەجێ کردنتان لە بەهەشتدا لەرۆژی دوایی وە بە تایبەتی ئەوانەتان کە خاوەنی عیلم و زانان بە چەند پلەو پایەیەک. ئیبن عەباس -خوایان لێ رازی بێت- ئەفەرموێ: بە حەدیس نێوان دوو دەرەجە پێنج سەد ساڵە. بێگومان ئەم زانایانە ئەوانەن کە لە زانایانی ئاخیرەتن و قورئان و حەدیس رانەگەیەنن بە ئوممەت و بانگی خەڵکی ئەکەن بۆ رێگە راستەکەی خواو حاکمیتی خوا ئەچەسپێنن لە دنیادا.

ئینجا هەڕەشە ئەکات لەوانەی کە فەرمانبەری ناکەن یان بێ موبالاتن و بە ئەرکێکی گران فەرمانەکانی خوا سەیر ئەکەن، ئەفەرموێ: ﴿واللّه بما تعملون خبير﴾ خوا بە خەبەرو ئاگایە بە هەرکردەوەیەک کە ئێوە دەیکەن.

ئایەتی دووەم لە بارەی گەورەیی عیلمەوە ئەمەیە کە ئەفەرموێ: ﴿وقل رب زدني

علما﴾ خوا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەرﷺ کە نزا بکاتە لای خواو بڵێ: ئەی خوایە زیادم بکە لە بارەی عیلمەوەو داوای زیادە عیلم و زانینی لێ بکە. بێگومان ئەمە بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە لەسەر گەورەیی عیلم.

ئینجا ئایا ئیمام بۆچی لێرەدا بێ دەنگ ئەبێت و هێندێ لە حەدیس ناهێنێ. لە وەڵامدا گوتراوە کە بەو دوو ئایەتە ئیتر پێویستی نەماوە بەجێ هێنانی حەدیس، یان لەبەر ئەوەیە لەو کاتەدا حەدیسی دەست نەکەوتووە لەسەر مەرجی خۆی. یان لەبەر ئەوەی لە داهاتوودا حەدیس ئەهێنێ گەورەیی رادەو پلەی عیلم نیشان ئەدا. وە بە هەرحەت ئەو دوو ئایەتە بەسە.

*** *** ***

٢ـ بابُ مَنْ سُئِلَ عِلْمًا وَهُوَ مُشْتَغِلٌ فِي حَدِيْثِهِ فَأَتَمَّ الْحَدِيْثَ ثُمَّ أَجَابَ السَّائِلَ

٥٩ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ سِنَانٍ قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحٌ. ح.

وَحَدَّثَنِي إبْرَاهِيْمُ بنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ فُلَيْحٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي قَالَ: حَدَّثَنِي هِلاَلُ بنُ عَلِيٍّ عَنْ عَطَاءَ بنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّﷺ فِي مَجْلِسٍ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ جَاءَهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: مَتَى السَّاعَةُ؟ فَمَضَى رَسُولُ اللهِﷺ يُحَدِّثُ. فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: سَمِعَ مَا قَالَ فَكَرِهَ مَا قَالَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: بَلْ لَمْ يَسْمَعْ. حَتَّى إِذَا قَضَى حَدِيْثَهُ قَالَ: أَيْنَ -أُرَاهُ- السَّائِلُ عَنِ السَّاعَةِ؟ قَالَ: هَا أَنَا يَا رَسُولُ اللهِ، قَالَ: «فَإِذَا ضُيِّعَتِ الأَمَانَةُ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ». قَالَ: كَيْفَ إِضَاعَتُهَا؟ قَالَ: «إِذَا وُسِّدَ الأَمْرُ إِلَى غَيْرِ أَهْلِهِ فَانْتَظِرِ السَّاعَةَ».

ئەمە بابی کەسێکە کە پرسیارو داوای عیلمێک بکرێ لێی لە کاتێکدا کە خەریک بێت بە باس و قسەیەک و ئینجا باس و قسەکەی تەواو بکات و ئینجا وەڵامی پرسیارەکە بداتەوە لەم فەرموودەوە وەرئەگیرێ ئەدەب و ئادابی معلم و متعلم. ئەدەبی عالم ئەمەیە کە پرسیار کەر نەتارێنێ و تێی نەخوڕێ، بەڵکو لە یەکەم جارەوە قسەو باسەکەی خۆی دوایی بێنێ و بگەڕێتەوە سەر پرسیارەکە بۆ وەڵام دانەوەی، وەک وەرئەگیرێ ئادابی پرسیارکەر کە پرسیار نەکات لە کاتێکدا کە زاناکە خەریک بێت، چونکە مافی یەکەم لە پێشترە، هەروەها هەموو کارەکانی تریش بەسەرە بێت. لەم بارەوە حەدیس ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (قال:

بينما النبيﷺ في مجلس يحدث القوم جاءه أعرابي فقال: متى الساعة؟ فمضى رسول اللهﷺ يحدث فقال: بعض القوم سمع ما قال فكره ما قال، وقال بعضهم: بل لم يسمع. حتى إذا قضى حديثه قال: أين -أراه- السائل عن الساعة؟ قال: ها أنا يا رسول الله، قال: «فإذا ضيعت الأمانة فانتظر الساعة». قال: كيف إضاعتها؟ قال: «إذا وسد الأمر إلى غير أهله فانتظر الساعة» ئەبو هورەیرە ئەفەرموێ: جارێ پێغەمبەرﷺ لە کۆڕێکدا قسەو وتاری ئەفەرمو بۆ خەڵکی لەو کاتەدا عەرەبێکی کۆچەری هات و گوتی: ڕۆژی دوایی کەی دێت؟ ئینجا پێغەمبەرﷺ وەڵامی نەدایەوەو بەردەوام بوو لەسەر قسەو وتارەکەی، ئینجا هێندێ لە گوێ گران گوتیان: پێغەمبەرﷺ پرسیارەکەی بیست و پێی ناخۆش بوو، لەبەر ئەوە وەڵامی نەدایەوە، هەندێکی تر وتیان بەڵکو نەیبیست لەبەر ئەوە وەڵامی نەدایەوە، کارەکە بەو جۆرە مایەوە هەتا لێ بوویەوە لە فەرمایشتەکەی ئینجا فەرمووی: لە کوێیە پرسیارکەرەکە لە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی؟ محەمەدی کوڕی فلیح کە حەدیسەکەی ریوایەت کردووە دوو دڵ بوو لە دەقی فەرمودەکەدا کە ئایا فەرمووی پرسیارکەر لە ڕۆژی دوایی لە کوێیە، یان فەرموی: ئەو پرسیار کەرە کامەیە. بە هەرحاڵ پرسیار کەرەکە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من ئەو پرسیارکەرەم. لە وەڵامدا فەرمووی: هەرکاتێ سپاردەو ئەمانەت زایە بکرێ چاوەڕوانی هاتنی ئەو ڕۆژە بکە. ئینجا پرسیارکەرەکە وتی: زایەکردنی چۆنە؟ لە وەڵامدا فەرموی: هەرکاتێ کارو فەرمان حەواڵەی نائەهل بکرێ چاوەڕوانی هاتنی ئەو ڕۆژە بکە.

ئەم حەدیسە ڕێنموونیمان ئەکات بۆ ئەوەی هەر عالمێک کە خەریک بوو بە قسەو دەرس و وتارێک هەق نییە قسەکەی ببڕێ و پرسیاری لێ بکرێ. ئەگەر قسەکەی بڕا چاک وایە نەرمی بەکاربهێنرێ و زەجر نەکرێ و لەسەر دەرس و وتارەکە بەردەوام بێت هەتا لێ نەبێتەوە، ئینجا وەڵامەکە بداتەوە، مەگەر وەڵامەکە پێویست تر بێ وەک وەڵام دانەوەکەی (ابن أم مكتوم) کەسورەتی (عبس) نیشانمان ئەدات.

ئەم حەدیسە لە ژمارە (٦٤٩٦)دا دووبارە بووەتەوە.

***　***　***

### ٣ـ بابُ مَنْ رَفَعَ صَوْتَهُ بالْعِلْم

٦٠ـ حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ عَارِمُ بنُ الْفَضْلِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ أَبِي بِشْرٍ عَنْ

يُوسُفَ ابْنِ مَاهَكَ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْرٍو قَالَ: تَخَلَّفَ عَنَّا النَّبِيُّ ﷺ فِي سَفْرَةٍ سَافَرْنَاهَا، فَأَدْرَكَنَا وَقَدْ أَرْهَقَتْنَا الصَّلاَةُ وَنَحْنُ نَتَوَضَّأُ، فَجَعَلْنَا نَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا، فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ» مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا.

ئەمە بابی کەسێکە کە بە دەنگی بەرز زانست بڵاو بکاتەوە. واتە ئەگەر پێویست بوو ڕاگەیاندن و فێر کردن و ئاگادار کردنەوە بە جار دان بە دەنگی بەرز بکرێ کارێکی بەجێیە. لەم بارەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە کە (قال: تخلف عنا النبي ﷺ في سفرة سافرناها) پێغەمبەرمان لێ دوا کەوت لە سەفەرێکدا کە کردمان (فأدركنا وقد أرهقتنا الصلاة) ئینجا پێمان گەیشت لە کاتێکدا کە نوێژ بوو بوو (ونحن نتوضأ، فجعلنا نمسح على أرجلنا) ئێمە دەست نوێژمان ئەگرت و پێمان مەسح ئەکرد (فنادى بأعلى صوته: «ويل للأعقاب من النار» مرتين أو ثلاثا) ئەویش بە بەرزترین دەنگی بانگی لێ کردین و فەرمووی: وەیل و بە هیلاکدا چوون لە ئاگردا بۆ خاوەن پاژنەکان کە نەیان شۆردوون. دوو جار یان سێ جار ئەوەی فەرموو.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٩٦، ١٦٣)دا دووبارە بووەتەوە.

**** *** ***

## ٤- بابُ قَوْلِ الْمُحَدِّثِ: «حَدَّثَنَا» أَوْ «أَخْبَرَنَا» أَوْ «أَنْبَأَنَا».

وَقَالَ لَنَا الْحُمَيْدِيُّ: كَانَ عِنْدَ ابْنِ عُيَيْنَةَ حَدَّثَنَا وَ أَخْبَرَنَا وَ أَنْبَأَنَا وَسَمِعْتُ وَاحِدًا. وَقَالَ ابْنُ مَسْعُودٍ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهُوَ الصَّادِقُ الْمَصْدُوقُ. وَقَالَ شَقِيقٌ عَنْ عَبْدِاللهِ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ كَلِمَةً. وَقَالَ حُذَيْفَةُ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ حَدِيثَيْنِ. وَقَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ فِيمَا يَرْوِي عَنْ رَبِّهِ. وَقَالَ أَنَسٌ: عَنْ النَّبِيِّ ﷺ يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّهِ عَزَّوَجَلَّ. وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: عَنِ النَّبِيِّ ﷺ يَرْوِيهِ عَنْ رَبِّكُمْ عَزَّوَجَلَّ.

٦١- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بْنُ جَعْفَرٍ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ دِينَارٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لاَ يَسْقُطُ وَرَقُهَا، وَإِنَّهَا مَثَلُ الْمُسْلِمِ، فَحَدِّثُونِي مَا هِيَ؟ فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ الْبَوَادِي، قَالَ عَبْدُاللهِ: وَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، فَاسْتَحْيَيْتُ. ثُمَّ قَالُوا: حَدِّثْنَا مَا هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ. قَالَ: هِيَ النَّخْلَةُ»

(باب قول المحدث: «حدثنا» أو «أخبرنا» أو «أنبأنا»).ئەمە بابێکە کە باسی ئەو سێ وشە ئەکات کە ئەهلی حەدیس بەکاریان هێناوە، مەبەستی ئەوەیە ئایا ئەو سێ وتەیە هەر یەکن یان جیاوازن. ئینجا بە دوای ئەوەدا ئیمام ئەمە ئەهێنێ (وقال لنا الحميدي: كان عند ابن عتيبة حدثنا و أخبرنا و أنبأنا و سمعت واحدا) هەرسێکیان ئەک یەکێ لەو سیانە. وە مەبەستی ئەوەیە لەو هێنانی ریوایەتی (حميدي) یەوە ئەم ریوایەتەی بە دڵە. وە ئەمە ئەوپەڕی ئیحتیاطە لە لایەن ئیمامی بوخارییەوە کە ئەکۆڵێتەوە لەو جۆرە شتانە.

ئینجا ئەو وشانە لە نووسیندا کورت کراونەتەوە بە أنا. ثنا، نا. شاعیر ئەڵێ:

واختصروا أنبأنا خطا انا     واختصروا حدثنا ثنا ونا

(وقال ابن مسعود: حدثنا رسول اللهﷺ وهو الصادق المصدوق) ئیبن مەسعود ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ هەواڵی پێداین کە ئەو راست و راست لەگەڵدا کراوە (وقال شقيق عن عبدالله: سمعت النبيﷺ كلمة) شەقیق لە عەبدوڵڵاوە ئەگێڕێتەوە کە گوتی: بیستم لە پێغەمبەرەوەﷺ وشەیەک (وقال حذيفة: حدثنا رسول اللهﷺ حديثين) حوزەیفە فەرموی: پێغەمبەرﷺ دوو حەدیسی بۆ باس کردین. (وقال أبو العالية: عن ابن عباس عن النبي فيما يروي عن ربه) ئەبولعالیە لە ئیبن عەباسەوە ریوایەت ئەکات لە پێغەمبەرەوەﷺ لەوەی کە ریوایەتی ئەکات لە پەروەردگارییەوە عزوجل. (وقال أنس: عن النبيﷺ يرويه عن ربه عزوجل) وە ئەنەس فەرموی: لە پێغەمبەرەوەﷺ لەوەی کە ریوایەتی ئەکات لەپەروەردگارییەوە. (وقال أبو هريرة: عن النبيﷺ يرويه عن ربكم عزوجل) ئەو هورەیرە وتی: لە پێغەمبەرەوە کە ئەویش ریوایەتی ئەکات لە پەروەردگارتانەوە عزوجل.

مەبەستی بوخاری ئەوەیە کە راوییەکانی حەدیس ئەم جۆرە وتە جۆر بە جۆرانە ئەڵێن و مەبەستەکەیان هەر یەکەو جیاوازی وتەکانیان زیانی نییە ماتوڵ یەک مەبەستیان هەیە، کەواتە هیچ دژایەتییەک نییە لە نێوان ئەو ریوایەتانەدا.

ئینجا بە نموونە ئەم حەدیسە ئەهێنێ کە ئەو جۆرە جیاوازییە هەیە لە ریوایەتەکانداو مەبەست هەر یەک مەبەستە، جا بەو بۆنەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عومەرەوە -خوا لێیان رازی بێت- کە (قال رسول اللهﷺ: «إن من الشجر شجرة لا يسقط ورقها، وإنها

مثل المسلم، فحدثوني ما هي؟ فوقع الناس في شجر البوادي، قال عبدالله: ووقع في نفسي أنها النخلة، فاستحييت. ثم قالوا: حدثنا ما هي يا رسول الله، قال: هي النخلة)

ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: لەناو درەختدا درەختێک هەیە کە گەڵاکەی ناکەوێت و ئەوەش وەک موسڵمان وایە، دەی هەواڵم پێ بدەن ئەو درەختە کامەیە. ئینجا خەڵکی گەڕان بە خەیاڵ بە ناو هەموو درەختەکانی لادێکاندا تا بزانن کامەیە ئەو درەختە. ئیبن عەباس ئەفەرموێ: کەوتە دڵمەوە کە ئەوە دارخورمایە، بەڵام شەرمم کرد بیڵێم. ئینجا گوێ گرەکان گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵمان بدەرێ ئەو درەختە کامەیە؟ لەوەڵامدا فەرموی: ئەو درەختە دار خورمایە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٦٢، ٧٢، ١٣١، ٢٢٠٩، ٤٦٩٨، ٥٤٤٤، ٥٤٤٨، ٦١٣٢، ٦١٤٤)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٥ـ بابُ طَرْحِ الإمَامِ الْمَسْأَلَةَ عَلَى أَصْحَابِهِ لِيَخْتَبِرَ مَا عِنْدَهُمْ مِنَ الْعِلْمِ

٦٢ـ حَدَّثَنَا خَالِدُ بنُ مَخْلَدٍ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ دِينَارٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لاَ يَسْقُطُ وَرَقُهَا، وَإِنَّهَا مَثَلُ الْمُسْلِمِ، فَحَدِّثُونِي مَا هِيَ؟ فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ الْبَوَادِي، قَالَ عَبْدُاللهِ: وَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، فَاسْتَحْيَيْتُ. ثُمَّ قَالُوا: حَدِّثْنَا مَا هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: هِيَ النَّخْلَةُ»

ئینجا نەفسی ئەو حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عومەرەوە، بەڵام لە ریوایەتی یەکەمدا فەرموی: (كنا عند رسول الله ﷺ أخبروني...) ماتوڵ مەبەست هەریەکە ئەو جیاوازییە زیانی نەبوو.

لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە ئیمام ژێر دەستەکانی تاقی بکاتەوە شتێکی راست و ڕەوایە.

*** *** ***

## ٦ـ بابُ مَا جَاءَ فِي الْعِلْمِ، وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ (طه: ١١٤)

الْقِرَاءَةُ وَالْعَرْضُ عَلَى الْمُحَدِّثِ. وَرَأَى الْحَسَنُ وَالثَّوْرِيُّ وَمَالِكٌ الْقِرَاءَةَ جَائِزَةً.

وَاحتجَّ بَعضُهم في القِرَاءَةِ علَى العَالِم بحدِيثِ ضِمَامِ بنِ ثَعلَبَةَ قَالَ للنبيِّ ﷺ: آللهُ أمَرَكَ أنْ تُصلِّيَ الصَّلَوَاتِ؟ قَالَ: نعَمْ. قَالَ: فَهذِهِ قِرَاءَةٌ علَى النَّبِيِّ ﷺ، أخبرَ ضِمَامٌ قَومَهُ بذَلكَ فَأجَازُوهُ. وَاحتجَّ مَالكٌ بالصَّكِّ يقرأُ علَى القَومِ فَيقُولُونَ: أشهَدَنَا فُلانٌ، وَيقرأُ ذَلكَ قِرَاءَةً عَلَيهِمْ. وَيقرأُ علَى المُقرِئِ فَيقُولُ القَارِئُ: أقرَأنِي فُلانٌ. حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ سَلاَمٍ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ الحَسَنِ الوَاسِطِيُّ عَنْ عَوفٍ عَنِ الحَسَنِ قَالَ: لاَ بَأسَ بالقِرَاءَةِ علَى العَالِمِ. وَ أخبَرَنَا مُحَمَّدُ بنُ يُوسُفَ الفِرَبْرِيُّ وَحَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ إسمَاعِيلَ البُخَارِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عُبَيدُاللهِ بنُ مُوسَى عَنْ سُفيَانَ قَالَ: إذَا قُرِئَ علَى المُحدِّثِ فَلا بَأسَ أنْ تَقُولَ: حَدَّثَنِي. قَالَ: وَسَمِعتُ أبَا عَاصِمٍ يَقُولُ عَنْ مَالكٍ وَسُفيَانَ: القِرَاءَةُ علَى العَالِمِ وَقِرَاءَتُهُ سَوَاءٌ.

٦٣ـ حَدَّثَنَا عَبدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيثُ، عَنْ سَعِيدٍ -هُوَ المَقْبُرِيُّ- عَنْ شَرِيكِ بنِ عَبدِاللهِ بنِ أبِي نَمِرٍ أنَّهُ سَمِعَ أنَسَ بنَ مَالكٍ يَقُولُ: بَينَمَا نَحنُ جُلُوسٌ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ في المَسجِدِ دَخَلَ رَجُلٌ علَى جَمَلٍ فَأنَاخَهُ في المَسجِدِ ثُمَّ عَقَلَهُ ثُمَّ قَالَ لَهُمْ: أيُّكُمْ مُحَمَّدٌ -وَالنَّبِيُّ ﷺ مُتَّكِئٌ بَينَ ظَهرَانَيهِمْ- فَقُلنَا: هَذَا الرَّجُلُ الأبيَضُ المُتَّكِئُ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: ابنَ عَبدِالمُطَّلِبِ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: قَدْ أجَبتُكَ: فَقَالَ الرَّجُلُ للنَّبِيِّ ﷺ: إنِّي سَائِلُكَ فَمُشَدِّدٌ عَلَيكَ في المَسألَةِ، فَلاَ تَجِدْ عَلَيَّ في نَفسِكَ. فَقَالَ: سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ. فَقَالَ: أسألُكَ بِرَبِّكَ وَ رَبِّ مَنْ قَبلَكَ، آللهُ أرسَلَكَ إلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ. قَالَ: أنشُدُكَ باللهِ، آللهُ أمَرَكَ أنْ تُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الخَمسَ في اليَومِ وَاللَّيلَةِ؟ قَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ. قَالَ: أنشُدُكَ باللهِ، آللهُ أمَرَكَ أنْ تَصُومَ هَذَا الشَّهرَ مِنَ السَّنَةِ؟ قَالَ: اللَّهُمَّ نَعَمْ. قَالَ: أنشُدُكَ باللهِ، آللهُ أمَرَكَ أنْ تَأخُذَ هَذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أغنِيَائِنَا فَتَقسِمَهَا علَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: اللَّهُمَّ نَعَمْ. فَقَالَ الرَّجُلُ آمَنتُ بِمَا جِئتَ بِهِ، وَأنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَومِي. وَأنَا ضِمَامُ بنُ ثَعلَبَةَ أخُو بَنِي سَعدِ بنِ بَكرٍ.

رَوَاهُ مُوسَى وَعَلِيُّ بن عَبدِالحَمِيدِ عَنْ سُلَيمَانَ عَنْ ثَابِتٍ عَنْ أنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذَا.

(باب ما جاء في العلم) ئەمە بابی ئەو ئایەت و حەدیسانەیە کە هاتووە لە بارەی

عیلمەوە (وقوله تعالی: ﴿و قل رب زدني علما﴾) هەروەها بابی ئەم فەرمودەی خوایە کە فەرمانی دا بە پێغەمبەرﷺ بڵێ: ئەی خوای من زیادم بکە لە بارەی عیلمەوە، واتە زیادە زانینم پێ ببەخشە. (القراءة والعرض علی المحدث) ئەم بابە بابی خوێندنەوەو عەرز کردنی کەسێکە کە ئەوەی ئەیزانێ بیخوێنێتەوە بەسەر ئیمامەکەیدا، ئیتر ئەوەی ئەیخوێنێتەوە ئیمامەکەی ئەیزانێ و لەبەریەتی یان نەء، واتە کاتێ ئەوەی راگەیاند ئیمامەکە لێی بێ دەنگ بوو، ئەوە حوکمی ریوایەتی هەیە یان نەء.

رای بەهێز لەسەر ئەوەیە کە ئەوە دروستەو عەمەلی پێ ئەکرێ وەک ئەفەرموێ: (ورأي الحسن والثوري ومالك القراءة جائزة) بە رای حەسەنی بەصری و سوفیانی سەوری و ئیمامی مالیک ئەوە رەوایە وەک ئیمامەکە هەواڵی پێ داین. ئیمامی بوخاریش بەم شێوەیە تەعلیقی داوە لەسەری وەک ئەفەرموێ: (و قال عبدالله) ئەبو عبدالله ئەفەرموێ: واتە خۆی (قال: وسمعت أبا عاصم يقول عن مالك و سفيان: القراءة على العالم و قراءته سواء) بیستم لە ئەبو عاصم لە سوفیان و ئیمامی مالیکەوە لە سوفیانەوە باسی ئەکات، هەردووکیان ئەفەرمون، خوێندنەوەو بیستن رەوایەو چاکە. وە بەڵگەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: (حدثنا عبيد الله بن موسى عن سفيان) عوبەیدوڵلای کوری موسا ئەفەرموێ لە سوفیانەوە (قال: إذا قرئ على المحدث) هەرکاتێ خوێندیەوە بەسەر ئیمامەکەدا هیچ ئەرەجێک نىیە لەسەری کە بڵێ (حدثني و سمعت) ئیمامەکە باسی کرد بۆم و بیستم لێی.

ئینجا سەبارەت بە خوێندنەوە بەسەر عالمدا بەڵگە ئەهێنێتەوە (بحديث ضمام بن ثعلبة) بە حەدیسی ضمامی کوری سەعلەبە کە (قال: الله آمرك أن تصلي الصلوات؟) گوتی: ئایا خوا فەرمانی پێکردووی ئەم نوێژانە بکەیت. لەوەڵامدا فەرموی: (نعم) بەڵی خوا فەرمانی پێداوم (قال فهذه قراءته على النبيﷺ) حمیدی ئەفەموێ: ئەم رووداوە لە پرسیاری ضمامە خوێندنەوەیە بەسەر پێغەمبەرداﷺ (أخبر ضمام قومه بذلك فأجازوه) ضمام هەواڵی دا بە قەومەکەی و ئەوانیش لێیان وەرگرت و قبوڵیان کرد (واحتج مالك بالصك يقرأ على القوم) ئیمامی مالیک لەسەر ئەوەیە ئەگەر کەسێک لە دەفتەرچەکەیدا ئیقراری خۆی بنوسێ و بخوێنێ بەسەر خەڵکیدا (فيقولون: أشهدنا فلان) ئینجا

شایەتەکان دروستە بڵێن: فلان کردووینی بە شایەت، واتە ئەو نووسین و خوێندنەوە وەک ئەوە وایە بڵێ کردووینی بە شایەت (ویقرأ ذلك قراءة علیهم) لە کاتێکدا ئەو نووسراوە خوێنراوەتەوە بەسەریاندا (و یقرئ علی المقرئ) واتە ئەگەر قوتابییەک شتێکی لە قورئان خوێندەوە بەسەر مامۆستاکەی کە فێری خوێندنی قورئان دەکات وە هیچ رەخنەی لێ نەگرت و غەڵەتی نەدایەوە بە روویدا (فیقول القارئ أقرأني فلان) ئینجا قوتابییەکە بڵێ: فلان مامۆستا فێری کردم. واتە ئەو خوێندنەوە بەسەریدا وەک ئەوە وایە کە مامۆستاکەی فێری کردبێ، کەواتە ئەگەر بڵێ فێری کردم قسەکەی راستە. وە بەڵگە لەسەر ئەوە ئەم فەرمودەی حەسەنی بەصرییە کە عوف ریوایەتی ئەکات لێیەوە کە (قال: لا بأس بالقراءة علی العالم) فەرمویەتی: هیچ ئەرەجێک نییە بە خوێندنەوە بەسەر مامۆستاکەدا، واتە ئەو خوێندنەوە وەک بیستن وایەو راستە بڵێ هەواڵی پێداوم. (قال: سمعت أبا عاصم یقول عن مالك و سفیان: القراءة علی العالم و قراءته سواء) خوێندنەوەم بەسەر مامۆستادا وەک خوێندنی مامۆستاکە وایەو یەک حوکمیان هەیە. وە بۆ دەلیل لەسەر ئەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە -خوای لێ رازی بێت- کە (یقول: بینما نحن جلوس مع النبيﷺ في المسجد دخل رجل علی جمل فأناخه في المسجد) ئەفەرموێ:کاتێک ئێمە دانیشتووین لە خزمەت پێغەمبەرداﷺ لە مزگەوتدا، ئینجا پیاوێک هاتە ناو مزگەوت بەسواری حوشترێکەوەو پاشان خستی و چۆکی پێ دادا لە هەیوانی مزگەوتەکەدا (ثم عقله ثم قال لهم: أیكم محمد -والنبيﷺ متكئ بین ظهرانیهم-)ئینجا بەستییەوەو پاشان رووی کردە خەڵکەکەو گوتی: کامتان محمدە -لە کاتێکدا پێغەمبەرﷺ پاڵی دابوویەوە لەناو خەڵکەکەداو ئەوانیش بە دەوریدا بوون (فقلنا: هذا الرجل الأبیض المتكئ) ئێمەش گوتمان ئەم پیاوە سپییەیە کە پاڵی داوەتەوە (فقال له الرجل: ابن عبدالمطلب) ئێنجا پیاوەکە گوتی: ئەی کوری عبدالمطلب (فقال له النبيﷺ: قد أجبتك:) یان مەبەستی پیاوەکە ئەمە بوو ئەم پیاوە کوری عبدالمطلبە لەسەر هەر بار پێغەمبەرﷺ فەرمووی بە پیاوەکە وەڵامم دایتەوە،یان مەبەستی ئەوە بوو گوێم لێت بوو ( فقال الرجل للنبيﷺ: إني سائلك فمشدد علیك في المسألة)پیاوەکە وتی: من پرسیارم لێ دەکەم و زۆر توندی بەکار ئەهێنم لە پرسیارەکەمدا

(فلا تجد علي في نفسك) ئينجا له دڵی خۆتدا خەشمناکی نەبینم بەرامبەرم (فقال سل عما بدا لك) پێغەمبەریش فەرموی: پرسیار بکە لە هەر شتێ ئارەزوو ئەکەیت و پێت خۆشە (فقال: أسألك بربك و رب من قبلك، آلله أرسلك إلى الناس كلهم؟) پرسیارت لێ دەکەم بەو خوایەی کە پەروەردگاری خۆت و هەموو کەسە پێش تۆ، ئایا خوا تۆی رەوانە کردووە بۆ سەر هەموو کەس. (فقال: اللهم نعم) پێغەمبەریشﷺ فەرموی: بەڵێ سوێند بەخوا (قال: أنشدك بالله، آلله أمرك أن تصلي الصلوات الخمس في اليوم والليلة؟) سوێندت دەدەم بە خوا ئایا خوا فەرمانی پێ داوی کە پێنج جار نوێژ بکەیت لە شەو و رۆژێکدا. (قال: اللهم نعم) فەرمووی: بەڵێ قەسەم بە خوا (قال: أنشدك بالله، آلله أمرك أن تصوم هذا الشهر من السنة؟) وتی: سوێندت دەدەم بە خوا ئایا فەرمانی پێ داوی کە ئەم مانگە رۆژوو بگری لە ساڵێکدا (قال: اللهم نعم) فەرمووی: بەڵێ قەسەم بە خوا. (قال: أنشدك بالله، آلله أمرك أن تأخذ هذه الصدقة من أغنيائنا فتقسمها على فقرائنا؟) ئینجا وتی: سوێندت دەدەم بە خوا ئایا خوا فەرمانی پێ داوی کە ئەم زەکات و سەدەقەیە وەربگری لە دەوڵەمەندانمان و دابەشی بکەیت بەسەر فەقیرەکانماندا (فقال النبيﷺ: اللهم نعم) پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: بەڵێ بە خوا قەسەم (فقال الرجل آمنت بما جئت به) ئینجا پیاوەکەش وتی: من باوەڕم پێ هێناوی لەمەوپێش. واتە مەبەستی هەواڵ دان بوو بە باوەڕەکەی ، وە ئەو پرسیارانەی لە پاش باوەڕ هێنانەکەیەتی نەک مەبەستی باوەڕهێنان بێت لەو کاتەدا. (و أنا رسول من ورائي من قومي. و أنا ضمام بن ثعلبة أخو بني سعد بن بكر) ومن ضمامی کوڕی سەعلەبەم لە تیرەی بنی سەعدی بنی بکرم و من نێرراوم لە لایەن قەومەکەوە (رواه موسى و علي بن عبدالحميد عن سليمان عن ثابت عن أنس عن النبيﷺ بهذا) ئەمەی ریوایەت کردووە موساو عەلی کوڕی عبدالحميد لە سولەیمانەوە ئەوەیش لە سابتەوە، ئەویش لە ئەنەسەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ بەم ماناو مەبەستە ئیتر با عەینی لەفزەکە نەبێ.

*** *** ***

## ٧ـ بابَ مَا يُذكَرُ فِي الْمُنَاوَلَةِ وكِتَابِ أهْلِ الْعِلْمِ بِالْعِلْمِ إلَى الْبُلْدَانِ

وَقَالَ أَنَسٌ: نَسَخَ عُثْمَانُ الْمَصَاحِفَ فَبَعَثَ بِهَا إِلَى الآفَاقِ، ورأى عَبْدُاللهِ بنُ عُمَرَ وَيَحْيَى بنُ سَعِيدٍ وَمَالِكٌ ذَلِكَ جَائِزاً، وَاحْتَجَّ بَعْضُ أَهْلِ الْحِجَازِ فِي الْمُنَاوَلَةِ بِحَدِيثِ النَّبِيِّ ﷺ حَيْثُ كَتَبَ لأَمِيرِ السَّرِيَّةِ كِتَابًا وَقَالَ: لاَ تَقْرَأْهُ حَتَّى تَبْلُغَ مَكَانَ كَذَا وَكَذَا، فَلَمَّا بَلَغَ ذَلِكَ الْمَكَانَ قَرَأَهُ عَلَى النَّاسِ وَأَخْبَرَهُمْ بِأَمْرِ النَّبِيِّ ﷺ.

٦٤ـ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بنُ عَبْدِاللهِ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بنُ سَعْدٍ عَنْ صَالِحٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِاللهِ بنِ عُتْبَةَ بنِ مَسْعُودٍ أَنَّ عَبْدَاللهِ بنِ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ بَعَثَ بِكِتَابِهِ رَجُلاً وَأَمَرَهُ أَنْ يَدْفَعَهُ إِلَى عَظِيمِ الْبَحْرَيْنِ، فَدَفَعَهُ عَظِيمُ الْبَحْرَيْنِ إِلَى كِسْرَى، فَلَمَّا قَرَأَهُ مَزَّقَهُ، فَحَسِبْتُ أَنَّ ابْنَ الْمُسَيَّبِ قَالَ: فَدَعَا عَلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ يُمَزَّقُوا كُلَّ مُمَزَّقٍ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٩٣٩، ٤٤٢٤، ٧٢٦٤)دا دووبارە بووەتەوە.

٦٥ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ أَخْبَرَنَا عَبْدُاللهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسِ بنِ مَالِكٍ قَالَ: كَتَبَ النَّبِيُّ ﷺ كِتَابًا -أَوْ أَرَادَ أَنْ يَكْتُبَ- فَقِيلَ لَهُ إِنَّهُمْ لاَيَقْرَؤُونَ كِتَابًا إِلاَّ مَخْتُومًا، فَاتَّخَذَ خَاتَمًا مِنْ فِضَّةٍ نَقْشُهُ: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ. كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى بَيَاضِهِ فِي يَدِهِ، فَقُلْتُ لِقَتَادَةَ: مَنْ قَالَ نَقْشُهُ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ؟ قَالَ: أَنَسٌ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٩٣٨، ٥٨٧٠، ٥٨٧٢، ٥٨٧٤، ٥٨٧٥، ٥٨٧٧، ٧١٦٢)دا دووبارە بووەتەوە.

کاتێ لێ بوویەوە لە باسی دان نان و ئیشعار کردن بە بیستن و عەرز کردنی قوتابی ئەوەی کە دەیزانێ بۆ مامۆستاکەی. لە پاش ئەوە ئینجا بە دوای ئەوەدا ئەو شێوەکانی تر ئەهێنێ کە بەلای جەماوەرەوە سەحیحەو وەرئەگیرێ، ئەفەرموێ: (باب ما يذكر في المناولة) ئەمە بابی ئەوەیە کە باس کراوە لە بارەی وشەیەکەوە کە پێی ئەوترێ (مناولة) کە بریتییە لەوەی کە مامۆستاکەی لە حەدیسدا کتێبێک بدا بە قوتابییەکەی و پێی بڵێ ئەمە دانراوی منە یان ئەمە بیستومە لە شێخەکەمەوەو لە منەوە ریوایەتی بکە (وكتاب أهل العلم بالعلم إلى البلدان) وە بابی ئەوەیە کە زانایان کتێب و نووسراوێک بنێرن بە وڵاتاندا ئەوەش ئیعتیباری پێ ئەکرێ و دروستە ریوایەتی بکات لێیەوە (نسخ عثمان المصاحف فبعث بها

إلى الآفاق) حەزرەتی عوسمان چەند نوسخەیەکی لە قورئان نارد بۆ ولاتان یەکێ بۆ مەککەو یەکێ بۆ شام و یەکێ بۆ یەمەن یەکێ بۆ بەحرەین و یەکێ بۆ بەسرەو یەکی بۆ کوفەو لە مەدینەش یەکێکی هێشتەوە، ئەم کردەوەی عوسمان -خوای لێ رازی بێت- بەڵگەیەکی روونە لەسەر ئەوە کە ریوایەت بە نووسینیش دروستە (ورأي عبدالله بن عمر و يحيى بن سعيد و مالك ذلك جائزا) ئەم سیانەش ئەوەیان بە لاوە رەوایە (واحتج بعض أهل الحجاز في المناولة بحديث النبيﷺ حيث كتب لأمير السرية كتابا وقال: لا تقرأه حتى تبلغ مكان كذا وكذا، فلما بلغ ذلك المكان قرأه على الناس و أخبرهم بأمر النبيﷺ) هەندێ لە ئەهلی حیجاز بەڵگەی هێناوتەوە لەسەر راستی و دروستی (مناولة) بە حەدیسی پێغەمبەرﷺ کە نامەی ئەنووسی بۆ ئەمیری سریەیەک و دەیفەرموو: نەیخوێنیتەوە هەتا ئەگەیتە فلانە شوێن، ئینجا کاتێ ئەگەیشتە ئەو شوێنە دەیخوێندەوە بەسەر خەڵکیداو هەواڵی پێ ئەدان بە فەرمانەکەی پێغەمبەرﷺ. ئینجا لەم بارەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن و مەسعودەوە کە ئیبن و عەباس -خوا لێیان رازی بێت- (أن رسول اللهﷺ بعث بكتابه رجلا وأمره أن يدفعه إلى عظيم البحرين، فدفعه عظيم البحرين إلى كسرى، فلما قرأه مزقه، فحسبت أن ابن المسيب قال: فدعا عليهم رسول اللهﷺ أن يمزقوا كل ممزق) پێغەمبەرﷺ نامەی نووسی ودای بە پیاوێک کە بیدا بە پاشای بەحرەین و ئەویش بیدا بە کیسرا، ئینجا کاتێ کیسرای مەلعون خوێندیەوە نامەکەی دڕی. وە وا ئەزانم کە ئیبنولمسەییەب ئەفەرموێ. ئینجا پێغەمبەرﷺ نزای لێ کردن کە بە تەواوی بەرباد بێن و لەناو ببرێن. ئینجا لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە (قال: كتب النبيﷺ كتابا -أو أراد أن يكتب- فقيل له إنهم لايقرؤن كتابا إلا مختوما، فاتخذ خاتما من فضة نقشه: محمد رسول الله. كأني أنظر إلى بياضه في يده، فقلت لقتادة: من قال نقشه محمد رسول الله؟ قال: أنس) ئەنەس ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ نامەیەکی نووسی یان نیازی وابوو بینوسێ، ئینجا عەرزی کرا کە ئەوانە نامە ناخوێننەوە تا مۆر نەکرابێ، ئەویش بە هۆی ئەوەوە مۆرێکی بۆ خۆی فەراهەم هێنا لەزیو ئەقشەکەی ئەمە بوو (محمد رسول الله)، وائەزانم ئێستا وا بە بەرچاومەوە سەرنجی جوانییەکەی ئەدەم لە دەستیدا،

ئینجا گوتم بە قتادە کێ گوتی: ئەقشەکەی ئەوە بوو. ئەویش گوتی: ئەنەس.

*** *** ***

## ٨ـ بابُ مَنْ قَعَدَ حَيْثُ يَنْتَهِي بِهِ الْمَجْلِسُ، وَمَنْ رَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا

٦٦ـ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِاللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ أَنَّ أَبَا مُرَّةَ مَوْلَى عَقِيلِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَخْبَرَهُ عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَيْنَمَا هُوَ جَالِسٌ فِي الْمَسْجِدِ وَالنَّاسُ مَعَهُ إِذَا أَقْبَلَ ثَلاَثَةُ نَفَرٍ، فَأَقْبَلَ اثْنَانِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَذَهَبَ وَاحِدٌ. قَالَ: فَوَقَفَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَرَأَى فُرْجَةً فِي الْحَلْقَةِ فَجَلَسَ فِيهَا، وَأَمَّا الآخَرُ فَجَلَسَ خَلْفَهُمْ، وَأَمَّا الثَّالِثُ فَأَدْبَرَ ذَاهِبًا. فَلَمَّا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَلاَ أُخْبِرُكُمْ عَنِ النَّفَرِ الثَّلاَثَةِ؟ أَمَّا أَحَدُهُمْ فَأَوَى إِلَى اللَّهِ فَآوَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَاسْتَحْيَا فَاسْتَحْيَا اللَّهُ مِنْهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَأَعْرَضَ فَأَعْرَضَ اللَّهُ عَنْهُ».

(باب من قعد حيث ينتهي به المجلس) ئەمە بابێکە باسی ئەوە ئەکات کە هەرکەسێ هات بۆ ناو کۆڕو کۆمەڵێک دابنیشێ لە هەر شوێنێکدا جێگای ببێ (ومن رأى فرجة في الحلقة فجلس فيها) وە بابی ئەو کەسەیە کە ئەگەر بۆشایی‌یەکی بینی پڕی بکاتەوەو دانیشێ تێیدا.

پەیوەندی ئەم باس و بابە بە کیتابی عیلمەوە لەم ڕووەوەیە کە مەبەست بەو حەلقە حەلقەی عیلمەو مەجلیسی عیلمە، ئەمە ئەدەبێکە بۆ قوتابی کە بەرامبەر مامۆستاکەی بەو جۆرە ڕێزی هەبێ. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو مرەوە کە واقیدی لیثی هەواڵی دا کە ئەفەرموێ: (أن رسول اللهﷺ بينما هو جالس في المسجد والناس معه إذا أقبل ثلاثة نفر، فأقبل اثنان إلى رسول اللهﷺ وذهب واحد. قال: فوقفا على رسول اللهﷺ، فأما أحدهما فرأى فرجة في الحلقة فجلس فيها، وأما الأخر فجلس خلفهم، و أما الثالث فأدبر ذاهبا. فلما فرغ رسول اللهﷺ قال: «ألا أخبركم عن النفر الثلاثة؟ أما أحدهم فأوى إلى الله فآواه الله، وأما الآخر فاستحيا فاستحيا الله منه، وأما الآخر فأعرض فأعرض الله عنه») کاتێ پێغەمبەرﷺ لە مزگەوتدا دانیشتبوو لەناو هاوەڵەکانیدا سێ کەس هاتن لە دەرەوە دوانیان هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ و یەکێکیان ڕۆیشت و ئەو دووانەکە مانەوەو وەستان،

یەکێکیان شوێنێکی بینی تێیدا دانیشت ئەوی تریان لە پشتی مەجلیسەکەوە وەستاو سێیەم ڕۆیشت. ئینجا کاتێ پێغەمبەرﷺ لێ بوویەوە لە فەرمایشتی فەرمووی: با هەواڵی ئەم سێ کەسەتان پێ بدەم. یەکێکیان پەنای برد بە خواو خوایش پەنایدا، وە ئەوەی تری شەرمی کرد لەخواو خوایش پاداشتی دایەوە لەسەر شەرمەکەی، ئەوی تر ڕووی وەرچەرخان لە خواو خوایش ڕووی بەزەیی و میهرەبانی خۆی لێ وەرگێڕا. دیارە ئەوە بۆ کەسێکە کە عوزرو بیانوویەکی بە دەستەوە نەبێ بۆ ئەو ڕۆیشتنە.

لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ دروستە باسی خراپی خراپکاران بکرێ بۆ زەجرو مەنع لەو گوناهو خراپەیە. هەروەها فەزڵی کۆڕو مەجلیسی ئەهلی عیلم و زیکرو دانیشتنی لە مزگەوتدا لەگەڵ مامۆستاو فێرکەردا.

ئەم حەدیسە لە ژمارە (٤٧٤)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٩ـ بابُ قَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ «رُبَّ مُبَلَّغٍ أَوْعَى مِنْ سَامِعٍ»

٦٧ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا بِشْرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ عَوْنٍ عَنْ ابْنِ سِيرِينَ عَنْ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِيهِ ذَكَرَ النَّبِيَّ ﷺ قَعَدَ عَلَى بَعِيرِهِ وَأَمْسَكَ إِنْسَانٌ بِخِطَامِهِ -أَوْ بِزِمَامِهِ- قَالَ: أَيُّ يَوْمٍ هَذَا؟ فَسَكَتْنَا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ سِوَى اسْمِهِ. قَالَ: أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ؟ قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: فَأَيُّ شَهْرٍ هَذَا؟ فَسَكَتْنَا حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، فَقَالَ: أَلَيْسَ بِذِي الْحِجَّةِ؟ قُلْنَا: بَلَى. قَالَ: فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ وَأَعْرَاضَكُمْ بَيْنَكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا، فِي بَلَدِكُمْ هَذَا، لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَإِنَّ الشَّاهِدَ عَسَى أَنْ يُبَلِّغَ مَنْ هُوَ أَوْعَى مِنْهُ.

(باب قول النبيﷺ «رب مبلغ أوعى من سامع») ئەمە بابێکە باسی فەرموودەیەکی پێغەمبەرﷺ دەکات کە فەرمویەتی: زۆر گوێگر هەیە تێگەیشتوو ترو وریاترە لە ڕاگەیەنەر، وە لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عبدالرحمنی کوڕی ئەبوبەکرەوە ئەویش لە باوکییەوە کە پێغەمبەرﷺ (قعد على بعيره و أمسك إنسان بخطامه -أو بزمامه-) دانیشت بەسەر پشتی حوشترەکەیەوەو کەسێک جڵەوی حوشترەکەی گرت: (قال: أي يوم هذا؟ فسكتنا حتى

ظننا أنه سيسميه سوى اسمه. قال: أليس يوم النحر؟ قلنا: بلى. قال: فأي شهر هذا؟ فسكتنا حتى ظننا أنه سيسميه بغير اسمه، فقال: أليس بذي الحجة؟ قلنا: بلى. قال: فإن دماءكم و أموالكم و أعراضكم بينكم حرا كحرمة يومكم هذا، في شهركم هذا، في بلدكم هذا، ليبلغ الشاهد الغائب، فإن الشاهد عسى أن يبلغ من هو أوعى منه) فەرموی: ئەمە چ رۆژێکە؟ ئێمەش بێ دەنگ بووین هەتا گومانمان برد کە ناوێکی تری لێ ئەنێ. ئینجا فەرموی: ئایا رۆژی جەژنی قوربان نی‌یە؟ ئێمەش گوتمان: بەڵێ. ئینجا فەرموی: ئەم چ مانگێکە؟ ئێمەش بێ دەنگ بووین هەتا گومانمان برد کە ناوێکی تری لێ ئەنێ. ئینجا فەرموی: ئایا مانگی (ذي الحجة) نی‌یە؟ ئێمەش گوتمان: بەڵێ. فەرمووی: خوێنتان و ماڵتان و ناموستان حەرامە بۆ یەک وەک حەرامی ئەم رۆژەتان لەم شارەتانداو لەم مانگەدا. با ئامادە بوانتان رایبگەیەنێ بەوانەی ئامادە نین، چونکە هێندێ هەیە کە گوێگرو ئامادەیە شتی رائەگەیەنێ بە کەسێ کە ئەو تێگەیشتو ترە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٠٥، ١٧٤١، ٣١٩٧، ٤٤٠٦، ٤٦٦٢، ٥٥٥٠، ٧٠٧٨، ٧٤٤٧)دا دووبارە بووەتەوە.

***     ***     ***

## ١٠- بابُ الْعِلْمِ قَبْلَ الْقَوْلِ وَالْعَمَلِ،

لِقَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ﴾ (محمد:١٩) فَبَدَأَ بِالْعِلْمِ، وَأَنَّ الْعُلَمَاءَ هُمْ وَرَثَةُ الأَنْبِيَاءِ، وَرَّثُوا الْعِلْمَ، مَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ، وَمَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَطْلُبُ بِهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ. وَقَالَ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ﴾ (فاطر:٢٨) وَقَالَ: ﴿وَمَا يَعْقِلُهَا إِلاَّ الْعَالِمُونَ﴾ (العنكبوت:٤٣) ﴿وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ﴾ (الملك:١٠) وَقَالَ: ﴿هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لاَ يَعْلَمُونَ﴾ (الزمر:٩). وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ «مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ». وَإِنَّمَا الْعِلْمُ بِالتَّعَلُّمِ. وَقَالَ أَبُو ذَرٍّ: لَوْ وَضَعْتُمُ الصَّمْصَامَةَ عَلَى هَذِهِ -وَ أَشَارَ إِلَى قَفَاهُ- ثُمَّ ظَنَنْتُ أَنِّي أُنْفِذُ كَلِمَةً سَمِعْتُهَا مِنَ النَّبِيِّ ﷺ قَبْلَ أَنْ تُجِيزُوا عَلَيَّ لأَنْفَذْتُهَا. وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كُونُوا رَبَّانِيِّينَ حُكَمَاءَ فُقَهَاءَ. وَيُقَالُ: الرَّبَّانِيُّ الَّذِي يُرَبِّي النَّاسَ بِصِغَارِ الْعِلْمِ

قَبْلَ كِبَارِهِ.

***　***　***

## ١١ـ بابُ مَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَخَوَّلُهُمْ بِالْمَوْعِظَةِ وَالْعِلْمِ كَي لاَ يَنْفِرُوا

٦٨ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَخَوَّلُنَا بِالْمَوْعِظَةِ فِي الأَيَامِ كَرَاهَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٧٠، ٦٤١١)دا دووبارە بووەتەوە.

٦٩ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بنُ سَعِيْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو التَّيَّاحِ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا، وَبَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا».

ئەم حەدیسە لە ژمارەی (٦١٢٥)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب ما كان النبي ﷺ يتخولهم بالموعظة والعلم كي لا ينفروا) ئەمە بابێکە لە بارەی ئەوەوە کە پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ئامۆژگاری و عیلمی فێری یارانی نەنەکرد، بەڵکو لەناو بەناودا خەریک ئەبوو لە گەڵیاندا لەبەر ئەوەی بێ تاقەت نەبن و نەتارێن. وەک ئەم دەقی حەدیسە روونی ئەکاتەوە کە ئیبن و مسعود ئەیهێنێ: (كان النبي ﷺ يتخولنا بالموعظة في الأيام كراهة السآمة علينا) لە تەرجەمەکەدا وتەی (والعلم) هەیە، هەرچەندە موعظە عیلمیش ئەگرێتەوە، بەڵام بە تایبەتی لە حەدیسەکەدا هەر موعظە هەیەو بە قیاس عیلمیشی بۆ زیاد کرد.

پەیوەندی ئەم حەدیسە بە پێشەوە لەم بارەوەیە کە وتەی (رباني) بۆ دووبار دەست ئەدات: بارێکیان بریتی یە لە تربیەو تێگەیاندن، ئەوەش عیلم و فێرکردنە.

٦٩ـ حدثنا محمد بن بشار قال: حدثنا يحيى بن سعيد قال: حدثنا شعبة قال: حدثني أبو التياح عن أنس عن النبي ﷺ قال: «يسروا ولا تعسروا، وبشروا ولا تنفروا».

ئاسانی بەکار بێنن نەک زۆرە زمایی و ناڕەحەتی ، مژدە دەر بن بە خەڵکی نەک تارێن و تۆرێنەری خەڵک بن.

***　***　***

## ١٢ـ باب من جعل لأهل العلم أياما معلومة

٧٠ـ حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ عَبْدُاللهِ يُذَكِّرُ النَّاسَ فِي كُلِّ خَمِيسٍ، فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: يَا أَبَا عَبْدِالرَّحْمَنِ لَوَدِدْتُ أَنَّكَ ذَكَّرْتَنَا كُلَّ يَوْمٍ. قَالَ: أَمَا إِنَّهُ يَمْنَعُنِي مِنْ ذَلِكَ أَنِّي أَكْرَهُ أَنْ أُمِلَّكُمْ، وَإِنِّي أَتَخَوَّلُكُمْ بِالْمَوْعِظَةِ كَمَا كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَخَوَّلُنَا بِهَا مَخَافَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا.

(باب من جعل لأهل العلم أياما معلومة) ئەمە بابێکە لەبارەی ئەوەوە کە چەند رۆژێک دیاری بکرێ بۆ فێرکردن. وە لەم بارەیەوە ئەبو وائل ئەڵێ: (کان عبدالله یذکر الناس في کل خمیس، فقال له الرجل: یا أبا عبدالرحمن لوددت أنك ذکرتنا کل یوم) عەبدوڵای کوری مەسعود باوی وابوو هەموو رۆژێکی پێنج شەممە فێری ئەکردین، ئینجا پیاوێک گوتی: ئەی ئەبو عبدالرحمن بە راستی من پێم خۆشە کە هەموو رۆژێک دەرس و فێربوونمان بکەیت. ئەویش فەرمووی: (قال: أما إنه یمنعني من ذلك أني أکره أن أملکم) ئاگاداربن ئەوەی کە بەرگری من دەکات لەوە ئەوەیە کە پێم ناخۆشە بێ تاقەتتان بکەم (و إني أتخولکم بالموعظة کما کان النبي ﷺ یتخولنا بها مخافة السآمة علینا) وە منیش ناوبەناو ئامۆژگاریتان ئەکەم هەروەک پێغەمبەر ﷺ ناوبەناو ئامۆژگاری ئەکردین لە ترسی ئەوەی ئەوەک بێ تاقەت بین.

پەیوەندی ئەم بابەش بە پێشەکەیەوە ئاشکرایەو بەڵام وەک چەند جارێ گوتمان ئیمامی بوخاری باوی وایە لە هەر باسێکدا هەر بەڵگەیەکی دەست کەوتبێ هێناویەتی بۆ بەهێز کردنی باس و مەبەستەکە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣١١٦، ٣٦٤١، ٧٣١٢، ٧٤٦٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٣ـ بابُ مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ

٧١ـ حَدَّثَنَا سَعِيدُ بنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا ابنُ وَهْبٍ عَنْ يُونُسَ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: قَالَ حُمَيْدُ بنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ سَمِعْتُ مُعَاوِيَةَ خَطِيباً يَقُولُ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ يُرِدِ اللهُ بِهِ خَيْراً يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ. وَإِنَّمَا أَنَا قَاسِمٌ، وَاللهُ يُعْطِي. وَلَنْ تَزَالَ هَذِهِ الأُمَّةُ قَائِمَةً عَلَى

أمْرِ اللهِ لاَ يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ».

وەک ئەم بابەش کە دێت و وێنەی تێپەڕی کرد، بەڵام لێرە ئەم زیادەشی تێدایە کە ئەفەرموێ: لە حمیدەوە کە ئەفەرموێ: (سمعت معاوية خطيبا يقول: سمعت النبيﷺ يقول: «من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين. و إنما أنا قاسم، والله يعطي. ولن تزال هذه الأمة قائمة على أمر الله لا يضرهم من خالفهم حتى يأتي أمر الله»).

ئەم حەدیسە چەند حوکم و بڕیارێکی لێ وەرئەگیرێ:

١) لە راستیدا هەموو شت بە دەست خوایە.

٢) فێربوونی زانینی ئایین پێویستە بۆ موسڵمان.

٣) ئەم ئوممەتە بێ خاوەن و تێکۆشەر نابێ لە هەموو چەرخێکدا پارێزەری هەر ئەبێ هەبێ.

ئەو کاتەی کە موسڵمانان نامێنن ئەو کاتەیە بایەک دێت گیانی هەموو موسڵمانێک ئەکێشێ و هەر بێ باوەڕ ئەمێنێ و خوا ئەم جیهانە ناهێڵێ.

ئینجا ئەم کۆمەڵە پارێزەرە لازم ناکات کۆبنەوە لە شوێنێکدا، بە کورتی ئەم ئایینە شێوە راستەقینەکەی هەر ئەمێنێ نەک وەک ئایین و شەریعەتەکانی تر کە شێوە راستەقینەکەیان نەما بە تەواوی.

*** *** ***

## ١٤ـ بابُ الْفَهْمِ فِي الْعِلْمِ

٧٢ـ حَدَّثَنَا عَلِيٌّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ أَبِي نَجِيحٍ عَنْ مُجَاهِدٍ قَالَ: صَحِبْتُ ابْنَ عُمَرَ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلَمْ أَسْمَعْهُ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللهِﷺ إِلاَّ حَدِيثًا وَاحِدًا قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّﷺ فَأُتِيَ بِجُمَّارٍ فَقَالَ: «إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً مَثَلُهَا كَمَثَلِ الْمُسْلِمِ. فَأَرَدْتُ أَنْ أَقُولَ هِيَ النَّخْلَةُ، فَإِذَا أَنَا أَصْغَرُ الْقَوْمِ فَسَكَتُّ، قَالَ النَّبِيُّﷺ: هِيَ النَّخْلَةُ».

(باب الفهم في العلم) ئەمە بابی چواردەیەمە لە بارەی گەورەیی زانینەوە، لەم بارەیەوە ئەم فەرمودەیە ئەهێنێ لە مجاهدەوە ئەویش لە ئیبن وعومەرەوە -خوایان لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: لەگەڵ ئیبن و عومەر رۆیشتم بۆ مەدینە لێم نەبیست هیچ حەدیسێک بهێنێ بێجگە لەم حەدیسە: (قال: كنا عند النبيﷺ فأتي بجمار فقال: «إن من الشجر

شجرة مثلها كمثل المسلم) له خزمەت پێغەمبەردا بووینﷺ جمارێکیان (کەفی دار خورما) هێنایە خزمەتی و پێی فەرمو لەناو درەختاندا درەختێک هەیە وێنەی موسڵمانە. ئەفەرموێ: (فأردت أن أقول هي النخلة، فإذا أنا أصغر القوم فسكت) منیش ویستم بڵێم ئەو درەختە دار خورمایە، لەبەر ئەوەی من لە گوێگران منداڵ تر بووم شەرمم کرد نەم گوت (قال النبيﷺ: هي النخلة) پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەو درەختە دار خورمایە. ئیبن و عومەر وەک باوکی -خوایان لێ رازی بێت- حەدیسیان ریوایەت نەدەکرد لە ترسی زیادو کەم و کوڕی، هەروەها کۆمەڵێکی تریش لە هاوەڵان. بەڵام ئەگەڵ ئەوەدا ئیبن وعومەر حەدیسی زۆر ریوایەت دەکات لەبەرئەوەی پرسیاری زۆری لێ دەکراو داوای فتوای لێ دەکرا، وە پەیوەندی بە بابەکەوە ئەمەیە کە تێگەیشتن و زیرەکی بۆ موسڵمان شتێکی زۆر پەسەندە، وە شەرم کردن لە گەورە شتێکی شیرینە. ئەو تێگەیشتنەی وەک تێگەیشتنەکەی خەلیفەی یەکەم -خوای لێ رازی بێت- وایە کە کاتێ پێغەمبەرﷺ فەرموی: بەندەیەک لە بەندەکانی خوا سەربەست کراوە بۆ مانەوە لە دنیادا یا رۆیشتن بۆ حوزوری خوا لەوێدا خەلیفە گریاو فەرموی: باوک و باپیرمان بە قوربانت بێت، خەڵکی سەریان سوڕما ئەو حاڵی بوو کە ئەو بەندەیە خۆیەتی. ئەو سەعید ئەفەرموێ: کەواتە ئەبوبەکر زاناترمان بوو. ئەم حەدیسە پێش کەوت لە سەرەتای بابی عیلمەوە، بەڵام بە پێی باوی ئیمامی بوخاری لێرەشدا بە پێی مەرجی خۆی دووبارەی کردەوە.

***　　***　　***

## ١٥- بابُ الإغتِبَاطِ في العِلمِ والحِكْمَةِ،

وَقَالَ عُمَرُ: تَفَقَّهُوا قَبْلَ أنْ تُسَوَّدُوا. قَالَ أَبُو عَبْدِاللهِ: وَبَعْدَ أنْ تُسَوَّدُوا. وَقَدْ تَعَلَّمَ أصْحَابُ النَّبِيِّ فِي كِبَرِ سِنِّهِمْ.

٧٣- حَدَّثَنَا الْحُمَيْدِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي إِسْمَاعِيلُ بنُ أَبِي خَالِدٍ -عَلَى غَيْرِ مَا حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ- قَالَ: سَمِعْتُ قَيْسَ بنَ أَبِي حَازِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَاللهِ بنَ مَسْعُود قَالَ: قَالَ النَّبِيُّﷺ «لاَ حَسَدَ إلاَّ فِي اثْنَتَيْنِ: رَجُلٌ آتَاهُ اللهُ مَالاً فَسُلِّطَ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الْحَقِّ، وَرَجُلٌ آتَاهُ اللهُ الْحِكْمَةَ فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا».

(باب الأغتباط في العلم والحكمة) ئەمە بابی خۆزگە خواستنە بە زانین و لێزانین و کاردروستی (وقال عمر: تفقهوا قبل أن تسودوا) وە بابی ئەوەیە کە فاروق -خوای لێ رازی بێت-ئەفەرموێ: خۆتان زانا بکەن پێش ئەوەی پیر ببن و گەورە ببن (قال أبو عبدالله:وبعد أن تسودوا) ئیبن و مەسعودیش ئەفەرموێ: لە پاش ئەوەی کە پیر ببن و گەورە ببن (وقد تعلم أصحاب النبي في كبر سنهم) هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ خۆیان زانا کرد لە کاتی پیریاندا. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن و مەسعودەوە کە (قال: قال النبيﷺ «لا حسد إلا في اثنتين: رجل آتاه الله مالا فسلط على هلكته في الحق، ورجل آتاه الله الحكمة فهو يقضي بها ويعلمها») حەسوودی نی‌یە مەگەر بۆ دوو کەس: یەکێک خوا ماڵی بداتێ و ئەویش بەختی بکات لە شتی حەقدا. وە پیاوێک خوا زانین و لێزانی‌یەکی پێ ببەخشێ، ئەویش رەفتاری پێ بکات و خەڵکیشی پێ زانا بکات.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٤٠٩، ٧١٤١، ٧٣١٦)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٦ـ بابُ مَا ذُكِرَ فِي ذِهَابِ مُوسَىﷺ فِي الْبَحْرِ إِلَى الْخَضِرِ وَقَوْلِهِ تَعَالَى: ﴿هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِي مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا﴾.

٧٤ـ حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بنُ غُرَيْرٍ الزُّهْرِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي عَنْ صَالِحٍ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ حَدَّثَ أَنَّ عُبَيْدَاللهِ بنَ عَبْدِاللهِ أَخْبَرَهُ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ تَمَارَى هُوَ وَالْحُرُّ بنُ قَيْسِ بنِ حِصْنٍ الفَزَارِيُّ فِي صَاحِبِ مُوسَى، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: هُوَ خَضِرٌ. فَمَرَّ بِهِمَا أُبَيُّ بنُ كَعْبٍ فَدَعَاهُ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي تَمَارَيْتُ أَنَا وَصَاحِبِي هَذَا فِي صَاحِبِ مُوسَى الَّذِي سَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، هَلْ سَمِعْتَ النَّبِيَّﷺ يَذْكُرُ شَأْنَهُ؟ قَالَ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: «بَيْنَمَا مُوسَى فِي مَلأٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلْ تَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنْكَ؟ قَالَ مُوسَى: لاَ. فَأَوْحَى اللهُ إِلَى مُوسَى: بَلَى، عَبْدُنَا خَضِرٌ. فَسَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ اللهُ لَهُ الْحُوتَ آيَةً، وَقِيلَ لَهُ: إِذَا فَقَدْتَ الْحُوتَ فَارْجِعْ فَإِنَّكَ سَتَلْقَاهُ. وَكَانَ يَتَّبِعُ أَثَرَ الْحُوتِ فِي الْبَحْرِ فَقَالَ لِمُوسَى فَتَاهُ: أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي

نَسِيْتُ الْحُوتَ وَمَا أَنسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ. قَالَ: ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي. فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا. فَوَجَدَا خَضِراً، فَكَانَ مِنْ شَأْنِهِمَا الَّذِي قَصَّ اللَّهُ عَزَّوَجَلَّ فِي كِتَابِهِ»

(باب ما ذكر في ذهاب موسى ﷺ في البحر إلى الخضر) ئەمە بابی ئەوەیە کە باس کراوە لە بارەی ڕۆیشتنی موسا ﷺ لە دەریادا بۆ لای خضر (وقوله تعالى: ﴿هل أتبعك على أن تعلمني مما علمت رشدا﴾) وە بابی ئەوەیە کە خوای گەورە ئەگێڕێتەوە لە زمانی موساوە کە گوتی بە خضر با دوات بکەوم لەسەر ئەوەی فێری ئەو زانین و ڕێگە ڕاستەم بکەیت کە فێر کراوی.

ئەم بابە بۆ هاندانە لەسەر زەحمەت کێشان لەڕێگەی فێر بوونی عیلم و دەست کەوتنی عیلم، کەواتە پەیوەندی بەهێزە بە بابی پێشەوە کە عیلم و زانینی کرد بە هۆی ئاوات و ئامانج. واتە ئەم بابە هەرچۆنێ بە گشتی پەیوەندی هەیە بە کیتابی عیلمەوە ئەم پەیوەندییە تایبەتییەشی هەیە بە بابی پێشووەوە.

ئینجا با گوێ بگرین لەم حەدیسەی کە لە ئیبن و عەباسەوە هاتووە -خوایان لێ ڕازی بێت- (أنه تمارى هو الحر بن قيس بن حصن الفزاري في صاحب موى) کە ئەو و حوڕی کوڕی قەیسی فەزاری ئیختلافیان بووە لەم هاوەڵی موسادا بەم شێوەیە (قال ابن عباس: هو خضر. فمر بهما أبي بن كعب فدعاه ابن عباس فقال: إني تماريت أنا وصاحبي هذا في صاحب موسى الذي سأل موسى السبيل إلى لقيه) کە ئیبن عەباس فەرموی: ئەو (خضر)ە، لەو کاتەدا (ئوبەی کوڕی کەعب) ڕابورد بە لایاندا، ئیبن عەباس بانگی کردو پێی فەرمو: من ئەم هاوەڵەم خیلافمان هەیە لە هاوڕێیەکی موسادا، ئەوەی کە موسا ئەویست پێ بگات (هل سمعت النبي ﷺ يذكر شأنه؟ قال: نعم، سمعت رسول الله ﷺ يقول: «بينما موسى في ملأ من بني إسرائيل إذا جاءه رجل فقال: هل تعلم أحدا أعلم منك؟ قال موسى: لا.) گوتی: بەڵێ بیستم لە پێغەمبەر ﷺ ئەیفەرمو: جارێکیان موسا لەناو کۆمەڵێکی ئیسرائیلییەکاندا بوو پیاوێک پرسیاری لێ کرد: ئایائەزانی هیچ کەسێک لە تۆ زاناتر بێت؟ وتی: نەخێر. (فأوحى الله إلى موسى: بلى، عبدنا خضر) خوایش سروشی کرد بۆ لای موسا: نەخێر تۆ زانا تر نیت بەڵکو بەندەی ئێمە کە (خضر)ە ئەو لە تۆ زانا ترە (فقال

موسى السبيل إليه، فجعل الله له الحوت آية ) ئينجا موسا داواى كرد كه ئەو بەندەيەى دەست كەوێ، خواى گەورەش ماسى‌يەكى كرد بە نيشانە بۆى (وقيل له: إذا فقدت الحوت فرجع فإنك ستلقاه) پێى وترا: هەركاتێ ئەو ماسى‌يەت لە بیر چوو بگەڕێرەوە بۆ ئەو شوێنە ئەو بەندە زانات دەست ئەكەوێ (وكان يتبع أثر الحوت في البحر فقال لموسى فتاه: أرأيت إذ أوينا إلى الصخرة فإني نسيت الحوت وما أنسانيه إلا الشيطان أن أذكره. قال: ذلك ما كنا نبغي. فارتدا على آثارهما قصصا. فوجدا خضرا، فكان من شأنهما الذي قص الله عزوجل في كتابه) ئينجا هاوەڵەكەى موسا گوتى ئەزانى كاتێ گەیشتینە لاى بەردەكە لەوێدا ماسى‌يەكەم لە بیر چوو، وە هەر شەيتان لە بیرى بردمەوە، موساش فەرموى: ئەوە ئەو شوێنەیە كە ئێمە ئەمانەوێ، ئينجا گەڕانەوە بە دواى خۆياندا و لەو شوێنەدا (خضر)يان دەست كەوت و ئيتر دەنگ و باسيان ئەوەيە كە خوا لە قورئانەكەيدا باسى ئەفەرموێ.

لەم حەديسە سەحيحەوە چەند شتێك دەركەوت كە ئەو موسايە براى هارونە خوا رەوانەى كردن بۆ ئيسرائيلى‌يەكان، هەركەسێ بڵێ موسايەكى ترە پێچەوانەى ئەم حەديسە ئەكات. هەروەها لێى وەرئەگيرێ كە ئەو بەندە زانايە (خضر)ە نەك كەسێكى تر كە لە كتێبە پرپوچەكاندا نووسراوە، هەركاتێ كارێكى وا بينرا خيلافى شەرع بێت ئەبێ ئينكارى بكرێت، وە بەندەى خوا یا پێغەمبەرێكى ناواش بێت نابێت بە پێى بۆچوونى خۆى بڕيار بدات، بەڵكو ئەبێ هەموو كاروبارى بگێڕێتەوە بۆ لاى فەرمان و بەرنامەى خوا. وە (خضر) پێغەمبەر بووبێ يان وەلى و پياو صالح كە خوا زاناى كردبێ بەو كارە نهێنى‌يانەى كە لەو داستانەدا هەيە، ئەو ئاگادار كردنەوە بەڵگە نى‌يە لەسەر ئەوە كە ئەو رادەو پلەى لە موسا گەورەترە. هەرگيز نابێ قياسى هيچ كەسێكى تر بكرێتە سەر ئەو زانا كراوەو نابێ بڵێين ئەو پياوە چاكە خۆى ئەزانێ و ئێمە نازانين ئەوە هەڵەيەكى زۆر گەورەيە، چونكە ئەو هاوەڵى موسا خوا هەواڵى دا كە ئەو بەندەيە بەو جۆرەيە زۆركەس لەو بارەيەوە ئەكەونە هەڵەو قياسى پياوچاكانى تر ئەكەنە سەر ئەو بەندەى خوا.

ئەم حەديسە لە ژمارەكانى: (٧٨، ١٢٢، ٢٢٦٧، ٢٧٢٨، ٣٢٧٨، ٣٤٠٠، ٣٤٠١، ٤٧٢٥، ٤٧٢٦، ٤٧٢٧، ٦٦٧٢، ٧٤٧٨)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٧ـ باب قَوْلِ النَّبيِّ ﷺ: «اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْكِتَابَ»

٧٥ـ حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالوَارِثِ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ عَنْ عِكْرِمَةَ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: ضَمَّنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ وَقَالَ: «اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْكِتَابَ».

(باب قول النبي ﷺ: «اللّهم علمه الكتاب») ئەمەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ بە ئیبن عەباس -خوا لێیان رازی بێت- ئەی خوایە زانای بکەو فێری نامەی خۆتی بکە کە قورئانە. پەیوەندی بە حەدیسی پێشووەوە ئەمەیە بە بۆنەی ئەو زانا کردنەوەو تراوی پێغەمبەرەوە راو قسەکەی سەرکەوت بەسەر رای حوری کوری قەیسدا کە لە حەدیسی پێشوودا هات. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە کە ئەفەرموێ: (ضمني رسول الله ﷺ وقال: «اللّهم علمه الكتاب») پێغەمبەر ﷺ گوشیمی بە خۆیەوەو فەرموی ئەی خوایە زانای بکەو فێری نامەی خۆتی بکە.

لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە ریوایەتی نابالغیش وەرئەگیرێ، چونکە ئیبن و عەباس لەوکاتەدا تەمەنی نەگەیشتبووە ١٥ساڵ وەک لە بابی ١٨دا وەرئەگیرێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٤٣، ٣٧٥٦، ٧٢٧٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٨ـ باب مَتَى يَصِحُّ سَمَاعُ الصَّغِيرِ؟

٧٦ـ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بنُ أَبِي أُوَيْسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِاللهِ ابْنِ عُتْبَةَ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَقْبَلْتُ رَاكِبًا عَلَى حِمَارٍ أَتَانٍ -وَأَنَا يَوْمَئِذٍ قَدْ نَاهَزْتُ الإِحْتِلَامَ- وَرَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي بِمِنًى إِلَى غَيْرِ جِدَارٍ. فَمَرَرْتُ بَيْنَ يَدَيْ بَعْضِ الصَّفِّ، وَأَرْسَلْتُ الأَتَانَ تَرْتَعُ فَدَخَلْتُ فِي الصَّفِّ، فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٩٣، ٨٦١، ١٨٥٧، ٤٤١٢)دا دووبارە بووەتەوە.

٧٧ـ حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بنُ يُوسُفَ قَالَ حَدَّثَنَا أَبُو مُسْهِرٍ قَالَ حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بنُ حَرْبٍ حَدَّثَنِي الزُّبَيْدِيُّ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ مَحْمُودِ بنِ الرَّبِيعِ قَالَ: عَقَلْتُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ مَجَّةً مَجَّهَا فِي وَجْهِي وَأَنَا ابْنُ خَمْسِ سِنِينَ مِنْ دَلْوٍ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٧٩، ٨٣٩، ١١٨٥، ٦٣٥٤، ٦٤٧٢)دا دووبارە

بووەتەوە.

(باب متى يصح سماع الصغير؟) ئەمە بابی ئەوەیە ئایا منداڵ کەی ئیعتیبار ئەکرێ بە ریوایەتی؟ وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ کە ئەفەرموێ: (أقبلت راكبا على حمار أتان -وأنا يومئذ قد ناهزت الاحتلام-) بە سواری گوێ درێژێ هاتم لە کاتێکدا من نزیک بووم لەوەی بلوغم بێ و هێشتا بلوغم نەبوو بووم، (ورسول اللهﷺ يصلي بمني إلى غير جدار) لە کاتێکدا پێغەمبەرﷺ نوێژی دەکرد بەبێ ئەوەی دیوارێکی لەبەردەمدا بێت، واتە ئەوەی کە پێی ئەوترێ (سترە)ی دانەنابوو (فمررت بين يدي بعض الصف، وأرسلت الأتان ترتع فدخلت في الصف، فلم ينكر ذلك علي) ئینجا منیش بە بەردەم هەندێ لە سەفەکاندا گوزەرم کردو گوێ درێژەکەم بەرەڵا کرد بلەوەڕێ، ئینجا خۆم چوومە ریزەکەوەو ئەو کارانەم لێ نەگیرا. واتە نە لە کاتی نوێژەکەدا بە ئیشارەت و نە لە پاش نوێژەکە بە گوتن. وە وەرئەگیرێ رابوردن بە بەردەم نوێژکەردا نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە، هەروەها وەرئەگیرێ مەسئەلەحەتێکی ناشکرا پێش ئەخرێ لە کارێکی خراپی بچووک وەک لێرەدا چوونە ناو ریزی نوێژەکە چاک ترو گەورەترە لەو کارە خراپە بچووکە کە گوزەر کردنە بەبەردەم نوێژدا، وە هەروەها ئەمەش وەرئەگیرێ لە ئەهلیەتی تەواو مەرج نییە بۆ هەڵگرتنی ریوایەت و شایەتی، بەڵکو مەرجە بۆ شایەتی دان و ریوایەتی کردنەکە لە کاتی ئەهلیەتی تەواودا. وە هەروەها عبدو فاسق و کافر. ئینجا کە گوتمان مەبەست بە منداڵ نابالغە ئیتر رەخنە ناگیرێ بەوەی حەدیسەکە نارێکە لەگەڵ ترجمەکەدا.

ئینجا بە بۆنەی ئەو حەدیسەوە کە تێپەڕی کرد ئەم حەدیسەش ئەهێنێ کە ئەهلیەتی تەواو مەرج نییە بۆ هەڵگرتنی شایەتی و ریوایەت ئەفەرموێ: (عقلت من النبيﷺ مجة مجها في وجهي و أنا ابن خمس سنين من دلو) لە بیرمە پێغەمبەرﷺ هێندێ ئاوی لە دۆڵچەیەک کردە دەمی و کردی بەناوچاومدا. ئەم حەدیسە محمدی کوڕی رەبیع ئەڵێ: کە تەمەنی پێنج ساڵ بووە. ئینجا ئەو ئاوەی کردی بە دەم و چاویدا یان مەبەستی ملاتەفەو خۆشی بووە لەگەڵ ئەو منداڵەدا یان مەبەستی پیرۆزی و فەڕو بەرەکەتی ئەو ئاوە پیرۆزە بووە بۆ ئەو منداڵە وەک باو وابووە لەگەڵ منداڵەکانی هاوەڵەکانی. بە هەرحاڵ تەبەرووک کردن بە هەر شتێ کە پەیوەندی بووبێ پێیەوە وەک لە سوڵحی حودەیبییەدا مووەکانی دابەش کرد

بەسەرهاوەڵەکانداو ئەگەر تفێکی بکردایە دەست بەجێ هاوەڵەکان دەستیان بۆ ئەگرتەوەو ئەیانسوی لە دەم و چاوی خۆیان، هەروەها لە جەنگی ئوحوددا سنانی کوڕی مالک بە دەم خوێنەکەی لستەوەو پێی فەرموو بیتفەرەوە ئەویش ئەیلستەوەو قوتی ئەدا.

لەگەڵ ئەم هەموو حەدیسە سەحیحانەدا هێندێ تێنەگەیشتوو بێزاری دەرئەبڕی و ئەومەندە ئەزانە ئەو جۆرە شتانە بە شیرک دائەنێ!! نازانن کە هەرکارێ لە پێغەمبەرەوەﷺ بۆمان هات ئەبێ بە مل کەچیەوە باوەڕی پێ بکەین. ئەو فەڕو بەرەکەتەش لەبەر ئەوەیە کە پێغەمبەری نازیزﷺ هۆو مایەی بەزەیی و میهرەبانی خوایە، کەواتە ئەو تبرک کردنە هەر ئەگەڕێتەوە بۆ بەندەیی خواو پەرستنی خوا. بەم بەڵگەیانە زانایانی ئیسلام ئەفەرمون تبرک کردن بە سالحانیش بەو نیازە کە گوتمان شتێکی شەرعیە.

*** *** ***

## ١٩ـ بابُ الْخُرُوجِ فِي طَلَبِ الْعِلْمِ

وَرَحَلَ جَابِرُ بنُ عَبْدِاللهِ مَسِيرَةَ إِلَى عَبْدِاللهِ بنِ أُنَيْسٍ فِي حَدِيثٍ وَاحِدٍ.

٧٨ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْقَاسِمِ خَالِدُ بنُ خَلِيٍّ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ حَرْبٍ قَالَ: قَالَ الأَوْزَاعِي أَخْبَرَنَا الزُّهْرِيُّ عَنْ عُبَيْدِاللهِ بنِ عَبْدِاللهِ بنِ عُتْبَةَ بنِ مَسْعُودٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ تَمَارَى هُوَ وَالْحُرُّ بنُ قَيْسِ بنِ حِصْنٍ الْفَزَارِيُّ فِي صَاحِبِ مُوسَى، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: هُوَ خَضِرٌ. فَمَرَّ بِهِمَا أُبَيُّ بنُ كَعْبٍ فَدَعَاهُ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقَالَ: إِنِّي تَمَارَيْتُ أَنَا وَصَاحِبِي هَذَا فِي صَاحِبِ مُوسَى الَّذِي سَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، هَلْ سَمِعْتَ النَّبِيَّﷺ يَذْكُرُ شَأْنَهُ؟ فَقَالَ أُبَيٌّ: نَعَمْ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِﷺ يَقُولُ: «بَيْنَمَا مُوسَى فِي مَلأٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلْ تَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنْكَ؟ قَالَ مُوسَى: لاَ. فَأَوْحَى اللهُ إِلَى مُوسَى: بَلَى، عَبْدُنَا خَضِرٌ. فَسَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ اللهُ لَهُ الْحُوتَ آيَةً، وَقِيلَ لَهُ: إِذَا فَقَدْتَ الْحُوتَ فَارْجِعْ فَإِنَّكَ سَتَلْقَاهُ. وَكَانَ يَتَّبِعُ أَثَرَ الْحُوتِ فِي الْبَحْرِ فَقَالَ لِمُوسَى فَتَاهُ: أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ. قَالَ: ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي. فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا. فَوَجَدَا خَضِرًا، فَكَانَ مِنْ شَأْنِهِمَا الَّذِي قَصَّ اللهُ عَزَّوَجَلَّ فِي كِتَابِهِ»

(باب الخروج في طلب العلم) ئەمە بابی دەرچوون و سەفەر کردنە بە دوای زانین و فێربوونی عیلمدا، لەبەر ئەوەی هەر دەقی حەدیسی پێشووەوە بەبێ زیادو کەم بەسەر حەدیسەکەدا تێپەڕ ئەکەین بەبێ تەفسیروتەرجەمە.

*** *** ***

## ٢٠ـ باب فَضْلِ مَنْ عَلِمَ وَ عَلَّمَ

٧٩ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ الْعَلاَءِ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادُ بنُ أُسَامَةَ عَنْ بُرَيْدِ بنِ عَبْدِاللهِ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِي مُوسَى عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ مِنَ الْهُدَى وَالْعِلْمِ كَمَثَلِ الْغَيْثِ الْكَثِيرِ أَصَابَ أَرْضًا. فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ قَبِلَتِ الْمَاءَ فَأَنْبَتَتِ الْكَلأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَكَانَتْ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتِ الْمَاءَ فَنَفَعَ اللهُ بِهَا النَّاسَ فَشَرِبُوا وَسَقَوا وَزَرَعُوا، وَأَصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أُخْرَى إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لاَ تُمْسِكُ مَاءً وَلاَ تُنْبِتُ كَلأً. فَلِذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقِهَ فِي دِينِ اللهِ وَنَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ فَعَلِمَ وَعَلَّمَ، وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ». قَالَ أَبُو عَبْدِاللهِ قَالَ إِسْحَاقُ: وَكَانَ مِنْهَا طَائِفَةٌ قَيَّلَتِ الْمَاءَ. قَاعٌ: يَعْلُوهُ الْمَاءُ، وَالصَّفْصَفُ: الْمُسْتَوِي مِنَ الأَرْضِ.

(باب فضل من علم و علّم) ئەمە بابی فەزڵ و رادەی بەرزی کەسێکە کە زانا بێت و خەڵکی فێری زانین بکات، وە لەم بابەدا شێوەی ئەو هیدایەت و زانینە باس ئەکات لەگەڵ شێوەو وێنەی جیاوازی خەڵکیدا بەرامبەر ئەو زانین و هیدایەتە. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە، ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە (قال: مثل ما بعثني الله به من الهدى و العلم) وێنەی ئەو هیدایەت و زانینەی کە خوا منی پێ رەوانە کردووە (کمثل الغیث الکثیر أصاب أرضا فکان منها نقیة قبلت الماء فأنبتت الکلأ والعشب الکثیر) وەک وێنەی بارانێکی زۆرو فراوانە کە ببارێ بەسەر زەوی و وڵاتێکدا، ئینجا هەندێ لەو زەوی و وڵاتە زەوییەکەی پاک و خاوێنە بە هۆی ئەوەوە ئاوەکە وەرئەگرێ و لەوەڕو گیاو رووەکی زۆر ئەڕوێنێ (ومنها أجادب) وە هەندێ لەو زەویانە وەرگری ئاو وبارانەکەن. لە ریوایەتی تردا (أخاذات) وەرگری ئاون (فنفع الله بها الناس فشربوا وسقوا وزرعوا) بە هۆی ئەوەوە ئاوی لێ ئەخۆنەوەو ئاوی ماڵاتی لێ ئەدەن و کشتوکاڵی لێ دەکەن.

(و أصابت منها طائفة أخرى إنما هي قيعان لا تمسك ماء ولا تنبت كلأ) وه ئەو ئاو و بارانە ئەدەن لە بەشێکی تر لە زەوی کە دەشت و ساراو شۆرن نە ئاو راگیر ئەکەن و نە گیاو لەوەڕ سەوز ئەکەن (فذلك مثل من فقه في دين الله ونفعه ما بعثني الله به فعلم و علم. ومثل من لم يرفع بذلك رأسا ولم يقبل هدى الله الذي أرسلت به) ئەوەی کە باس کرا چیرۆک و وێنەی کەسێکە کە زانا بێت لەئایینی خواو ئەوەی کە منی پێ رەوانە کراوم سوودی پێ بگەیەنێ بە هۆی ئەوەوە زانا بێ و خەڵکیش فێر بکات، چیرۆکیشە بۆ ئەوەی بە هیچ جۆر بەرز نەبێتەوەو ئەو هیدایەتەی کە منی پێ رەوانە کراوە وەرنەگرێ. (و قال أبو عبدالله قال إسحاق: وكان طائفة قيلت الماء. قاع: يعلوه الماء، والصفصف: المستوى من الأرض) ئەبو عبدالله واتە ئیمامی بوخاری لە ئیسحاقەوە هێندێ لەو زەویانە دەشتەو ئاوەکە بەرز ئەبێتەوە بەسەریدا، بە هەر حاڵ مەبەستە هەر یەکە.

*** *** ***

## ٢١-بابُ رَفْعِ الْعِلْمِ، وَظُهُورِ الْجَهْلِ.

وَقَالَ رَبِيعَةُ: لاَ يَنْبَغِي لأَحَدٍ عِنْدَهُ شَيْءٌ مِنَ الْعِلْمِ أَنْ يُضَيِّعَ نَفْسَهُ.

٨٠ـ حَدَّثَنَا عِمْرَانُ بنُ مَيْسَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَارِثِ عَنْ أَبِي التَّيَّاحِ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يُرْفَعَ الْعِلْمُ، وَيَثْبُتَ الْجَهْلُ، وَيُشْرَبَ الْخَمْرُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٨١، ٥٢٣١، ٥٥٧٧، ٦٨٠٨)دا دووبارە بووەتەوە.

٨١ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ شُعْبَةَ عَنْ قَتَادَةَ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: لأُحَدِّثَنَّكُمْ حَدِيثًا لاَ يُحَدِّثُكُمْ أَحَدٌ بَعْدِي، سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ أَنْ يَقِلَّ الْعِلْمُ وَيَظْهَرَ الْجَهْلُ، وَيَظْهَرَ الزِّنَا، وَتَكْثُرَ النِّسَاءُ، وَيَقِلَّ الرِّجَالُ، حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةً الْقَيِّمُ الْوَاحِدُ».

(باب رفع العلم، وظهور الجهل) ئەمە بابی ئەوەیە کە عیلم هەڵئەگیرێ و نەزانی دەرئەکەوێ و پەرە ئەسێنێ، لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە کە (قال: قال رسول الله ﷺ: «إن من أشراط الساعة أن يرفع العلم، ويثبت الجهل، ويشرب الخمر،

ویظهـر الزنا») هێندێ له نیشـانەکـانی رۆژی دوایی ئەمـەیە عـیلم هەڵنەگـیرێ و نەزانین دەرنەکەوێ و پەرە نەسێنێ و ئارەق نەخورێتەوەو زیناو داوێن پیسی ئاشکرا نەبێ.

لەم بارەیەوە زۆر شـتی تریش هاتووە کـە نیـشـانەی نزیکی رۆژی دوایی و نزیک کەوتنەوەیە لێی، رۆژی دوایی لە راستیدا نزیکە، چونکە بێگومان دێت و هەر شتێکیش وا بێ نزیکەو بە نزیک دائەنرێ بێجگە لەوەش ئەوەی کە ماوە لە تەمەنی دنیا هیچ چاونادا، کەواتە بەم شێوەش هەر نزیکە.

ئەم نیشـانانەی لەم حەدیسـەدا هاتووە بە چاو ئەبینرێ لەم چەرخەدا، ئەوەتا زۆر کـەم هەیە کە تێ بگات و کتێبی زانا راستەقینەکان بزانێ، ئەوەتا بە ئاشکرا دوکانی عەرەق خانە هەیەو ئەگەر موسـڵمـانێ دژی قسە بکات لەوانەیە بە شێت دەکرێ لەگەڵ ئەوەدا بێگانەکـان بۆیان دەرکەوت کە ئەو شتە پیسە گیان و ماڵ و سامان ئەفەوتێنێ. لیژنەی دەولی دروست کراوە بۆ بەرگری. هەروەها مەسەلەی زیناو داوێن پیسی لە زووەوە لە وڵاتی ئیسلامدا پەیدا بووە بە ئاشکرا لەم چەرخی نەفامی تازەدا کە زۆر پیس ترو بۆگەنترە لە چەرخی نەفامی کۆن، تا ئەو رادەیە ئەوان لەبەر ناموسیان -بە خەیاڵی خۆیان وایان ئەزانی پاراستنی ناموس وا ئەبێ- ئەو تاوانە گەورەیان ئەکردو ئافرەتیان زیندە بەچاڵ ئەکرد لەبەر ئەوەی نەک دووچاری داوێن پیسی بێن و کەس و کارو تایفەکەی شەرمەزار بکات، بەڵام لە چەرخی بیستەمی نەفامیدا رووت و قوتی ئەکەنەوەو ئەیرازێننەوەو ئەیکێشن بەناو خەڵکدا، بێجگە لەوەی هەرچی وسائلی ئیعلام هەیە هان ئەدات بۆ ئەو پیسییە. ئینجا با وا نەزانرێ ئەم جۆرە کارە پیسـانە کە هاتوون بە دژو پێچەوانەی ئیسـلام هەر ئەمێننەوەو پەرە ئەسێنن، نەخێر واقیع دەری ئەخـات کـە ئەمـانە نامێنێ ئەوەتا لەبەرەوە ئافرەتەکـان ئەگـەڕێنەوە بۆ رێگای پاکی شەرەفی باوک و باپیریان و پۆشاکی شیرینی حیجاب لەبەر ئەکەن. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسـەوە -خـوای لێ رازی بێت- (قال: لأحدثنكم حديثا لا يحدثكم أحد بعدي) ئەفەرموێ: سوێند بە خوا حەدیسێکتان بۆ باس ئەکەم هیچ کەس لە پاش من ئەم حەدیسەتان بۆ ناگێڕێتەوە (سمعت رسول اللهﷺ يقول: «من أشراط الساعة أن يقل العلم و يظهر الجهل، و يظهر الزنا، وتكثر النساء، ويقل الرجال، حتى يكون لخمسين امرأة القيم الواحد») لە پێغەمبەرمﷺ بیست ئەیفەرموو: لە نیشانەکانی هاتنی رۆژی دواییە کە عیلم کەم ئەبێت و جەهل زۆر ئەبێ و پەرە ئەسێنێ و زیناو داوێن پیسی ئاشکرا ئەبێ و

پیاوان کەم ئەبنەوەو ئافرەتان زۆر ئەبن، نیتر بە هۆی شەڕو شۆڕی زۆر کوشتنی پیاوان یان بەهۆی ئەوەوە زۆربەی منداڵان کچ ئەبن. بە هەرچۆنێ زۆری ئافـرەت بە بێ چاودێر مـایەی فەسادو تێکچوونی گەلە، ئەفەرموێ: هەتا وای لێ دێ پەنجا ئافرەت یەک چاودێری ئەبێ، ئایا مـەبەست بەدی هاتنی ئەو ژمـارەیەیە یان مـەبەست زۆری و فراوانی‌یە، بە هەرحاڵ وەک گوتمان زۆری ئافرەت بەبێ چاودێر هەر فەسادو شەڕی لێ پەیدا ئەبێ.

*** *** ***

## ٢٢- بابُ فَضْلِ الْعِلْمِ

٨٢- حَدَّثَنَا سَعِيْدُ بنُ غُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ حَمْزَةَ بنِ عَبْدِاللهِ بنِ عُمَرَ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ أُوتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ حَتَّى إِنِّي لأَرَى الرِّيَّ يَخْرُجُ فِي أَظْفَارِي، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بنَ الْخَطَّابِ» قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: «الْعِلْمَ».

(باب فـضـل العلم) ئەمـە بابی زیادە رادەو پلەی بەرزی عـیلمـە لەبەر ئەوەی ئەبێـتـە دووبارە کردنەوە لەگەڵ سەرەتای ئەم کیتابەدا فەرموی. ئەگەر یەک مەبەستیش بێ هەر رێکە، چونکە ئیمامی بوخاری باوی وایە هەر حەدیسێکی دەست کەوتبێ مادام لە چەند رێگەیەکەوە هاتبێ بۆ وێنە لێرەدا حەدیسەکە ئەچێتەوە سەر ابن عـمرو لەوێ حەدیسێ ئەهێنێ کە لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە. وە ئیـمـامی بوخـاری ئەم کـتـێـبەی هێناوە بۆ کـۆ کـردنەوەی پاراسـتنی سەرچاوەی دووەمی ئیـسلام کە سوننەتە، کەواتە پێویستـە هەر حەدیـسـێکی سەحیح دەست کەوتبێ ئەبێ باسی بکات. لەم بابەدا حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن عومەرەوە کە (قال: «بينا أنا نائم أوتيت بقدح لبن فشربت حتى إني لأرى الري يخرج في أظفاري) جارێک من خەوتبوم لە خەوەکەمدا پەرداخێک شیریان بۆ هێنام ومنیش ئەوەندەم لێ خوارد هەتا هەستم بە تیری کرد لە نینۆکەکانمەوە دەرئەچوو (ثم أعطيت فـضـلي عـمر بن الخطاب» قالوا: فـمـا أولته يا رسول الله؟ قال: «العلم») ئینجا ئەوەی کە لێم مایەوە دام بە عومەری خەتتاب، گوێگرانیش عەرزیان کـرد ئەوەت بە چی خـەوپەرژێن کرد ئەی پێـغـەمـبەری خواﷺ؟ فـەرمووی بە عـلیم. خـەوپەرژێنی شـیـر بە عـیلم تەواوە، چونکە شـیـر ئەو هەمـوو پیت و فـەڕەی تێـدایە. لەم فـەرمـوودەدا رادەو پلەی بەرزی فـاروق ئاشکرا ئەبێ وەک رادەو پلەی بەرزی عـیلم کـە ئەم

کیتابەی بۆ داناوە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٦٨١، ٧٠٠٦، ٧٠٠٧، ٧٠٢٧، ٧٠٣٢)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٣-باب الْفُتْيَا وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى الدَّابَّةِ وَغَيْرِهَا

٨٣-حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عِيسَى بِنِ طَلْحَةَ بِنِ عُبَيْدِاللهِ بنِ عَمْرِو بنِ الْعَاصِ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَقَفَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِمِنًى لِلنَّاسِ يَسْأَلُونَهُ فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَذْبَحَ. فَقَالَ: اذْبَحْ وَلاَ حَرَجَ فَجَاءَ آخَرُ فَقَالَ: لَمْ أَشْعُرْ فَنَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ قَالَ: ارْمِ وَلاَ حَرَجَ فَمَا سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلاَ أُخِّرَ إِلاَّ قَالَ: افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ.

(باب الفتيا وهو واقف على الدابة وغيرها) ئەمە بابی فتوادانە لە کاتێکدا فتوا دەر وەستابێ بەسەر پشتی وڵاخێکەوە یان هەر شتێکی تر. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە عبداللەی کوڕی عمروی کوڕی عاسەوە (أن رسول اللهﷺ وقف في حجة الوداع بمنى للناس يسألونه) کە پێغەمبەرﷺ وەستابوو لە حەجی ماڵ ئاواییدا لە میندادا بۆ خەڵکی کە پرسیاریان لێ دەکرد (فجاءه رجل فقال: لم أشعر فحلقت قبل أن أذبح) پیاوێک هاتە خزمەتی عەرزی کرد نەمزانی پێش ئێوەی حەیوان سەربڕم سەرم تاشی (فقال: أذبح ولا حرج) ئەفەرموێ: بڕۆ سەر بڕەو هیچ ئەرەجێک نییە (فجاء أخر فقال: لم أشعر فنحرت قبل أن أرمي) یەکێکی تر هاتە خزمەتی گوتی نەمزانی حەیوانم سەربڕی پێش ئەوەی ڕەمی بکەم (قال: ارم ولا حرج) ئەویش فەرمووی بڕۆ ڕەمی و بکەو هیچ ئەرەجێک نییە. (فما سئل النبيﷺ عن شئ قدم ولا آخر إلا قال: افعل ولا حرج) هەر پرسیارێکی لێ کرابێ لە پێشخستنی کردەوەکان و دواخستنیان هەر ئەیفەرموو بیکەو هیچ ڕەخنەیەک نییە. لە ریوایەتەکانی ترەوە دەرئەکەوێ کە مەبەست بە وڵاخ لێرەدا حوشترەکەیەتی، وەک دەرئەکەوێ کە وەستانی سەرپشتی حوشترەکەوە بە تایبەتی بووە، چونکە سونئەتە وەستان بۆ خوتبە بەسەر جێگەیەکی بەرزەوە بێت تا گوێگران ببینن، لەو کاتەشدا شوێنی بەرز نەبووە، هەروەها بینی

بەو شێوە سەرنجی گوێگران باشتر ڕائەکێشێ بۆ گوێ گرتن.

ئینجا ئەم حەدیسە گرنگی فتوادان ڕوون ئەکاتەوە کە ڕاگەیاندن و فێرکردنە. هەر بەو بۆنەوە ئەم بابەی دوایی ئەهێنێ

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٢٤، ١٧٣٦، ١٧٣٧، ١٧٣٨، ٦٦٦٥)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٤ـ باب مَنْ أجابَ الْفُتيا بإشارَةِ الْيَدِ وَالرَّأسِ

٨٤ـ حَدَّثَنا مُوسَى بنُ إسْمَاعِيلَ قَالَ حَدَّثَنَا وُهَيبٌ قَالَ: حَدَّثَنا أيُّوبُ عَنْ عِكْرِمَةَ عَنْ ابنِ عَبَّاسٍ أنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ فِي حَجَّتِهِ فَقَالَ: ذَبَحْتُ قَبْلَ أنْ أرْمِيَ، فَأوْمَأ بِيَدِهِ قَالَ: وَلاَ حَرَجَ. قَالَ: حَلَقْتُ قَبْلَ أنْ أذْبَحَ، فَأوْمَأ بِيَدِهِ: وَلاَ حَرَجَ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٧٢١، ١٧٢٢، ١٧٢٣، ١٧٣٤، ١٧٣٥، ٦٦٦٦)دا دووبارە بووەتەوە.

٨٥ـ حَدَّثَنا الْمَكيُّ بنُ إبْرَاهِيمَ قَالَ: أخبَرَنَا حَنْظَلَةُ بنُ أبي سُفْيَانَ عَنْ سَالِمٍ قَالَ: سَمِعْتُ أبَا هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُقْبَضُ الْعِلْمُ، وَيَظْهَرُ الْجَهْلُ وَالْفِتَنُ، وَيَكْثُرُ الْهَرَجُ». قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا الْهَرَجُ؟ فَقَالَ: هَكَذَا بِيَدِهِ فَحَرَّفَهَا كَأنَّهُ يُرِيدُ الْقَتْلَ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٠٣٦، ١٤١٢، ٣٦٠٨، ٣٦٠٩، ٣٦٣٥، ٤٦٣٦، ٦٠٣٧، ٦٥٠٦، ٦٩٣٥، ٧٠٦١، ٧١١٥، ٧١٢١)دا دووبارە بووەتەوە.

٨٦ـ حَدَّثَنا مُوسَى بنُ إسْمَاعِيلَ قَالَ حَدَّثَنَا وُهَيبٌ قَالَ حَدَّثَنَا هِشَامٌ عَنْ فَاطِمَةَ عَنْ أسْمَاءَ قَالَتْ: أتَيْتُ عَائِشَةَ وَهِيَ تُصَلِّي. فَقُلْتُ: مَا شَأنُ النَّاسِ؟ فَأشَارَتْ إلَى السَّمَاءِ، فَإذَا النَّاسُ قِيَامٌ فَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللهِ. قُلْتُ: آيَةٌ. فَأشَارَتْ بِرَأسِهَا -أيْ نَعَمْ- فَقُمْتُ حَتَّى تَجَلاَّنِي الْغَشْيُ، فَجَعَلْتُ أصُبُّ عَلَى رَأسِي الْمَاءَ. فَحَمِدَ اللهَ عَزَّوَجَلَّ النَّبِيُّ ﷺ وَأثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: مَا مِنْ شَيْءٍ لَمْ أكُنْ أرِيتُهُ إلاَّ رَأيْتُهُ فِي مَقَامِي، حَتَّى الْجَنَّةُ وَالنَّارُ. فَأوْحَى إلَيَّ أنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي قُبُورِكُمْ مِثْلَ، أوْ قَرِيبَ -لاَ أدْرِي أيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أسْمَاءُ- مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ. يُقَالُ: مَا عِلْمُكَ بِهَذَا الرَّجُلِ؟ فَأمَّا الْمُؤْمِنُ، أوِ الْمُوقِنُ -لاَ أدْرِي أيَّ ذَلِكَ قَالَتْ

أَسْمَاءَ- فَيَقُولُ هُوَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى، فَأَجَبْنَا وَاتَّبَعْنَا، هُوَ مُحَمَّدٌ (ثلاثا). فَيُقَالُ: نَمْ صَالِحًا، قَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُوقِنًا بِهِ. وَأَمَّا الْمُنَافِقُ، أَوِ الْمُرْتَابُ -لاَ أَدْرِي أَيُّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ- فَيَقُولُ لاَ أَدْرِي، سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٨٤، ٩٢٢، ١٠٥٣، ١٠٥٤، ١٠٦١، ١٢٣٥، ١٣٧٣، ٢٥١٩، ٢٥٢٠، ٧٧٨٧)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب من أجاب الفتيا بإشارة اليد والرأس) ئەمە بابی ئەوەیە کە فتوادان یەو ئیشارەتیش ئەبێ وەک بە گوتن، ئیتر ئەو ئیشارەتە بە دەست یان بە سەر. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن وعەباسەوە -خوایان لێ رازی بێت- کە (أن النبي ﷺ سئل في حجته فقال: ذبحت قبل أن أرمي، فأومأ بيده قال: ولا حرج) لەپێش رەمیدا حەیوانم سەربڕیوە، ئەویش بە دەست ئیشارەتی بۆ کرد، بەم رەنگە بە ئیشارەت فەرموی: قەیناکات و هیچت لەسەر نی‌یە، ئینجا پرسیارکەر گوتی (حلقت قبل أن أذبح، فأومأ بيده: ولا حرج) سەرم تاشیوە پێش ئەوەی سەر ببڕم، بە دەست ئیشارەتی بۆ کرد کە قەیناکات و هیچت لەسەر نی‌یە.

ئەم باب وحەدیسە یان عەینی پێشووەکەیە ئەمەی ئێرە (نقل بالمعنى)یە یان پرسیارکەرەکان کەسێکی تر بووبێ غەیری ئەوەی کە لە حەدیسە پێشووەکەدا هات. بە هەرحاڵ ئەم حوکمە شەرعی‌یەمان بۆ روون ئەکاتەوە. وە لەم ریوایەتەدا ئەمەمان پێ ئەگەیەنێ کە فتوادان بە ئیشارەت و دەست نیشانیش هەر ئەبێ و لەو دوو رێگەیشەوە ئەم حوکمەمان بۆ روون بوویەوە. الحمدلله.

ئینجا بۆ ئەم مەبەستە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە (قال: «يقبض العلم، و يظهر الجهل و الفتن، ويكثر الهرج») عیلم هەڵئەگیری و نەزانین و فیتنە بڵاو ئەبێتەوەو (هرج) زۆر ئەبێ. (قيل يا رسول الله وما الهرج؟) عەرزی کرا هەرەج چی‌یە؟ (فقال: هكذا بيده فحرفها كأنه يريد القتل)ئەویش بە دەستی ئیشارەتی کرد، بەم رەنگە بە دەست فەرمووی دەشی جوڵاند، لە لێدان و تێکەیاندن کە مەبەستی کوشتنە.

ئیتر ئایا ئەم دەست نیشانە بە کوشتن لە لایەن راوی‌یەکەوە بووبێ یان هەر فەرموودەو

نیشارەتی پێغەمبەرﷺ بووبێ. بە هەرحاڵ ماتوڵ قسەکە سەحیحە هەر ڕێکە. هەر لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنین لە ئەسمائی کچی ئەبوبەکرەوە -خوا لێیان ڕازی بێت- (قالت: أتيت عائشة وهي تصلي) ئەڵێ چووم بۆ لای عائیشە لە کاتێکدا نوێژی دەکرد (فقلت: ما شأن الناس؟) ئینجا کە بینیم خەڵکی پەشۆشن، گوتم چییە ئەو خەڵکە وان؟ (فأشارت إلى السماء، فإذا الناس قيام) ئەویش دەست نیشانی کرد بۆ ئاسمان، واتە شتێکی گرنگ ڕوویداوە، بۆیە ئەو خەڵکە وان، سەرنجم دا لە ماڵی عائشەوە خەریکی نوێژن. واتە خۆر گیرابوو، خەڵکی خەریکی نوێژی خۆر گیران بوون (فقالت: سبحان الله) ئینجا دایکی ئیمانداران فەرمووی سبحان الله (قلت: آية) ئەسماء ئەفەرمووی: گوتم نیشانەیەکی گەورە ڕوویداوە (فأشارت برأسها -أي نعم-) بەسەر دەست نیشانی کرد کە بەڵێ (فقمت حتى تجلاني الغشي) ئینجا هەستام بۆ نوێژکردن هەتا ئەو حاڵەتە ناڕەحەتەم لەسەر لاچوو (فجعلت أصب على رأسي الماء) ئینجا دەستم کرد بە ئاو کردن بەسەر دەم و چاومدا.ئینجا دیتم پێغەمبەرﷺ دەستی کرد بە خوتبە دان بەم جۆرە (فحمد الله عزوجل النبيﷺ و أثني عليه) سوپاس و سەنای خوای کرد (ثم قال: ما من شئ لم أكن أريته إلا رأيته في مقامي) ئینجا فەرمووی هیچ شتێ کە ئەم دیتبێ تا ئێستا مەگەر لەم شوێنی خۆمەدا دیتم (حتى الجنة والنار) تەنانەت بەهەشت و دۆزەخم بینی (فأوحى إلي أنكم تفتنون في قبوركم مثل، أو قريب -لا أدري أي ذلك قالت أسماء- من فتنة المسيح الدجال) ئینجا وەحیم بۆ کرا کە ئێوە لە گۆڕەکانتاندا پرسیارتان لێ ئەکرێ بەوێنەی یان نزیک لە تاقیکردنەوەی دەجال کە دێت ئیدیعای خوایەتی ئەکات و ئەوەندە سیحرو جادووەکانی گەورەیە کوێری ئەوێ ئەخەڵەتێ.

ئینجا لە پرسیارەکانی گۆڕەکانتاندا پێتان دەڵێن: (يقال: ما علمك بهذا الرجل؟) ئایا چی دەزانی لە بارەی ئەم پیاوەوە؟ (فأما المؤمن، أو الموقن -لا أدري بأيهما قالت أسماء- فيقول هو محمد رسول الله جاءنا بالبينات والهدى، فأجبنا و اتبعنا، هو محمد «ثلاثا») ئەوەی ئیمانی بووە یان یەقینی ڕاوییەکە دوو دڵە ئایا (مؤمن)ی وت یان (موقن) کە هەردوو هەر یەکن، لەوەڵامدا دەڵێ ئەوە محمدەو پێغەمبەری خوایە هات بۆمان بە

موعجیزەو هیدایەتەوە، ئیمەش باوەڕمان پێ هێناو شوێنی کەوتین سێ جار ئەڵێ ئەوە محمدە (فیقال: نم صالحا، قد علمنا إن كنت لموقنا به) پێی ئەوترێ: بخەوە بە خۆشی و ئەگوترێ پێی بەراستی ئیمە زانیومانە کە تۆ باوەڕت پێی بووە (وأما المنافق، أو المرتاب -لا أدري أي ذلك قالت أسماء- فيقول لا أدري، سمعت الناس يقولون شيئا فقلته) بەڵام ناپاک یان گوماندار (راوی دەڵێ نازانم کامی گوت) دەڵێ نازانم خەڵکی شتێکیان دەگوت منیش ئەمگوت.

لەم حەدیسە پیرۆزەدا چەند شتێ وەرئەگرین:

* گرنگی سوننەتی نوێژی خۆر گیران.
* بە دەست نیشان و ئیشارەت وەڵام دانەوە لە نوێژدا شەرعی‌یە.
* پرسیاری قەبر راستە.

کەواتە موعتەزیلە کە باوەڕیان نی‌یە بە پرسیارو سزاو خۆشی مردوو پێچەوانەی حەدیسی سەحیح قسە ئەکەن. ئەو فیرقە بەدانە کە کەوتنە ناو ئیسلام سوپاس بۆ خوا نەمان و گۆڕیان گوم بوو خوا هەر نەیان هێنێتەوەو را بەدەکانی ئەو فیرقە بەدانە لە کتێبەکانی عقائددا بە درۆ خرانەوەو ئەوە کە روالەتی حەدیسەکە دەری ئەخات کە دەست نیشان ئەکرێ بۆ پێغەمبەری ئازیز جێگەی سەرسوڕمان نی‌یە لای ئینسانی ژیر، خوای میهرەبان ئەوەندە بەڵگەو نیشانەی گرنگی دەرخستووە ئەو کارە نەزانراو و غەیبیانەی ئاشکرا کردووە بە جۆرێ هیچ سەر سوڕ نەمێنێ، بۆ وێنە ئەگەر لە ئێزگەیەکی جیهانیدا یەکێ قورئان بخوێنێ یان موعظەیەک بکات و رادیۆو تەلەفزیۆنی هەموو جیهان بخرێتە کار لە هەموو ماڵ و هەموو شوێنێکدا ئەو قورئان خوێنە بە روون ترین شێوە حازرو ئاشکرایە، کەواتە با نەفام باش تێ بگات ئەگەر لە رۆژێکدا سەد ملیۆن کەس بمرێ و بخرێتە گۆڕو پرسیاری لێ ئەکرێ، پێغەمبەری ئازیزی نیشان ئەدرێ. شاعیری بەناوبانگی کورد (سید عبالرحیمی تاوگۆزی) ناوبانگ بە (مەولەوی) ئەوەی لە کتێبەکانی عقائددا گوتراوە کردوونی بە شیعرو حەز ئەکەم بیانخەمە پێش چاوی خەڵکی. لە بارەی پرسیاری مردوو لە گۆڕدا ئەفەرموێ:

که مردین ئیتر نامێنێ مجال نۆبەی منکرەو نکیرەو سؤال
باری یاریدەر غیری تۆ نیيە دەڵێن (رب)ت کێس دینی تۆ چییە
ما في قبلكم و مالي فيكم في هذا الرجل المبعوث فيكم

بۆ هذا محسوس مشاهد دەوێ دەستی پێغەمبەر حازر بێ لەوێ
ئەر دەڵێن ساتێ چەند هەزار دەمرێ بوونی لە گشت جێ تصور دەکرێ
وە لە بارەی ئەوەی کە ئەو موعتەزیلە گۆڕ بە گۆڕانە دەڵێن مردوو بێ گیانەو سزا نادرێ ئەفەرموێ:
ئەمە کە دەڵێن میت جمادە نحوی تعذیبی بۆ نابێ بادە
بۆچ با ایجاد کا معطل للجزاء کە لە گشت أجزادا یا بازێ أجزا
نوعا من حیاة بقدرما یدریك اللذة أو الألما
وذا لعمري لا یستلمزن اعادة الروح لذاك البدن
ولا التحرك ولا الاضطراب ولا أن یری ألم العذاب
حتی مصلوب و مقتول وپەلپەل ماکول فی البطن یحی و یسئل
منعم دەبێ و معذب دەبێ ئیتر با تۆ هیچ ئاگات لێ نەبێ
مخفي النار في الشجر الأخضر دەتوانێ اخفای ئەمانە پەکسەر
قال فی الأحیا حجه الإسلام علیه الرحمه فی هذا المقام
مقاماتی پڕ شیفاو إشارات بعینها إشرب دفع الحرارات.
وە لە بارەی محاسبەو دەفتەری ئەعمالەوە ئەفەرموێ: ئەوە کە لە شرح عقائدی ملا جلالدا ئەفەرموێ. ئەمیش کردوویەتی بە شیعر:
منها المجازات حساب و کتاب ئەر دەکەی طلب حکمتی حساب
تا بزانن گشت أهلی عرضات فضلی متقین فضیحەی عصاە
تمیم بێ لە بۆ مسرەی ئەوان بۆ تأسف و حسرتی ئەمان
وەرنە عالم الإشیاء بالمرة لا یعزب عنه مثقال ذرة

*** *** ***

٢٥ـ بابُ تَحْرِيْضِ النَّبِيِّ ﷺ وَفْدَ عَبْدِالْقَيْسِ عَلَى أَنْ يَحْفَظُوا الإِيْمَانَ، وَالْعِلْمَ وَيُخْبِرُوا مَنْ وَرَاءَهُمْ.

وَقَالَ مَالِكُ بنُ الْحُوَيْرِثِ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «ارْجِعُوا إِلَى أَهْلِيْكُمْ فَعَلِّمُوهُمْ».

٨٧ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ بَشَّارٍ قَالَ حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي جَمْرَةَ قَالَ:

كُنتُ أترجِمُ بَينَ ابنِ عبّاسٍ وبَينَ النّاسِ، فَقَالَ: إنَّ وَفْدَ عَبدِالقَيسِ أتوا النَّبيَّ ﷺ فَقَالَ: مَنِ الوَفْدُ -أوْ مَنِ القَوْمُ- قَالُوا: رَبِيعَةُ. فَقَالَ مَرْحَبًا بِالْقَوْمِ -أوْ بِالْوَفْدِ- غَيرَ خَزَايَا وَلاَ نَدَامَى. قَالُوا: إنّا نَأتِيْكَ مِنْ شُقَّةٍ بَعِيْدَةٍ، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَكَ هَذَا الْحَيُّ مِنْ كُفّارِ مُضَرَ، وَلاَ نَسْتَطِيعُ أنْ نَأتِيَكَ إلاَّ فِي شَهْرٍ حَرَامٍ، فَمُرْنَا بِأمْرٍ نُخْبِرُ بِهِ مَنْ وَرَاءَنَا نَدْخُلُ بِهِ الْجَنَّةَ. فَأمَرَهُمْ بِأرْبَعٍ، وَنَهَاهُمْ عَنْ أرْبَعٍ: أمَرَهُمْ بِالإيْمَانِ بِاللهِ عَزَّوَجَلَّ وَحْدَهُ، قَالَ: هَلْ تَدْرُونَ مَا الإيْمَانُ بِاللهِ وَحْدَهُ؟ قَالُوا: اللهُ وَرَسُولُهُ أعْلَمُ. قَالَ: شَهَادَةُ أنْ لاَ إلَهَ إلاَّ اللهُ وَأنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللهِ. وَإقَامُ الصَّلاَةِ، وَإيْتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصَوْمُ رَمَضَانَ، وَتُعْطُوا الْخُمُسَ مِنَ الْمَغْنَمِ. وَنَهَاهُمْ عَنْ: الدُّبَّاءِ، وَالْحَنْتَمِ، وَالْمُزَفَّتِ -قَالَ شُعْبَةُ: رُبَّمَا قَالَ النَّقِيْرُ، وَرُبَّمَا قَالَ الْمُقَيَّرِ. قَالَ: احْفَظُوهُ وَأخْبِرُوهُ مَنْ وَرَاءَكُمْ.

(باب تحريض النبي ﷺ وفد عبدالقيس على أن يحفظوا الإيمان، و العلم ويخبروا من وراءهم) ئەمە بابی هاندانی پێغەمبەرە ﷺ بۆ وەفدی عبدالقیس کە ئیمان و عیلمەکەیان بپارێزن و ئەوەی کـە ئەیزانن رایگەیەنن بەوانەی کـە لایانەوە هاتوون. (وقال مالك بن الحويرث: قال النبي ﷺ: «ارجعوا ألى أهليكم فعلموهم») مالیکی کوڕی حوێرث ئەم تعلیقەی هێناوە کە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمون: بگەڕێنەوە بۆ ناو کەس و کەلەکەتان و ئەوەی کە فێری بوون رایگەیەنن و ئەوانی تریش پێ فێر بکەن.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو جمرەوە کە (قال: كنت أترجم بين ابن عباس و بين الناس) ئەڵێ من تەرجەمەم ئەکرد لە نێوان ئیبن عەباس و خەڵکیدا، بەم جۆرە (فقال: إن وفد عبدالقيس أتوا النبي ﷺ فقال: من الوفد -أو من القوم- قالوا: ربيعة. فقال مرحبا بالقوم -أو بالوفد- غير خزايا و لا ندامى) وەفدی عبدالقیس هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئێوە کێن یان لە چی قەومێکن؟ ئەوانیش عەرزیان کرد لە گەلی رەبیعەین، راوییەکە گومانی هەیە ئایا وەفدی فەرمو یان قەوم، بە هەرکام بەخێر هاتنی کردن و فەرموی: بەخێر بێن بۆ شوێنی فراوانی خۆتان هاتوون بەبێ غەم و بەبێ پەشیمانی (قالوا: إنا نأتيك من شقة بعيدة، وبيننا و بينك هذا الحي من كفار مضر) ئێمە لە شوێنێکی دوورەوە هاتووین

و له نێوان ئێمەو ئێوەدا ئەم خێڵی رەبیعەیە کە دوژمنن و هەموو کاتێ پێمان ناکرێ بێین (ولا نستطيع أن نأتيك إلا في شهر حرام، فمرنا بأمر نخبر به من وراءنا ندخل به الجنة) ناتوانین بێین بۆ لات مەگەر لە مانگی حەرامدا، کەواتە فەرمانمان پێ بدە بە کارێ کە رایگەیەنین بە گەلەکەمان و بە هۆی ئەو فەرمانەوە بچینە بەهەشت. (فأمرهم بأربع، ونهاهم عن أربع:) ئینجا فەرمانی کرد بە چوار شت و جڵەوگیریی لێکردن لە چوار شت (أمرهم بالإيمان بالله عزوجل وحده) فەرمانی پێ کردن بە باوەڕهێنان بە خوای تاک و تەنیا (قال: هل تدرون ما الإيمان بالله وحده؟) ئایا دەزانن باوەڕ بە خوای تاک و تەنیا چییە؟ (قالوا: الله ورسوله أعلم) وتیان خواو پێغەمبەری خوا ئەزانن (قال: شهادة أن لا إله إلا الله و أن محمدا رسول الله. و إقام الصلاة، و إيتاء الزكاة، وصوم رمضان، وتعطوا الخمس من المغنم) باوەڕ بە خوا بە تاک و تەنیا شایەتومان و بەجێ هێنانی نوێژ بە رێکی و زەکات دان و رۆژووی رەمەزان و پێویستە پێنج یەکی غەنیمەت بدەن. وا دەرئەکەوێ لەو کاتەدا حەج واجب نەبووە، عەینی ئەم حەدیسە تێپەڕی کرد، بەڵام لەوێ بۆ مەبەستی ئەوە هات کە (خمس) دان بەشێکە لە ئیمان وە لێرەدا بەناوی ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ هانی ئەو وەفدەی دا لەسەر پاراستنی ئیمان وعیلم و راگەیاندنی بە خەڵکی، ئینجا ئەوەی جڵەوگیریی لێ کردن چوار جۆرن: (ونهاهم عن: الدباء، والحنتم، والمزفت -قال شعبة: ربما قال النقير، وربما قال المقير) ئەبیزە کە جۆرە خواردنەوەیەکە وەک سرکە بەڵام ئینسان مەست ئەکات، ئەم چوارە بخۆرەکەی مەست وسەرخۆش ئەبوو پێی، بەڵام چوارەمەکە شوعبە درو دڵ بوو تێیدا کە ئایا (النقير)ی فەرمووی یان (المقير). ئینجا فەرمووی پێیان (قال: احفظوه واخبروه من وراءكم) ئەمانە کە پێم راگەیاندن و وەریان گرن و رایانگەیەنن بەوانەی کە لە لایەنیانەوە هاتوون.

***　　***　　***

## ٢٦ـ بابُ الرِّحْلَةِ فِي الْمَسْأَلَةِ النَّازِلَةِ

٨٨ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ مُقَاتِلٍ أَبُو الْحَسَنِ قَالَ أَخْبَرَنَا عَبْدُاللهِ قَالَ أَخْبَرَنَا عُمَرُ بنُ سَعِيدِ ابْنِ أَبِي حُسَيْنٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُاللهِ بنُ أَبِي مُلَيْكَةَ عَنْ عُقْبَةَ بنِ الْحَارِثِ أَنَّهُ تَزَوَّجَ

ابْنَةً لأبِي إهَاب بنِ عَزيز فَأتَتْهُ امرَأةٌ فَقَالَتْ: إنِّي قَدْ أرْضَعْتُ عُقْبَةَ وَالَّتِي تَزَوَّجَ. فَقَالَ لَهَا عُقْبَةُ: مَا أعْلَمُ أنَّكِ أرْضَعْتِنِي، وَلاَ أخْبَرْتِنِي. فَرَكِبَ إلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ بالْمَدِيْنَة، فَسَألَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: كَيْفَ وَقَدْ قِيْلَ؟ فَفَارَقَهَا عُقْبَةُ، وَنَكَحَتْ زَوْجًا غَيْرَهُ.

(باب الرحلة في المسألة النازلة) ئەمە بابی ئەوەیە کە پێویستە ڕۆیشتن و سەفەر کردن لەبەر مەسەلەیەکی شەرعی و ڕاگەیاندنی بە خاوەنەکەی. وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە عوقبەی کوڕی حارثەوە کە کچی ئەبو ئیهابی مارە کرد (فأتته امرأة فقالت: إني قد أرضعت عقبة والتي تزوج) ئینجا ئافرەتێک هات بۆ لای وتی: من شیرم داوە بە عوقبەو ئەو ئافرەتە کە مارەی کردووە (فقال لها عقبة: ما أعلم أنك أرضعتني، ولا أخبرني) عوقبەش وتی: من نازانم کە تۆ شیرت دابێ بە من و هەواڵی ئەوەت پێ نەداوم (فركب إلى رسول اللهﷺ بالمدينة، فسأله) ئینجا عوقبە سوار بوو لە مەککەوە هات بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ لە مەدینەو پرسیاری لێ کرد (فقال رسول اللهﷺ: كيف وقد قيل؟) چۆن ئەو ئافرەتە ئەهێنێ لە کاتێکدا ئەوە گوتراوە؟ (ففارقها عقبة، ونحكت زوجا غيره) بە هۆی ئەوەوە عوقبە لێی جوێ بوویەوەو ئافرەتەکەش شووی کرد بە مێردێکی تر. بە پێی ڕای زانایان بە گوتنی تەنها ئافرەتێک ئیسپات نابێ، مەگەر ئەو مێردە بڕوا بکات بە قسەی ئەو ئافرەتە شیردەرە. کەواتە ئەبێ عوقبە لە دڵەوە بڕوای کردبێ یان ئەڵێین ئیحتیاط بووە، چونکە مەسەلەی شیر دەقی قورئانی لەسەرە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٠٥٢، ٢٦٤٠، ٢٦٥٩، ٥١٠٤)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٧ـ بابُ التَّنَاوُبِ فِي الْعِلْمِ

٨٩ـ حَدَّثَنَا أبُو الْيَمَانِ أخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ. ح. قَالَ أبُو عَبْدِاللهِ وَقَالَ ابْنُ وَهْبٍ: أخْبَرَنَا يُونُسُ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِاللهِ بنِ عَبْدِاللهِ بنِ أبِي ثَوْرٍ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَبَّاسٍ عَنْ عُمَرَ قَالَ: كُنْتُ أنَا وَجَارٌ لِي مِنَ الأنْصَارِ فِي بَنِي أمَيَّةَ بنِ زَيْدٍ -وَهِيَ مِنْ عَوَالِي الْمَدِيْنَةِ وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، يَنْزِلُ يَوْمًا وَأنْزِلُ يَوْمًا، فَإذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ بِخَبَرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ مِنَ الْوَحْيِ وَغَيْرِهِ، وَإذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ. فَنَزَلَ صَاحِبِي الأنْصَارِيُّ يَوْمَ

نَوبَتِه فَضَرَبَ بَابِي ضَرْبًا شَدِيدًا فَقَالَ: أَثَمَّ هُوَ؟ فَفَزِعْتُ، فَخَرَجْتُ إِلَيْه فَقَالَ: قَدْ حَدَثَ أَمْرٌ عَظِيمٌ... قَالَ فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَإِذَا هِيَ تَبْكِي، قُلْتُ طَلَّقَكُنَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ؟ قَالَتْ: لاَ أَدْرِي. ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ. أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ؟ قَالَ: لاَ فَقُلْتُ: اللهُ أَكْبَرُ.

(باب التناوب في العلم) ئەمە بابێکە لەبارەی دوو کەس بە نۆبە بێن بۆ وەرگرتنی عیلم لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە حەزرەتی عومەرەوە -خوای لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: ﴿كنت أنا و جار لي من الأنصار في بني أمية بن زيد وهي من عوالي المدينة) من دراوسێیەکم لە ئەنسار لە بەنی ئامیەی کوڕی زەید هەبوو کە ئەوان لەلای سەرووی مەدینە بوون (وكنا نتناوب النزول على رسول الله ﷺ، ينزل يوما و أنزل يوما، فإذا نزلت جئته بخبر ذلك اليوم من الوحي و غيره، و إذا نزل فعل مثل ذلك) من و ئەو بە نۆبە ئەهاتینە خوارەوە بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ، ئەو رۆژێ دائەبەزی و منیش رۆژێ، کاتێ من دابەزیمایە هەر هەواڵێکم دەست کەوتایە لە وەحی و غەیری وەحی بۆم باس ئەکردو ئەگەر ئەویش دابەزیایە هەر بەو جۆرەی ئەکرد (فنزل صاحبي الأنصاري يوم نوبته فضرب بابي ضربا شديدا فقال: أثم هو؟ ففزعت، فخرجت إليه) هاورێ ئەنسارییەکەم رۆژی دابەزینی، لە گەڕانەوەیدا بە توندی دای لە قاپییەکەم و گوتی ئایا فلان لەوێیە؟ منیش داچڵەکام و بە گورجی چووم بۆ لای (فقال: قد حدث أمر عظيم... قال فدخلت على حفصة فإذا هي تبكي، قلت طلقكن رسول الله ﷺ؟ قالت: لا أدري. ثم دخلت على النبي ﷺ فقلت و أنا قائم. أطلقت نساءك؟ قال: لا) گوتی: کارێکی زۆر گەورە رووی داوە. وتی: بە گورجی چووم بۆ لای حفصە ئەزانم ئەگری، گوتم ئایا پێغەمبەر ﷺ تەڵاقی داون؟ ئەویش گوتی: نازانم. ئینجا چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ عەرزم کرد بە پێوە ئایا ژنەکانت تەڵاق داوە؟ گوتی: نەخێر. (فقلت:)منیش وتم: (آللہ أكبر).

لەم حەدیسە دوو حوکم وەرئەگیرێ:

١) خەبەری ئاحاد حوکمی پێ ئەکرێ.

٢) پرسیاری صحابە ئیعتیباری پێ ئەکرێ.

ئەمە بەڵگە بوو بۆ ئەو زانایانەی کە ئیعتیبار ئەکەن بە پرسی صحابە. ئەوەتا خیلاف هەیە لەو مەسەلەدا، هێندێ ئەفەرمون بێگومان ئیعتیباری پێ ئەکرێ و هێندێ ئەفەرمون ئیعتیباری پێ ناکرێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٤٦٨، ٤٩١٣، ٤٩١٤، ٤٩١٥، ٥١٩١، ٥٢١٨، ٥٨٤٣، ٧٢٥٦، ٧٢٦٣)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٨ـ باب الغَضَبِ فِي الْمَوْعِظَةِ وَالتَّعْلِيمِ إِذَا رَأَى مَا يَكْرَهُ

٩٠ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنِ كَثِيرٍ قَالَ أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ عَنْ ابْنِ أَبِي خَالِدٍ عَنْ قَيْسِ بنِ أَبِي حَازِمٍ عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ لاَ أَكَادُ أُدْرِكُ الصَّلاَةَ مِمَّا يُطَوِّلُ بِنَا فُلاَنٌ، فَمَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فِي مَوْعِظَةٍ أَشَدُّ غَضَبًا مِنْ يَوْمَئِذٍ فَقَالَ: «أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ مُنَفِّرُونَ، فَمَنْ صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الْمَرِيضَ وَالضَّعِيفَ وَذَا الْحَاجَةِ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٧٠٢، ٧٠٤، ٦١١٠، ٧١٥٩)دا دووبارە بووەتەوە.

٩١ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَامِرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بنُ بِلاَلٍ الْمَدِينِيُّ عَنْ رَبِيعَةَ بنِ أَبِي عَبْدِالرَّحْمَنِ عَنْ يَزِيدَ مَوْلَى الْمُنْبَعِثِ عَنْ زَيْدِ بنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سَأَلَهُ رَجُلٌ عَنِ اللُّقَطَةِ فَقَالَ: «اعْرِفْ وِكَاءَهَا -أَوْ قَالَ: وِعَاءَهَا- وَعِفَاصَهَا ثُمَّ عَرِّفْهَا سَنَةً ثُمَّ اسْتَمْتِعْ بِهَا، فَإِنْ جَاءَ رَبُّهَا فَأَدِّهَا إِلَيْهِ. قَالَ فَضَالَّةُ الإِبِلِ؟ فَغَضِبَ حَتَّى احْمَرَّتْ وَجْنَتَاهُ -أَوْ قَالَ: احْمَرَّ وَجْهُهُ- فَقَالَ: «وَمَا لَكَ وَلَهَا؟ مَعَهَا سِقَاؤُهَا وَحِذَاؤُهَا تَرِدُ الْمَاءَ وَتَرْعَى الشَّجَرَ، فَذَرْهَا حَتَّى يَلْقَاهَا رَبُّهَا» قَالَ: فَضَالَّةُ الْغَنَمِ؟ قَالَ: «لَكَ أَوْ لأَخِيكَ أَوْ لِلذِّئْبِ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٣٧٢، ٢٤٢٧، ٢٤٢٨، ٢٤٢٩، ٢٤٣٦، ٢٤٣٨، ٥٢٩٢، ٦١١٢)دا دووبارە بووەتەوە.

٩٢ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ الْعَلاَءِ قَالَ حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ عَنْ يَزِيدٍ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: سُئِلَ النَّبِيُّ ﷺ عَنْ أَشْيَاءَ كَرِهَهَا، فَلَمَّا أُكْثِرَ عَلَيْهِ غَضِبَ ثُمَّ قَالَ لِلنَّاسِ: سَلُونِي عَمَّا شِئْتُمْ قَالَ رَجُلٌ: مَنْ أَبِي؟ قَالَ: أَبُوكَ حُذَافَةُ. فَقَامَ آخَرُ فَقَالَ: مَنْ أَبِي يَا رَسُولَ

اللهِ؟ فَقَالَ أَبُوكَ سَالِمٌ مَوْلَى شَيْبَةَ. فَلَمَّا رَأَى عُمَرُ مَا فِي وَجْهِهِ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّا نَتُوبُ إِلَى اللهِ عَزَّوَجَلَّ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٧٢٩١)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب الغضب في الموعظة والتعليم إذا رأى ما يكره) ئەمە بابی ئەوەیە کاتێ کەسێ موعظەو تعلیم بکات و شتێ ببینێ کە پێی ناخۆش بێت خەشم و غەزەب دەربڕێ، لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو مەسعودی ئەنساری‌یەوە کە (قال: قال رجل: يا رسول الله لا أكاد أدرك الصلاة مما يطول بنا فلان) فەرمووی: پیاوێک وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ خەریکم نوێژ نەکەم لەپشتی فلانەوە لەبەرئەوەی زۆر درێژە ئەدا پێمان (فما رأيت النبيﷺ في موعظة أشد غضبا من يومئذ فقال:) ئینجا پێغەمبەرﷺ هەستا بۆ ئامۆژگاری لەو بارەیەوە، وە ئەم دیبوو لە هیچ ئامۆژگاری‌یەکدا خەشمناکتر لەو جارە، فەرمووی: «أيها الناس إنكم منفرون، فمن صلى بالناس فليخفف، فإن فيهم المريض و الضعيف وذا الحاجة» ئەی خەڵکینە ئێوە خەڵکی ئەتارێنن هەرکەس پێش نوێژی کرد با درێژەی زیاد نەدا، چونکە ئەو خەڵکە نەخۆش و لاوازو کەسێکی تێدایە کە ئیش و پێویستی هەیە.

جا لەم فەرمودەوە زانایانی ئیسلام ئەفەرمون ئەگەر ئیمامێک ئەیەوێ درێژە بدات لەو سنوورە تێپەڕ نەکات کە دیاریی کراوە لە شەرعدا وەک لە کتێبی ئەو زانایانەدا نووسراوە دەربارەی هەموو نوێژەکان. یان ئەو کۆمەڵە کۆمەڵێکی کەم بن، واتە محصور بن، ئەگەر ئەیەوێ زیادە درێژە بدات پرسیان پێ بکات. بەڵێ تاراندنی خەڵکی زۆر خەتەرێکی گەورەی هەیە، چونکە پێویستە موسڵمانەکان لە کاتی نوێژدا ئەوەی پێیان ئەکرێ دڵیان کۆ بکەنەوەو بە خۆشی و سۆزو پەرۆشەوە عەبدایەتی خۆیان تقدیم بکەن بە مقامی پەروەردگارو داوای خێری هەردوو جیهان بکەن لە خوای خۆیان، وە ئومێدەوار بن کە ئەو نوێژە ببێ بە هۆی لێ بووردنی گوناهو تاوانەکانیان، کەواتە ئەگەر ئیماندار هۆشی لای خۆی بێ کاتێ نوێژ ئەبێ لە خۆشترین کاتەکانی بێت و ئەو نوێژە بکات بە هۆی ئارامی دڵی و فێنک بوونەوەی دڵی لەو کارەسات و ناخۆشی‌یەی کە رووی کردووەتە دڵی، لەبەر ئەوەی پێغەمبەری ئازیزﷺ: (كان إذا نابه أمر فزع إلى الصلاة) کاتێ ناخۆشی‌یەک رووی تێ بکردایە پەلاماری نوێژی ئەدا، بە

هۆی بێ خشوعی‌یەوە خەڵکی پەلە ئەکەن و ئەیانەوێ زوو لە ملی خۆیانی بکەنەوە ﴿و إنها لكبيرة إلا على الخاشعين * الذين يظنون أنهم ملاقوا ربهم و إنهم إليه راجعون﴾ بەڵێ نوێژ بەبێ ئەو هەستە پیرۆزە ئەرک داره لەسەر نوێژ کەرەکە. ئەوە لە لایەکەوە لە لایەکی ترەوە نابێ ئەم حەدیسە بکرێ بەبەڵگە بۆ ئیمامەکان کە مسابقە ئەکەن بۆ زوو لێ بوونەوە. بەراستی ئەوە نوێژ نی‌یە، بەڵکو ئەوە تمثیلی نوێژە، ئەگەر ئەو هەموو نوێژە کە ئەکرێن نوێژی راستەقینە بوایە فەڕو بەرەکەتی دنیای داگیر ئەکردو خاوەنەکەی ئەگۆڕی، لەبارەی گرنگی نوێژەوە ئەگەر ئەو ئایەت و حەدیس و فەرمودەی خواناس و ئیمامانە بهێنین بە مجلدێکی گەورە بۆمان تەواو نابێ و با بەم ئەندازە کۆتایی بێنین.

ئینجا لە بارەی ئەم بابەوە ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە زەیدی کوڕی خالدی جهنی‌یەوە کە ئەفەرموێ: (أن النبيﷺ سأله رجل عن اللقطة) پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ کرد لە شتی دۆزراوە (فقال: «أعرف وكاءها -أو قال: وعاءها- و عفاصها) فەرموی: نیشانی هەڵدە بەو شتەی پێی بەستراوە یان بەو شتەی کە دۆزراوەکەی تێدایە. راوی‌یەکە دوو دڵە کامیانی فەرمووە. (ثم عرفها سنة) ئینجا یەک ساڵ جاڕی بۆ بدە. (ثم استمتع بها، فإن جاء ربها فأدها إليه) ئینجا ئەگەر خاوەنەکەی هەرکاتێک هات بیدەرەوە، ئەگەر نەهات ئەوە لای خۆتە (قال فضالة الإبل؟) ئینجا زەید گوتی: ئەی دۆزراوەی حوشتر چی لێ بکات؟ (فغضب حتى احمرت وجنتاه -أو قال: احمر وجهه- فقال: «وما لك و لها؟ معها سقاؤها و حذائها ترد الماء وترعى الشجر، فذرها حتى يلقاها ربها») بە هۆی پرسیارەکەوە هەردوو کوڵمی سوور داگیرسا یان رووی داگیرساو فەرموی: چیتە بەسەری‌یەوە لێی گەڕێ هیچ ئەرکێکی نی‌یە بە سەرتەوە، ئاوی خۆی لەگەڵە -چونکە حوشتر ئاو ئەخواتەوە تا چەند رۆژێک پێویستی نی‌یە بە ئاو، وە کەوش و پێڵاوی خۆی پێ‌یە، واتە خوفەکەی، ئەچێتە سەر ئاو و گیاو درەختی خۆی ئەخوا، وازی لێ بێنە، لێی گەڕێ هەتا خاوەنەکەی رێی لێ ئەکەوێتەوە، کەواتە نابێ بە گوم بوو و دۆزراوە دابنرێ، چونکە خاوەنەکەی دەستی ئەکەوێتەوە (قال: فضالة الغنم؟ قال: «لك أو لأخيك أو للذئب») ئینجا پرسیاری کرد لە دۆزراوەی مەڕو بزن، فەرمووی: بۆ تۆیە یا بۆ براکەتە -کە خاوەنەکەیەتی- یا بۆ گورگە، ئەم حەدیسە لەمەو پاش لە کیتابی بیعدا دێت کەواتە با لێی گەڕێین درێژەکەی بۆ ئەوێ بە یارمەتی خوا.

هەر لە بارەی ئەم بابەوە ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئەبو موساوە کە (قال: سئل النبيﷺ عن أشياء كرهها) پرسیار کرا لە پێغەمبەرﷺ لە بارەی چەند شتێکەوە کە پێی ناخۆش بوون (فلما أكثر عليه غضب) ئینجا کە پرسیاری زۆر لێ کرا خەشمناک بوو. دیارە ئەو پرسیارانە شتێکی بێ نرخ بوون، حوکمێکی ئیسلامیان پێوە نەبەسترابوو، ئەگینا خەشمناک نەدەبوو (ثم قال للناس: سلوني عما شئتم) لە پاشان فەرمووی بە خەڵکەکە: پرسیارم لێ بکەن لە هەرچی دەتانەوێ، لەوێدا (قال رجل: من أبي؟) پیاوێک هات وتی: باوکم کێیە؟ (قال: أبوك حذافة) ئەویش فەرمووی: باوکت حوازەفەیە (فقام آخر فقال: من أبي يا رسول الله؟) ئینجا یەکێکی تر هەستاو گوتی: باوکی من کێیە؟ (فقال أبوك سالم مولى شيبة) فەرمووی: باوکت سالمی مولای شەیبەیە (فلما رأى عمر ما في وجهه قال: يا رسول الله إنا نتوب إلى الله عزوجل) ئینجا کاتێ عمر -خوای لێ رازی بێت- هەستی کرد بە پێ ناخۆش بوونی پێغەمبەرﷺ لەو پرسیارە بێ نرخانە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە تۆبە ئەکەینە لای خوا لەوەی کە نارەزایی تۆی تێدا بێت، ئینجا لەم بابەدا هەر باسی خەشمی کرد لەو جۆرە پرسیارانە، وەباسی حوکم و بڕیاری نەکرد، چونکە حوکم و بڕیار ئەبێ لە کاتی ئارام و خۆشیدا بێت وەک ئەفەرموێ: (لا يحكم أحد بين اثنين وهو غضبان) لەبەر ئەوەی حوکم جیاوازە، زانایانی ئیسلامی ئەخۆشی و برسێتی زۆرو هەر شتێک کە فیکر تێک بدات قیاسیان کردووەتە سەر خەشم و غەزەب.

*** *** ***

## ٢٩ـ بابُ مَنْ بَرَكَ عَلَى رُكْبَتَيْهِ عِنْدَ الإِمَامِ أَوِ الْمُحَدِّثِ

٩٣ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَنَسُ بنُ مَالِكٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ خَرَجَ فَقَامَ عَبْدُاللهِ بنُ حُذَافَةَ فَقَالَ: مَنْ أَبِي؟ فَقَالَ: أَبُوكَ حُذَافَةَ ثُمَّ أَكْثَرَ أَنْ يَقُولَ: «سَلُونِي»... فَبَرَكَ عُمَرُ عَلَى رُكْبَتَيْهِ فَقَالَ: رَضِينَا بِاللهِ رَبًّا وَبِالإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍﷺ نَبِيًّا. فَسَكَتَ.

(باب من برك على ركبتيه عند الإمام أو المحدث) ئەمە بابی کەسێکە کە بێت بە چۆکدا لای ئیمام یان کەسێ کە حەدیث بڵێ، لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسی

کوڕی مالیکەوە (أن رسـول اللهﷺ خـرج فـقـام عـبـدالله بن حـذافـة فـقـال: من أبي؟) کە پێغەمبەرﷺ چووە دەرەوە، عـبـدالله هەسـتـا و پرسی باوکم کێیە؟ (فـقـال: أبوك حـذافـة) فەرمووی باوکت حوازەفەیە (ثم أكـثر أن يقـول: «سلوني»..) لە پاشان پرسـیاریان زۆر کرد کاتێ فەرمووی پرسیارم لێ بکەن (فـبـرك عمر على ركـبـتـه فقـال: رضـينا بالله ربا وبـالإسـلام دينا، وبمحمدﷺ نبيا. فسكت) ئینجا حەزرەتی عومەر هاتە سەر ئەژنۆ و وتی: رازی بووین کە (الله) خوامانەو ئیسلام دینمانەو محمد پێغەمبەرمانەو بێ دەنگ بوو.

ئەم حـەدیسـە لە ژمـارەکـانی: (٥٤٠، ٧٤٩، ٤٦٢١، ٦٣٦٢، ٦٤٦٨، ٧٠٨٩، ٧٠٨٩، ٧٠٩٠، ٧٠٩١، ٧٢٩٤، ٧٢٩٥)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣٠ـ بابُ مَنْ أعادَ الْحَدِيْثَ ثَلاثًا لِيُفْهَمَ عَنْهُ

فَقَالَ: «ألاَ وَقَوْلُ الزُّوْرِ»، فَمَا زَالَ يُكَرِّرُهَا. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: قَالَ النَّبِيُّﷺ: «هَلْ بَلَّغْتُ»؟ ثَلاثًا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٩٥، ٦٢٤٤)دا دووبارە بووەتەوە.

٩٤ـ حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بنُ عَبْدِالله حَدَّثَنَا عَبْدُالصَّمَدِ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُالله بنُ الْمُثَنَّى قَالَ حَدَّثَنَا ثُمَامَةُ بنُ عَبْدِالله عَنْ أنَسٍ عَنِ النَّبِيِّﷺ أنَّهُ كَانَ إذَا سَلَّمَ سَلَّمَ ثَلاثًا، وَإذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أعَادَهَا ثَلاثًا.

٩٥ـ حَدَّثَنَا عَبْدَةُ بنُ عَبْدِالله حَدَّثَنَا عَبْدُالصَّمَدِ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُالله بنُ الْمُثَنَّى قَالَ حَدَّثَنَا ثُمَامَةُ بنُ عَبْدِالله عَنْ أنَسٍ عَنِ النَّبِيِّﷺ أنَّهُ كَانَ إذَا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أعَادَهَا ثَلاثًا حَتَّى تُفْهَمَ عَنْهُ، وَإذَا أتَى عَلَى قَوْمٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ ثَلاثًا.

٩٦ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ حَدَّثَنَا أبُو عَوَانَةَ عَنْ أبِي بِشْرٍ عَنْ يُوسُفَ بنِ مَاهَكَ عَنْ عَبْدِالله ابْنِ عَمْرٍو قَالَ: تَخَلَّفَ رَسُولُ اللهِﷺ فِي سَفَرٍ سَافَرْنَاهُ، فَأدْرَكَنَا وَقَدْ أرْهَقْنَا الصَّلاةَ صَلاةَ الْعَصْرِ وَنَحْنُ نَتَوَضَّأ، فَجَعَلْنَا نَمْسَحُ عَلَى أرْجُلِنَا، فَنَادَى بِأعْلَى صَوْتِهِ: «وَيْلٌ لِلأعْقَابِ مِنَ النَّارِ» مَرَّتَيْنِ أوْ ثَلاثًا.

(باب من أعاد الحديث ثلاثا ليفهم عنه) ئەمە بابی کەسێکە کە قسەی سێ جار تیکرار بکاتەوە لەبەر ئەوەی لێی وەرگیرێ. ئینجا ئیشارە ئەکات بۆ فەرمودەیەکی پێغەمبەرﷺ کە لە شوێنی تردا هاتووە لە باسی شایەتی دان و خۆپارێزی لە شایەتی ناهەق کە فەرموی: (فقال: «ألا وقول الزور»، فما زال يكررها) کە چەند بارەی کردەوە، وە هەروەها فەرمودەکە لە خوتبەی حەجی ماڵ ئاواییدا فەرموی کە سێ جار تیکراری کردەوە، وەک ئەفەرموێ: (وقال ابن عمر: قال النبيﷺ: «هل بلغت»؟ ثلاثا)عبداللەی کوڕی عمر -خوایان لێ رازی بێت وتی: پێغەمبەرﷺ سێ جار فەرموی: ئایا پێم راگەیاندن.

لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ (أنه كان إذا سلم سلم ثلاثا، و إذا تكلم بكلمة أعادها ثلاثا) مەبەست ئەوەیە ئەنەس وای دیتووە لە پێغەمبەرﷺ ئەو چەند بارە کردنەوە زۆر بەفەڕ بووە بۆ وەرگرتن و لە بیر نەچوونی یارەکان، وە هەروەها بۆ دەربڕینی چاکی یان بەدیی کارەکە دووبارەی ئەکردەوە.

هەروەها ئەم حەدیسە ئەهێنێ کە ئەنەس لە پێغەمبەرەوەﷺ ئەیهێنێ (أنه كان إذا تكلم بكلمة أعادها ثلاثا حتى تفهم عنه، وإذا أتى على قوم فسلم عليهم سلم عليهم ثلاثا) کاتێک فەرمودەیەکی بفەرمواية سێ جاری تیکراری ئەکردەوە هەتا تێ بگەیشتنایە لێی . کاتێک بچوایە بۆ لای قەومێک سێ جار سەلامی لێ ئەکردن.

هەر لەم باریەوە ئەم حەدیسەش ئەهێنێ کە عبداللەی کوڕی عمرەوە -خوا لێیان رازی بێت- کەوتی: (تخلف رسول اللهﷺ في سفر سافرناه، فأدركنا وقد أرهقنا الصلاة صلاة العصر ونحن نتوضأ، فجعلنا نمسح على أرجلنا، فنادى بأعلى صوته: «ويل للأعقاب من النار» مرتين أو ثلاثا) پێغەمبەرﷺ دواکەوت لە سەفەرێک کە لە خزمەتیدا سەفەرمان کردبوو، نوێژ تەنگەتاوی کردبووین، کە نوێژی عەسر بوو، ئێمە دەست نوێژمان ئەگرت و مەسحمان کرد بەسەر قاچماندا بانگی کردین بە دەنگێکی بەرز کە عەزاب بۆ ئەو پاژنانەی کە ئەشۆراون دوو جار یان سێ جار دووبارەی کردەوە.

*** *** ***

## ٣١ـ باب تَعلِيم الرَّجلِ أمَتَهُ وأهلَهُ

٩٧ـ أخْبَرَنَا مُحَمَّدٌ -هُوَ ابْنُ سَلَامٍ- حَدَّثَنَا الْمُحَارِبِي قَالَ: حَدَّثَنَا صَالِحُ بنُ حَيَّانَ قَالَ: قَالَ عَامِرٌ الشَّعْبِيُّ حَدَّثَنِي أَبُو بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَهُمْ أَجْرَانِ: رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَآمَنَ بِمُحَمَّدٍ ﷺ، وَالْعَبْدُ الْمَمْلُوكُ إِذَا أَدَّى حَقَّ اللهِ وَحَقَّ مَوَالِيهِ، وَرَجُلٌ كَانَتْ عِنْدَهُ أَمَةٌ فَأَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ تَأْدِيبَهَا، وَعَلَّمَهَا فَأَحْسَنَ تَعْلِيمَهَا، ثُمَّ أَعْتَقَهَا فَتَزَوَّجَهَا، فَلَهُ أَجْرَانِ».

ثُمَّ قَالَ عَامِرٌ: أَعْطَيْنَاكَهَا بِغَيْرِ شَيْءٍ، قَدْ كَانَ يُرْكَبُ فِيمَا دُونَهَا إِلَى الْمَدِينَةِ.

ئینجا دێته سەر بابی پێویستی فێرکردنی موسڵمان بۆ کارەکەرو کەس و کاری خۆیان بۆ هەر کارێکی خێر بە تایبەتی واجباتی دینی، ئەفەرموێ: (باب تعليم الرجل أمته و أهله). لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە کە (قال رسول الله ﷺ: «ثلاثة لهم أجران:) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: سێ کەس هەن دوو ئەجریان هەیە: (رجل من أهل الكتاب أمن بنبيه و أمن بمحمد ﷺ، والعبد المملوك إذا أدى حق الله و حق مواليه، ورجل كانت عنده أمة فأدبها فأحسن تأديبها، وعلمها فأحسن تعليمها، ثم أعتقها فتزوجها، فله أجران»).

١)کەسێک لە نامەدار کە باوەڕی هێنابێ بە پێغەمبەرەکەی ئینجا باوەڕیشی هێنابێ بە محمد ﷺ.

٢) بەندەیەکی موڵک کەحەقی خوای بەجێ هێنابێ و حەقی خاوەنەکەشی.

٣) پیاوێک جارییەیەکی لەژێ دەستدا بێت بە جوانی ئەدەبی دادابێ، بە جوانی فێری بکات ئەوەی کە پێویستە، لە پاشان ئازادی بکات و مارەی بکات. ئەم سیانە دوو ئەجریان هەیە.

ئینجا پیاوێک لە ئەهلی خوراسان پرسیار ئەکات لە سالح ئەگەر پیاوێک کەنیزەکێکی ببێ و ئازادی بکات، ئایا ئەجری چۆنە؟ ئەمیش وەڵامی ئەداتەوە بەبەڵگەی ئەم حەدیسە، کە لەمەو پاش لە باسی حەزرەتی عیسادا دێت. جا صالح وەڵامی ئەداتەوە ئێمە ئەو کەنیزەکەمان پێ بەخشیت بە خۆڕایی، واتە بە بێ پارەو پوڵ تۆش مارەی بکە. ئەو پیاوە

له خۆراسانەوە هاتبوو بۆ مەدینە بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە. جا سالح کوڕی ئەبو موسایە پێی ئەفەرموێ: (أعطيناكها بغير شئ، قد كان يركب فيما دونها إلى المدينة) بێگومان سەفەر ئەکرا لەبەر کەمی لەم مەسەلەیەدا کە تۆ پرسیاری لێ دەکەیت، وە ئەو هاتن و سەفەرە بۆ مەدینە لە وڵاتی دوورەوە بۆ چەرخی پێغەمبەرﷺ و خولەفای راشیدین بووە، بەڵام دوای ئەوە کە موسڵمانان بڵاو بوونەتەوە بە جیهاندا هەر زانایەو لە وڵاتی خۆیدا وەڵامی پرسیار ئەداتەوە بەسە.

بەراستی بەم تحقیقاتە ئەبێ معنای ئەو وتەی سالحە ئەئەزانرا، ئینجا با بزانرێ ئەو ئەهلی کیتابە کە دوو ئەجری هەیە ئەوانەن کە لە شەریعەتەکەی خۆیاندا لەسەر بارە راستەکەی ئەو ئایینە مابێتەوە، دەی بە شایەتی قورئان واقیعیش نە شەریعەتی تەورات و نە شەریعەتی ئینجیل هەر لە سەرەتای ئیسلام لەسەر باری راستەقینە نەمانەوەو دەست کاری خراپ کران و ئاشکرایە کە بەناو نەبێ پەیوەندیان نەماوە بە شەریعەتەکەی خواوە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٥٤٤، ٢٥٤٧، ٢٥٥١، ٣٠١١، ٣٤٤٦، ٥٠٨٣)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣٢ـ بابُ عِظَةِ الإِمَامِ النِّسَاءَ وَتَعْلِيمِهِنَّ

٩٨ـ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بنُ حَرْبٍ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَيُوبَ قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءً قَالَ سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسَ قَالَ: أَشْهَدُ عَلَى النَّبِيِّﷺ -أَوْ قَالَ عَطَاءٌ أَشْهَدُ عَلَى ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِﷺ- خَرَجَ مَعَهُ بِلاَلٌ فَظَنَّ أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعْ، فَوَعَظَهُنَّ، وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تُلْقِي الْقُرْطَ وَالْخَاتَمَ، وَبِلاَلٌ يَأْخُذُ فِي طَرَفِ ثَوْبِهِ.

(باب عظة الإمام النساء وتعليمهن) ئەمە بابی ئامۆژگاری ئیمامە بۆ ئافرەتان و فێرکردنیان. لە بابی پێشوودا باسی فێرکردنەکە دەکات بەڵام ئەمە گشتییە، واتە ئەبێ سەرۆکی موسڵمانان یان جێگریان هەڵسن بەو ئامۆژگاری و فێرکردنە. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە -خوا لێیان رازی بێت- کە (أن رسول اللهﷺ- خرج معه بلال فظن أنه لم يسمع) پێغەمبەرﷺ تەشریفی چوو بۆ ناو کۆمەڵی ئافرەتان وە لای وابوو فەرموودەکانی نابیسن، فەرمووی با بیلال بێت (فوعظهن، و أمرهن بالصدقة) ئینجا

ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێدان بە سەدەقە (فجعلت المرأة تلقي القرط والخاتم، وبلال يأخــذ في طرف ثوبه) ئینجا ئافرەتەکان گوێدارەو ئەنگوستیلەیان دائەناو بیلالیش ئەیچنینەوەو ئەیخستنە کۆشی و پۆشاکی.

لەم حەدیسەوە دەرئەکەوێ کە سەدەقەکە بە دەستی خۆی بدرێ یان حەواڵە بکرێ بە هۆی یەکێکی ترەوە هەر چاکەو ئافرەت دروستە ماڵی خۆی بە بێ پرسی مێردەکەی بکات بە سەدەقە و سەدەقە زۆر لە گوناه ئەسڕێتەوە کە خاوەنەکەی ئەخاتە ئاگر.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٨٦٣، ٩٦٢، ٩٧٥، ٩٧٧، ٩٧٩، ٩٨٩، ١٤٣١، ١٤٤٩، ١٨٩٥، ٥٢٤٩، ٥٨٨٠، ٥٨٨٣، ٧٣٢٥)دا دووبارە بووەتەوە.

***　　***　　***

### ٣٣ـ بابُ الْحِرْصُ عَلَى الْحَدِيْث

٩٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدُالْعَزِيْزُ بنُ عَبْدِاللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ عَنْ عَمْرِو بنِ أَبِي عَمْرٍو عَنْ سَعِيْدِ ابْنِ أَبِي سَعِيْدِ الْمَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ قَالَ: قِيْلَ يَا رَسُولَ اللهِ مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ؟ قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: «لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْ لاَ يَسْأَلَنِي عَنْ هَذَا الْحَدِيْثِ أَحَدٌ أَوَّلُ مِنْكَ، لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيْثِ، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ: لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ خَالِصًا مِنْ قَلْبِهِ، أَوْ نَفْسِهِ».

(باب الحرص على الحديث) ئەمە بابی هاندانە لەسەر حەدیس و لەبەر کردنی حەدیس، لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (قيل يا رسول الله من أسعد الناس بشفاعتك يوم القيامة؟) عەرزی کرا ئایا کێ بەهرەمەند ترینە بە تکاو شەفاعەتی تۆ ئەی پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی دواییدا؟ (قال رسول اللهﷺ: «لقد ظننت يا أبا هريرة أن لا يسألني عن هذا الحديث أحد أول منك، لما رأيت من حرصك على الحديث) فەرمووی: بەراستی من لام وابوو کە هیچ کەسێک پێشت ناکەوێ لەم پرسیارە، لەبەر ئەوە ئەبینم لە تۆدا کە زۆر حەریصیت لەسەر حەدیس، ئینجا وەڵامی پرسیارەکەی دایەوەو فەرموی: (أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال: لاإله إلا الله خالصا من قلبه، أو نفسه») بەهرەمەند ترین کەس بە شەفاعەتی من کەسێکە کە بڵێ (لا إلــه إلا الله) وە گوتنەکەی بەپاک و

خاوێنی‌یەوە بێت و لە دڵی‌یەوە بێت.یان فەرموی: لە نەفسی‌یەوە بێت.

بەڵێ ئەم وشە پیرۆزە قسەی رووت نی‌یە، بەڵکو عەقیدەو بەڵێنە بە راستی کە تەنها خوا خوایەو کار بەدەستەو حاکمەو هەر بەرنامەی ئەو هەیەو نابێ هیچ حوکم و بەرنامەیەکی تر روو بکاتە دڵی ئەو کەسەی کە ئەم پەیمانە ئەدات و نابێ هیچ کارو کردەوەیەکی دژی ئەم بەڵێن و پەیمانە بێت رووی تێ بکات.

دەی هەرکەسێک عەقیدەو بۆچوونی ئاوا بێت بێگومان بەهەرمەند ئەبێ بە تکاو شەفاعەتی پێغەمبەر. وە تەنها عەقیدەو باوەڕی رووت بەس نی‌یە، بەڵکو ئەبێ ئەم وتە پیرۆزە بە دەمیش بڵێ ماتوڵ زمانی بێ ئەگەر زمانی نەبوو ئەبێ بە ئیشارەت بیڵێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٦٥٧٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣٤ـ بابُ كَيْفَ يُقْبَضُ الْعِلْمُ.

وَكَتَبَ عُمَرُ بنُ عَبْدِالْعَزِيزِ إِلَى أَبِي بَكْرِ بنِ حَزْمٍ: انْظُرْ مَا كَانَ مِنْ حَدِيْثِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَاكْتُبْهُ، فَإِنِّي خِفْتُ دُرُوسَ الْعِلْمِ وَذَهَابَ الْعُلَمَاءِ وَلاَ تَقْبَلْ إِلاَّ حَدِيْثَ النَّبِيِّ ﷺ. وَلْتُفْشُوا الْعِلْمَ. وَلْتَجْلِسُوا حَتَّى يُعَلَّمَ مَنْ لاَ يَعْلَمُ، فَإِنَّ الْعِلْمَ لاَ يَهْلِكُ حَتَّي يَكُونَ سِرّاً.

حَدَّثَنَا الْعَلاَءُ بنُ عَبْدِالْجَبَّارِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْعَزِيزِ بنِ مُسْلِمٍ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ دِيْنَارٍ بِذَلِكَ. يَعْنِي حَدِيْثَ عُمَرَ بنِ عَبْدِالْعَزِيزِ إِلَى قَوْلِهِ: «ذَهَابَ الْعُلَمَاءِ».

١٠٠ـ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بنُ أَبِي أُوَيْسٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَنْ هِشَامِ بنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْرِو بنِ الْعَاصِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ اللهَ لاَ يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ الْعِبَادِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ حَتَّى إِذَا لَمْ يَبْقَ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالاً فَسُئِلُوا فَأَفْتَوا بِغَيْرِ عِلْمٍ فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا».

قَالَ الْفِرَبْرِيُّ حَدَّثَنَا عَبَّاسٌ قَالَ: حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنْ هِشَامٍ نَحْوَهُ.

(باب كيف يقبض العلم) ئەمە بابێکە باسی چۆنیەتی نەمانی عیلممان بۆ ئەکات، ئینجا لە بارەی چارەسەرکردنی ئەم موشکیلە گەورەیە فەرمودەی عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەهێنێ کە نووسی بۆ لای أبوبکری کوڕی حەزم (انظر ما کان من حدیث رسول الله ﷺ

فاكتبه ) سەرنج بدە هەر حەدیسێکی پێغەمبەرت دەست کەوت بینووسە (فإني خفت دروس العلم وذهاب العلماء) چونکە بە راستی من مەترسی دەکەم لە لەبیر چوونی عیلم و نەمانی زاناکان (ولا تقبل إلا حديث النبيﷺ ) وەبێجگە لە حەدیسی پێغەمبەرﷺ هیچی تر وەرمەگرە (ولتفشوا العلم. ولتجلسوا حتى يعلم من لا يعلم) عیلم بلاو بکەنەوەو دانیشن بۆی و دانیشتنی تایبەتی بۆ بکەن هەتا ئەوەی کە نازانێ زانا بکرێ وزانا بێ (فإن العلم لا يهلك حتى يكون سرا ) چونکە عیلم نافەوتێ هەتا نەبێتە شتێکی نهێنی.

ئیمامی بوخاری (حدثنا العلاء بن عبدالجبار قال: حدثنا عبدالعزيز بن مسلم عن عبدالله بن دينار بذلك. يعني حديث عمر بن عبدالعزيز إلى قوله: «ذهاب العلماء») لەوەو پێش حەدیس بەو جۆرە بە گرنگی نەنووسرا، بەڵکو لەبەر ئەکراو ئیعتیماد لەسەر ئەوە ئەدرا تا ئەو خەلیفە راشدە فەرمانی داو خەڵکی بە گرنگی دەستیان کرد بە نووسینی حەدیس خوا پاداشتی بداتەوە.

ئینجا ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە عبداللەی کوڕی عمری کوڕی عاص کە (قال: سمعت رسول اللهﷺ يقول: «إن الله لا يقبض العلم انتزاعا ينتزعه من العباد) بیستم لە پێغەمبەرﷺ کە فەرموی: خوا عیلم بەم جۆرە ناهێڵێ کە لە دڵی خەڵکی داڕنێ (ولكن يقبض العلم بقبض العلماء حتى إذا لم يبق عالما إتخذ الناس رءوسا جهالا فسئلوا فأفتوا بغير علم فضلوا و أضلوا») هەتا وای لێ دێ عالمێ ناهێڵێ ئینجا خەڵکی چەند سەرۆک و کاربەدەستێکی نەزان بۆ خۆیان بڕیار ئەدەن و خەڵکی پرسیار دەکات لەو سەرۆکە نەزانانەو ئەوانیش وەڵام و فتوا ئەدەن لە خۆوەو بە بێ زانین و بە هۆی ئەوەوە خۆشیان گومڕا ئەبن و خەڵکیش گومڕائەکەن. خوا پەنامان بدات.

*** *** ***

## ٣٥ـ بابُ هَلْ يُجعَلُ لِلنِّساءِ يَوْمٌ عَلَى حِدَةٍ فِي الْعِلْمِ؟

١٠١ـ حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ حَدَّثَنِي ابْنُ الأَصْبَهَانِي قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا صَالِحٍ ذَكْوَانَ يُحَدِّثُ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَتِ النِّسَاءُ لِلنَّبِيِّﷺ غَلَبَنَا عَلَيْكَ الرِّجَالُ فَاجْعَلْ لَنَا يَوْمًا مِنْ نَفْسِكَ. فَوَعَدَهُنَّ يَوْمًا لَقِيَهُنَّ فِيهِ فَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ، فَكَانَ فِيمَا قَالَ

لَهُنَّ: «مَا مِنكُنَّ امْرَأَةٌ تُقَدِّمُ ثَلاثَةً مِنْ وَلَدِهَا إِلاَّ كَانَ لَهَا حِجَابًا مِنَ النَّارِ» فَقَالَتِ امْرَأَةٌ: وَاثْنَيْنِ؟ فَقَالَ: «وَاثْنَيْنِ».

١٠٢ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ: حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَبْدِالرَّحْمَنِ ابْنِ الأَصْبَهَانِي عَنْ ذَكْوَانَ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ بِهَذَا.

وَعَنْ عَبْدِالرَّحْمَنِ ابْنِ الأَصْبَهَانِي قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا حَازِمٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: ثَلاثَةً لَمْ يَبْلُغُوا الْحِنْثَ».

(باب هل يجعل للنساء يوم على حدة في العلم؟) ئەمە بابی ئەوەیە ئایا ڕۆژێکی جیاوازو تایبەتی دائەنرێ بۆ ئافرەتان بۆ زانین و فێرکردن؟ لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە، ئینجا لەو ڕۆژە تایبەتیانەدا (قالت النساء للنبي ﷺ غلبنا عليك الرجال فاجعل لنا يوما من نفسك) ئافرەتان گوتیان پیاوان زاڵ بوون بەسەرماندا لە بارەی تۆوە، کەواتە ڕۆژێکمان لە خۆت بۆ دیاریی بکە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (فوعدهن يوما لقيهن فيه فوعظهن و أمرهن) ئەویش بەڵێنی ڕۆژێکی پێدان کە لەو ڕۆژەدا ئامۆژگاریان بکات، ئەویش ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێدان (فكان فيما قال لهن «ما منكن امرأة تقدم ثلاثة من ولدها إلا كان لها حجابا من النار») ئینجا لەوەی کە پێی فەرمون ئەمە بوو: هەر ئافرەتێ لە ئێوە کە سێ منداڵ پێش بخات، واتە سێ منداڵی بمرێ پێش خۆی، ئەوە ئەبێ بە حجاب و بەرهەڵست بۆی لە ئاگر (فقالت امرأة: واثنين؟ فقال: «واثنين») ئافرەتێک عەرزی کردو دوانیش هەر وایە؟ ئەویش فەرموی: دوانیش هەر وایە. دیارە ئەمە بۆ ئافرەتێکە کە خۆگر بێت و چاوەڕوانی پاداشتی خوا بکات، وەک لە حەدیسی تردا هاتووە. لەبابی جنائزدا دێت بۆ یەک منداڵیش ئەو بەهرە هەیەو لوتف و بەزەیی خوا بێ سنوورە.

هەر لەم بارەیەوە ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئەبو سەعیدی خودرییەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە هەواڵەکە ئەدات. وەلە ئەبو هورەیرەوە ئەمە هاتووە: («ثلاثة لم يبلغوا الحنث») سێ منداڵ کە بالغ نەبووبن.

*** *** ***

## ٣٦ـ باب مَن سَمِعَ شَيْئًا فَرَاجَعَ حَتَّى يَعْرِفَهُ

١٠٣ـ حَدَّثَنَا سَعِيدُ بنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا نَافِعُ بنُ عُمَرَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ أَبِي مُلَيْكَةَ أَنَّ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ كَانَتْ لاَ تَسْمَعُ شَيْئًا لاَ تَعْرِفُهُ إلاَّ رَاجَعَتْ فِيهِ حَتَّى تَعْرِفَهُ، وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حُوسِبَ عُذِّبَ» قَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ: أَوَ لَيْسَ يَقُولُ اللهُ تَعَالَى: ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾ (الانشقاق:٨) قَالَتْ: فَقَالَ: «إِنَّمَا ذَلِكَ الْعَرْضُ، وَلَكِنْ مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ يَهْلِكْ».

(باب من سمع شيئا فراجع حتى يعرفه) ئەمە بابی کەسێکە شتێ ببیستێ و هەر بیلێتەوە هەتا باش بیزانێ. لەم بارەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو مالیکەوە کە عائشە خێزانی پێغەمبەرﷺ (کانت لا تسمع شیئا لا تعرفه إلا راجعت فیه حتی تعرفه) هەر شتێکی ببیستایە نەیزانیایە هەر ئەیگوتەوە هەتا ئەیناسی و ئەیزانی. وە بەڵگە لەسەر ئەوە ئەهێنێ کە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: («من حوسب عذب») هەرکەسێ موحاسەبەی بکرێ سزا ئەدرێ (قالت عائشة فقلت: أو لیس یقول الله تعالی: ﴿فسوف یحاسب حسابا یسیرا﴾ «الانشقاق:٨») دایکی ئیماندارانیش ئەفەرموێ: منیش وتم: چۆن ئەوە ئەفەرموی؟ ئایا خوای گەورە نافەرموێ دەبارەی ئەوانەی کە نامەیان ئەدرێ بە دەستی راستیانەوە: ئەوانە موحاسەبە ئەکرێن بە موحاسەبەیەکی سوک. (قالت: فقال: «إنما ذلك العرض، ولکن من نوقش الحساب یهلك») دایکی ئیمانداران ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەوە موحاسەبە نیە ئەوە خستنە بەر چاوێکەو و محاسەبە نیە، بەڵام ئەو کەسە کە موحاسەبە بکرێ و لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکرێ بە هیلاکدا ئەچێ.

لەم حەدیسەوە دەرئەکەوێ کە دایکی ئیمانداران چەند سوور بووە لەسەر تێگەیشتن و وەرگرتنی حەدیس وعیلم -خوای لێ رازی بێت-. ئەم جۆرە موناقەشەو لێکۆڵینەوە بووە لە لایەن هاوەڵەکانەوەو هەمووی بۆ روون بوونەوەو تێگەیشتن بووە لە حەقیقەتی کارێکی گرنگی ئیسلامی نەک لەبەر شتێکی تر، وەک تێپەری کرد لە هەندێ پرسیاری بێ نرخ کە ئەکرا تا ئایەت هاتە خوارەوە: ﴿لا تسئلوا عن أشیاء إن تبد لکم تسؤکم﴾.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٩٣٩، ٦٥٣٦، ٦٥٣٧)دا دووبارە بووەتەوە.

## ٣٧ـ باب لِيُبَلِّغِ الْعِلْمَ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ

قَالَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

١٠٤ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ حَدَّثَنِي سَعِيدٌ عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَمْرِو بنِ سَعِيدٍ -وَهُوَ يَبْعَثُ الْبُعُوثَ إِلَى مَكَّةَ- : ائْذَنْ لِي أَيُّهَا الأَمِيرُ أُحَدِّثْكَ قَوْلاً قَامَ بِهِ النَّبِيُّ ﷺ الْغَدَ مِنْ يَوْمِ الْفَتْحِ، سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ وَوَعَاهُ قَلْبِي، وَأَبْصَرَتْهُ عَيْنَايَ حِينَ تَكَلَّمَ بِهِ: حَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «إِنَّ مَكَّةَ حَرَّمَهَا اللهُ وَلَمْ يُحَرِّمْهَا النَّاسُ، فَلاَ يَحِلُّ لاِمْرِئٍ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ يَسْفِكَ بِهَا دَمًا، وَلاَ يَعْضِدَ بِهَا شَجَرَةً، فَإِنْ أَحَدٌ تَرَخَّصَ لِقِتَالِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِيهَا فَقُولُوا: إِنَّ اللهَ قَدْ أَذِنَ لِرَسُولِهِ وَلَمْ يَأْذَنْ لَكُمْ، وَإِنَّمَا أَذِنَ لِي فِيهَا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، ثُمَّ عَادَتْ حُرْمَتُهَا الْيَوْمَ كَحُرْمَتِهَا بِالأَمْسِ، وَلْيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەكانی: (١٨٣٢، ٤٢٩٥)دا دووبارە بووەتەوە.

فَقِيلَ لأَبِي شُرَيْحٍ: مَا قَالَ عَمْرٌو؟ قَالَ: أَنَا أَعْلَمُ مِنْكَ يَا أَبَا شُرَيْحٍ، لاَ يُعِيذُ عَاصِيًا، وَلاَ فَارًّا بِدَمٍ، وَلاَ فَارًّا بِخَرْبَةٍ.

١٠٥ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ عَبْدِ الْوَهَّابِ قَالَ حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ مُحَمَّدٍ عَنِ ابْنِ أَبِي بَكْرَةَ عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ذُكِرَ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ: «فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ -قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ وَأَعْرَاضَكُمْ- عَلَيْكُمْ حَرَامٌ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِي شَهْرِكُمْ هَذَا. أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ مِنْكُمُ الْغَائِبَ»، وَكَانَ مُحَمَّدٌ يَقُولُ: صَدَقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، كَانَ ذَلِكَ «أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ» مَرَّتَيْنِ.

(باب ليبلغ العلم الشاهد الغائب) ئەمە بابی ئەوەیە با ئەوەی كە ئاگایەو حازرە راگەیەنێ بەو كەسەی كە حازر نی‌یە. (قاله ابن عباس عن النبي ﷺ) ئەم فەرمودەیەی ئیبن عەباس لە پێغەمبەرەوەیە ﷺ.

ئینجا لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عمری كوڕی سعیدەوە كە ئەمیر بوو لە لایەن یزیدەوە بۆ سەر مەدینەو فەرمانی پێ درا كە لەشكر بنێرێ بۆ سەر مەككە بۆ جەنگ لەگەڵ

عبداللەی کوڕی زوبێردا. جا لەوێدا ئەبو شریح گوتی بە عەمری کوڕی سعید: (ائذن لي أيها الأمير أحدثك قولا قام به النبيﷺ الغد من يوم الفتح) ئیزنم بدە ئەی ئەمیر با وتەیەکت بۆ باس بکەم کە پێغەمبەرﷺ لە بەیانی فەتحی مەککەدا فەرمووی، (سمعته أذناي ووعاه قلبي، و أبصرته عيناي حين تكلم به: حمد الله وأثنى عليه ثم قال: «إن مكة حرمها الله ولم يحرمها الناس، فلا يحل لامرئ يؤمن بالله واليوم الآخر أن يسفك بها دما، ولا يعضد بها شجرة) هەردوو گوێم بیستی و دڵم وەری گرت و تێگەیشت و هەردوو چاوم بینی کاتێ کە: سوپاس و سەنای خوای کردو ئینجا فەرمووی: شاری مەککە خوا حەرامی کردووەو ئەو ڕێزەی پێداوە خەڵکی حەرامی نەکردووە، کەواتە حەڵاڵ نییە بۆ هەرکەسێک کە باوەڕی بێ بە خواو ڕۆژی دوایی هیچ خوێنێکی تێدا بڕژێنێ و هیچ دارو درەختێکی تێدا ببڕێ (فإن أحد ترخص لقتال رسول اللهﷺ فيها فقولوا: إن الله قد أذن لرسوله ولم يأذن لكم) ئینجا ئەگەر هاتو کەسێک ڕوخسەت بۆ خۆی دابنێ بە هۆی ئەو شەڕەی کە پێغەمبەر کردی لە کاتی فەتحی مەککەدا، پێی بڵێ خوا ئیزنی ئەوی داوەو ئیزنی نەداوە بە ئێوە (و إنما أذن لي فيها ساعة من نهار، ثم عادت حرمتها اليوم كحرمتها بالأمس) ئیزنی بۆ من دا لە ماوەی یەک ڕۆژد، لە خۆر کەوتنەوە تا عەسر، ئینجا پاش ئەو ماوەیە ڕێزو حورمەتەکەی ئەمڕۆی دووبارە بوویەوە وەک حورمەتەکەی دوێنێ (وليبلغ الشاهد الغائب) با ئەوەی ئامادەیە بیگەیەنێ بەوەی کە ئامادە نییە.

ئینجا گوترا بە ئەبی شورەیح عمرو چی گوت؟ (قال: أنا أعلم منك يا أبا شريح، لا يعيذ عاصيا، ولا فارا بدم، ولا فارا بخربة) بەڵێ پەنای هیچ تاوانبارێک نادا کە حەدێکی لەسەر بێت وە پەنای کەس نادا کە قصاصی شەرعی لەسەر بێت، وە پەنای کەسێک نادات کە دزی لەسەر ئیسپات بووبێ. یان فەسادو ئاژاوەی نابێتەوە.

لەم حەدیسەدا فضلی ئەبو شریح دەرکەوت کە بە ڕێکی ئەوەی زانی ڕایگەیاند خوا لێی ڕازی بێت لە کۆتایی ئەو کارە بەدانەی کە یزید هەڵسا پێی هەموو ئەهلی مەدینە خەلعیان کرد لە ئەمیری. بەراستی کارەکە هەتا بیری لێ بکرێتەوە سەخت و جەرگ بڕە مەگەر هەر قسەکەی خەلیفە عمر عبدالعزیز بکەین کە فەرمووی: (تلك دماء طهر الله منها أيدينا

فلا نلوث بها ألسنتنا) ئەگەر ئاوا ئیختیلاف و دووبەرەکی نەبوایە کاری موسڵمانان جۆرێکی تر ئەبوو رێگە نەئەبوو کە دوژمن دەمبازی بکات بەو جۆرانەی کە ئەبیسترێ. سەرۆکی ئەڵمانیا گوتی: پێویستە لەسەر ئێمە هەیکەلێکی ئاڵتونێن دروست بکەین بۆ معاویەو لەسەر جادەکانمان دایبنێین، چونکە ئەگەر معاویە نەبوایە ئەبوایە ئێمە عەرەب و موسڵمان بووینایە. هەزار داخ و مەراق وەڵامان بۆ معاویەو عەمری کوڕی عاس هەر ئەوەیە کردەوەکانیان هەڵە بوون و ئەوان معصوم نین و لەم ئومەتەدا هەر پێغەمبەری ئازیزﷺ معصومە. بەڵام با بزانرێ بە اتفاقی هەموو زانایانی سوننەت حەزرەتی عەلی لەسەر حەق بووەو ئەوانەی تر مخالیف لە ئیمامی حەق هەڵگەڕاونەتەوەو هەرکام دەلیل و بەڵگەیەکی بۆ خۆی دارنیوە، ئیتر با بەس بێت.

هەر لەم بابەدا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئەبوبەکرەوە کە ئەڵێ: (ذكر النبيﷺ قال:) باسی پێغەمبەرﷺ کرا، واتە باسی ئەو خوتبەو فەرمودەیە کرا کە ئەمەی تێدا بوو: («فإن دماءكم و أموالكم» خوێن و ماڵتان (-قال محمد: و أحسبه قال و أعراضكم-) محمد ئەڵێ (واتە ئیبن سیرین)وا ئەزانم فەرمووی: ئاموسیشتان. لەسەر هەر بار فەرمووی: (عليكم حرام كحرمة يومكم هذا، في شهركم هذا) حەرام و قەدەغەیە لەسەرتان وەک حەرامی ئەم رۆژەتان لەم شارەتاندا واتە مەککە. ئینجا فەرمووی: (ألا ليبلغ الشاهد منكم الغائب») با ئەوانەتان کە حازرن بیگەیەنن بەوانەتان حازر نین. (وكان محمد يقول: صدق رسول اللهﷺ، كان ذلك «ألا هل بلغت» مرتين) وە محمد گوتی پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئایا گەیاندم پێتان. دووجار ئەوەی فەرموو.

*** *** ***

## ٣٨ـ بابُ إِثْمِ مَنْ كَذَبَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ

١٠٦ـ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بنُ الْجَعْدِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أخْبَرَنِي مَنْصُورٌ قَالَ: سَمِعْتُ رِبْعِيَّ بنَ حِرَاشٍ يَقُولُ: سَمِعْتُ عَلِيًّا يَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ تَكْذِبُوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ فَلْيَلِجِ النَّارَ».

١٠٧ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيْدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ جَامِعِ بنِ شَدَّادٍ عَنْ عَامِرِ بنِ عَبْدِاللهِ

بنِ الزُبَيْرِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قُلْتُ لِلزُبَيْرِ: إِنِّي لاَ أَسْمَعُكَ تُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ كَمَا يُحَدِّثُ فُلاَنٌ وَفُلاَنٌ. قَالَ: أَمَا إِنِّي لَمْ أُفَارِقْهُ، وَلَكِنْ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

١٠٨ـ حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَارِثِ عَنْ عَبْدِالْعَزِيزِ قَالَ أَنَسٌ: إِنَّهُ لَيَمْنَعُنِي أَنْ أُحَدِّثَكُمْ حَدِيثًا كَثِيرًا أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: مَنْ تَعَمَّدَ عَلَيَّ كَذِبًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

١٠٩ـ حَدَّثَنَا مَكِّيُّ بنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ بنُ أَبِي عُبَيْدٍ عَنْ سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ يَقُلْ عَلَيَّ مَا لَمْ أَقُلْ فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

١١٠ـ حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ أَبِي حَصِينٍ عَنْ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «تَسَمَّوْا بِاسْمِي، وَلاَ تَكْتَنُوا بِكُنْيَتِي. وَمَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لاَ يَتَمَثَّلُ فِي صُورَتِي. وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٥٣٩، ٦١٨٨، ٦١٩٧، ٦٩٩٣)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب إثم من كذب علی النبي ﷺ) ئەمە بابی کەسێکە درۆ بە دەم پێغەمبەری ئازیزەوە هەڵبەستێ. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ربعی کوڕی حراشەوە کە ئەفەرموێ: (سمعت عليا يقول: قال النبي ﷺ :«لا تكذبوا علي، فإنه من كذب علي فليلج النار») بیستم لە عەلی کە وتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: درۆم بە دەمەوە مەکەن، چونکە هەرکەس درۆ بە دەم منەوە بکات با بچێتە ئاگر. واتە بێگومان دەچێتە ئاگر. لە چەند شوێنێکی تردا گوتراوە ئەم جۆرە هەڕەشەو هەواڵانە کاتێ ئەبێ کە تاوانبار تۆبە نەکات و لەسەر ئەوبارە بمرێ، ئەگینا هەر گوناهێ تەوبەی لەسەر کرا قابیی عەفو و بەزەیی خوا ئەوەندە پان و فراوانە سنووری نی‌یە. خوایە لەو لوتف و بەزەیی‌یە بەشدارمان بکە، آمین.

هەندێ لە جاهیلان گوتیان: ئەم حەدیسە ئەفەرموێ: درۆ بە دژی من مەکەن، چونکە وتەی علی وا ئەگەیەنێ. کەواتە ئەگەر درۆ کرا لەبەر بەرژەوەندی قەیناکات!! جا بەو پێیە حەدیسی زۆریان دەست هەڵبەست کردووە بۆ ترهیب و ترغیب، ئەگەر ریوایەتی وایش بێ هەر مەبەست جڵەوگیریی‌یە لە درۆ کردن بە هەرجۆر.

لەم بابەدا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە عامری کوڕی عبداللەی زوبێرەوە کە (قال: قلت لزبیر: إني لا أسمعك تحدث عن رسول اللهﷺ كما يحدث فلان وفلان) ئەڵێ: من نابیستم لێت کە لە پێغەمبەرەوە حەدیس ریوایەت بکەیت وەک فلان و فلان (قال: أما إني لم أفارقه، ولكن سمعته يقول: «من كذب علي فليتبوأ مقعده من النار») ئەویش وتی: بزانە من جیا نەبوومەتەوە لە پێغەمبەری خواﷺ، بەڵام لێم بیستووە کە ئەیفەرموو: هەرکەس درۆ بە دەم منەوە بکات باجێی خۆی ئامادە بکات لەناو ئاگردا. واتە ریوایەتی زۆر ناکەم نەوەک هەڵە بکەم وحەدیسی ناڕاست بڵێم.

وەک لەم حەدیسەشدا روونی ئەکاتەوەو ئەیهێنێ لە ئەنەسەوە: (إنه ليمنعني أن أحدثكم حديثا كثيرا أن النبيﷺ قال: من تعمد علي كذبا فليتبوأ مقعده من النار») یان ئەم حەدیسە کە ئەیهێنێ لە سەلەمەوە کە (قال: سمعت النبيﷺ يقول: «من يقل ما لم أقل فليتبوأ مقعده من النار»).

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ کە ئەیفەرموو: («تسموا باسمي، ولا تكتنوا بكنيتي. ومن رآني في المنام فقد رآني، فإن الشيطان لا يتمثل في صورتي. ومن كذب علي متعمدا فليتبوأ مقعده من النار») ئیمامی بوخاری تەرتیبێکی شیرینی کردووە لە حەدیسەکانی ئەم بابەدا، لە یەکەم جارەوە دەست ئەکات بە حەدیسەکەی ئیمامی عەلی کە مەبەستی بابەکەی تێدایە، دووەم حەدیسەکەی زوبێر ئەهێنێ کە باسی خۆپارێزی هاوەڵانی تێدایە لە ریوایەت کردن نەوەک دووچاری درۆ بێن، سێیەم حەدیسەکەی ئەنەس ئەهێنێ کە ئەوە نیشان ئەدات خۆپاراستنی هاوەڵەکان لەبەر ئەو مەترسییەیە نەک لە ریوایەت کردنی حەدیس کە پێویستە، چونکە پێویست کراوە لەسەریان راگەیاندنی. ئینجا کۆتایی ئەهێنێ بە حەدیسەکەی ئەبو هورەیرە کە ئەوە نیشان ئەدات درۆ کردن بە دەم پێغەمبەرەوەﷺ لە بێداریدا بێت، یان لە خەودا وەک یەکن.

*** *** ***

## ٣٩ـ بابُ كِتَابَةِ الْعِلْمِ

١١١ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ سَلاَمٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا وَكِيعٌ عَنْ سُفْيَانَ عَنْ مُطَرِّفٍ عَنِ الشَّعْبِيِّ

عَنْ أبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ: هَلْ عِنْدَكُمْ كِتَابٌ؟ قَالَ: لاَ، إِلاَّ كِتَابُ اللهِ، أَوْ فَهْمٌ أُعْطِيَهُ رَجُلٌ مُسْلِمٌ، أَوْ مَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ. قَالَ قُلْتُ: فَمَا فِي هَذِهِ الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ الْعَقْلُ، وَفَكَاكُ الأَسِيرِ، وَلاَ يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٨٧٠، ٣٠٤٧، ٣١٧٢، ٣١٧٩، ٦٧٥٥، ٦٩٠٣، ٦٩١٥، ٧٣٠٠ )دا دووبارە بووەتەوە.

١١٢ـ حَدَّثَنَا أبُو نُعَيْمٍ الْفَضْلُ بنُ دُكَيْنٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ عَنْ يَحْيَى عَنْ أبِي سَلَمَةَ عَنْ أبِي هُرَيْرَةَ أنَّ خُزَاعَةَ قَتَلُوا رَجُلاً مِنْ بَنِي لَيْثٍ عَامَ فَتْحِ مَكَّةَ بِقَتِيلٍ مِنْهُمْ قَتَلُوهُ، فَأُخْبِرَ بِذَلِكَ النَّبِيُّ ﷺ فَرَكِبَ رَاحِلَتَهُ فَخَطَبَ فَقَالَ: «إِنَّ اللهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْقَتْلَ -أَوِ الْفِيلَ. شَكَّ أَبُو عَبْدِاللهِ- وَسَلَّطَ عَلَيْهِمْ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَالْمُؤْمِنِينَ. أَلاَ وَإِنَّهَا لَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَلَمْ تَحِلَّ لأَحَدٍ بَعْدِي. أَلاَ وَإِنَّهَا حَلَّتْ لِي سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ. أَلاَ وَإِنَّهَا سَاعَتِي هَذِهِ حَرَامٌ لاَ يُخْتَلَى شَوْكُهَا، وَلاَ يُعْضَدُ شَجَرُهَا، وَلاَ تُلْتَقَطُ سَاقِطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ. فَمَنْ قُتِلَ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ إِمَّا أَنْ يُعْقَلَ، وَإِمَّا أَنْ يُقَادَ أَهْلُ الْقَتِيلِ». فَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ فَقَالَ: اكْتُبْ لِي يَا رَسُولَ اللهِ. فَقَالَ: «اكْتُبُوا لأَبِي فُلاَنٍ». فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ قُرَيْشٍ: إِلاَّ الإِذْخِرَ يَا رَسُولَ اللهِ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ فِي بُيُوتِنَا وَقُبُورِنَا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِلاَّ الإِذْخِرَ» قَالَ أَبُو عَبْدِاللهِ: يُقَالُ: يُقَادُ بِالْقَافِ. فَقِيلَ لأَبِي عَبْدِاللهِ أَيُّ شَيْءٍ كَتَبَ لَهُ: قَالَ كَتَبَ لَهُ هَذِهِ الْخُطْبَةَ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٤٣٤، ٦٨٨٠)دا دووبارە بووەتەوە.

١١٣ـ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بنُ عَبْدِاللهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرٌو قَالَ: أَخْبَرَنِي وَهْبُ ابْنُ مُنَبِّهٍ عَنْ أَخِيهِ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: مَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَحَدٌ أَكْثَرَ حَدِيثًا عَنْهُ مِنِّي، إِلاَّ مَا كَانَ مِنْ عَبْدِاللهِ ﷺ بنِ عَمْرٍو فَإِنَّهُ كَانَ يَكْتُبُ وَلاَ أَكْتُبُ.

تَابَعَهُ مَعْمَرٌ عَنْ هَمَّامٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ.

١١٤ـ حَدَّثَنَا يَحْيَى بنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنِي ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي يُونُسُ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِاللهِ بنِ عَبْدِاللهِ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لَمَّا اشْتَدَّ بِالنَّبِيِّ ﷺ وَجَعُهُ قَالَ: «ائْتُونِي بِكِتَابٍ أَكْتُبُ لَكُمْ كِتَابًا لاَ تَضِلُّوا بَعْدَهُ» قَالَ عُمَرُ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ غَلَبَهُ الْوَجَعُ، وَعِنْدَنَا

كِتَابُ اللهِ حَسْبُنَا، فَاخْتَلَفُوا، وَكَثُرَ اللَّغَطُ. قَالَ: قُومُوا عَنِّي، وَلاَ يَنْبَغِي عِنْدِيَ التَّنَازُعُ. فَخَرَجَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ: إِنَّ الرَّزِيَّةَ كُلَّ الرَّزِيَّةِ مَا حَالَ بَيْنَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَبَيْنَ كِتَابِهِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٠٣٥، ٣١٦٨، ٤٤٣١، ٤٤٣٢، ٥٦٦٩، ٧٣٦٦)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب كتابة العلم) ئەمە بابی پێویستی نووسینی عیلمە. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو جوحەیفەوە کە (قال: قلت لعلي: هل عندكم كتاب؟) ئەڵێ: گوتم بە عەلی ئایا لاتان هەیە هیچ نووسراوێکی تایبەتی کە لە پێغەمبەرتان وەرگرتبێ؟ ئەم پرسیارە بە چەند ریوایەتێک هەیەو هەمووی هەر یەک مەبەستەو ئەوە ئەگرێتەوە کە ئایا (أهل البيت) هیچ شتێکی تایبەتی‌یان لایە زیاد لە قورئان وەک هێندێ لە شیعەی ماڵ وێران کە ئەڵێن سورەتی ئیمامەت هاتووەتە خوارەوە هەر لای (أهل البيت)ە نعوذ بالله ئەوانە تا ئەو رادە پەست و نەفامن شتێ ئەڵێن پێچەوانەی قورئانە کە ئەفەرموێ: ﴿إنا نحن نزلنا الذكر وإنا له لحافظون﴾. بە قسەی ئەوان ئەوا سورەتێ گوم بوو نعوذ بالله. بێجگە لەوە ئەو بۆچوونی ئەوانە ئیمامی عەلی تاوانبار ئەکات کەوا خوا کردی بە ئیمامی موسڵمانان و هیچ نەبێ نەیتوانی فەرمانەکەی خوا ئاشکرا بکات. بەڵێ راستە: «عدو عاقل خير من صديق جاهل».

ئینجا با بێینە سەر فەرموودەکەی ئیمامی عەلی -خوای لێ رازی بێت- کە وەڵامی جحیفەی دایەوە: (قال: لا، إلا كتاب الله، أو فهم أعطيه رجل مسلم) فەرموی: نەخێر هیچ شتێکمان لا نی‌یە بێجگە لە نامەکەی خوا کە قورئانە یان فەهم و بۆچوونێک کە درابێ بە موسڵمانێک. (أو مافي هذه الصحيفة) یان ئەوەی کە لەم وەرەقە نووسراوەدا هەیە (قال قلت: فما في هذه الصحيفة؟) ئەڵێ وتم: ئەوەی لەو وەرەقەدا هەیە چی‌یە؟ (قال العقل، وفكاك الأسير، ولا يقتل مسلم بكافر) ئەم سێ شتە یەکەم باسی خوێن سەندنە کە ئەندازەی چەندەو جۆری چۆنەو بە چەند وەجبە ئەسەنرێ. دووەم رزگار کردنی ئەسیر کە چەندە خێرەو پێویستە هەوڵدان بۆی. سێ‌یەم ئەمەیە کە موسڵمان لە باتی کافردا ناکوژرێ، واتە ئەگەر موسڵمانێک کافرێکی کوشت ئەو موسڵمانە ناکوژرێ لە باتیدا، بەڵکو خوێن ئەدرێ و کەفارەتی ئەکەوێتە سەر. ئەم باسە زانایان بە درێژیی باسیان فەرمووە بەپێی راو بۆچوونی چوار مەزهەبەکەی ئەهلی سوننەت کە مەزهەبەکانیان بە تەواوتر هاتووە لە خۆیانەوە. هەرچەند

ئەگەر مجتهدی تر بووبێ بێجگە لەمان لە زانایانی ئەهلی سوننەت ئەگەر ئیسپات بێ کە رای ئەوانە هەرچاکەو بەسەر سەر بۆ وتنە ئیمامی جعفری صادق ئەوە شیعە نقلی ئەکەن لێیەوە ئەگەر بزانێ دەست کرد نییەو رای ئەوە ئەیخەینە سەر سەرو چاومان.

لەم بابەدا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە خوزاعە پیاوێکیان لە بنی لیث کوشت لە سالی فەتحی مەککەدا (بقتيل منهم قتلوه) لە باتی کوژراوێکی خۆیاندا کە ئەوان کوشتبوویان (فأخبر بذلك النبيﷺ فركب راحلته فخطب فقال:) ئینجا ئەو هەواڵە درا بە پێغەمبەرﷺ، ئەویش سواری وڵاخەکەی بوو خوتبەو وتاری داو فەرمووی: («إن الله حبس عن مكة القتل أو الفيل -شك أبو عبدالله-) راویەکە دوو دڵە ئایا قەتلی فەرموو یان فیل، گومان بۆ فیل زیاتر ئەڕوات لەبەر ڕیوایەتی تر کە هاتووە خوا مەنعی کرد لە مەککە کوشتن یان فیل (وسلط عليهم رسول اللهﷺ والمؤمنين) خوا پێغەمبەرو موسڵمانانی زاڵ کرد بەسەریاندا (ألا وإنها لم تحل لأحد قبلي، ولم تحل لأحد بعدي) با بزانن مەککە حەڵاڵ نەبووە بۆ هیچ کەسێکی تر لە پێش منەوە، وە لە پاش من بۆ هیچ کەسێکی تر حەڵاڵ نابێ (ألا و إنها حلت لي ساعة من نهار. ألا وإنها ساعتي هذه حرام) با بزانن لەم کاتی ئێستای مندا حەرامە (لا يختلى شوكها، ولا يعضد شجرها، ولا تلتقط ساقطتها إلا لمنشد) دروێنەی گیاو دڕکی ناکرێ و داری هەڵناپاچرێت و دۆزراوەی داگیر ناکرێت، مەگەر بۆ کەسێک کە ناونیشانی هەڵبدا (فمن قتل فهو بخير النظرين إما أن يعقل، و أما أن يقاد أهل القتيل») هەرکەسێک کوژراوێکی ببێ ئەو کەسە یەکێ لە دوو شتی بۆ هەیە قصاص یان خوێن. (فجاء رجل من أهل اليمن فقال: اكتب لي يا رسول الله. فقال: «اكتبوا لأبي فلان». فقال رجل من قريش: إلا الإذخر يا رسول الله، فإنا نجعله في بيوتنا وقبورنا) ئینجا پیاوێکی یەمەنی هات و گوتی بۆم بنووسە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بنووسە بۆ ئەبو فلان، پیاوێک لە قورەیش هات عەرزی کرد بێجگە لە درەختی (إذخر) کە ئێمە ئەیکەین بە پەردوو بۆ ماڵەکانمان و بۆ گۆڕەکانمان (فقال النبيﷺ: «إلا الإذخر») پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بێجگە لە (إذخر).

لەم حەدیسەدا چەند شتێک وەرئەگیرێ دڵنیا کردن و تاکید کردن لەسەر ئەو چۆنیەتی

ڕێزی مەککەی موکەڕەمە. دووەم ئەو شتانەی کە پێویستی هەیەو ناچارییە ئەبێ ڕیعایەت بکرێن لەسەربنچینەی ئەو بڕیارە فیقهییە کە ئەفەرموێ: [ الضرورات تبيح المحظورات ] هەروەها حاجیاتیش هەر ئەبێ ڕیعایەت بکرێت. هەروەها وەرئەگیرێ کە ئەو شارە پیرۆزە خوا پاراستوویەتی لە کاتێکدا کە دانیشتوانی کافر بوون، کەواتە لە کاتێکدا موسڵمان بن باشتر ئەیانپارێزێ. ئەمەش وەرئەگیرێ مافی ئەوەیان بووە هەر شتێ بە چاکیان زانی بێ عەرزی پێغەمبەریﷺ بکەن. لە دواییدا ئەمەش وەرئەگیرێ کە پێویستە نووسینی عیلم. بەمە پەیوەندی ئەم حەدیسە پەیدا ئەبێ لەگەڵ بابەکەدا.

هەر لەم بابەدا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە ئەفەرموێ: هیچ کەس لە هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ لە من زۆرتر حەدیسی ڕیوایەت نەکردووە بێجگە لە عبداللەی کوڕی عمر (فإنه كان يكتب ولا أكتب) چونکە ئەو ئەینووسی و من نازانم بنووسم. ئینجا ڕواڵەتی ئەم حەدیسانە کە فەرمان ئەدەن بە نووسین، دژە لەگەڵ حەدیسی ئەبو سەعیدی خودری کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (لا تكتبوا عني شيئا غير القرآن) بە چەند جۆرێ وەڵام دراوەتەوە بۆ نەهێشتنی ئەو دژایەتییە یەکێ لەوانە ئەو جڵەوگیرییە بۆ کاتی هاتنە خوارەوەی قورئانەو نیزن دانەکە بۆ پاش ئەوەیە. یان ئەو جڵەوگیرییە بۆ ئەوەیە کە لەگەڵ قورئاندا حەدیسیش ڕیوایەت بکرێ، چونکە لەوانەیە قورئانەکە جوێ نەکرێتەوە لە غەیری قورئان. یان جڵەوگیرییەکە لە پێشەوە بووەو نیزن دانەکە لەپاش ئەوە بوو، کەواتە ئیزندانەکە ئەبێ بە ناسخ. وە یەکەم کەسێ کە حەدیسی نووسییەوە ئیبن و شەهابی زەهەری بوو لەسەری سالی سەدەی یەکەم لەسەر فەرمانی عمری کوڕی عبدالعزیز -خوای لێ ڕازی بێت-لە پاشان تدوین کراو ئینجا تصنیف کراوە بە هۆی ئەوەوە فەرو خێرێکی زۆر دەست کەوت بوو سوپاس بۆ خوا.

ئینجا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە -خوا لێیان ڕازی بێ کە (قال: لما اشتد بالنبيﷺ وجعه) کاتێ ئیش و نازارەکەی پێغەمبەرﷺ بە تین بوو (قال: «ائتوني بكتاب أكتب لكم كتابا لا تضلوا بعده») فەرموی: قەڵەم و قەڵەمدانێکم بۆ بێنن کە نووسراوێکتان بۆ بنووسم کە لە پاش ئەوە گومڕا نەبن. (قال عمر : إن النبيﷺ غلبه الوجع) بێگومان پێغەمبەرﷺ ئیش و نازاری بەتین بووە، کەواتە با زەحمەتی نەدەین و پێویست

نی‌یه (وعندنا كتاب الله حسبنا) وه ئێمه قورئانمان لایەو بەسمانه. وه هێندێ حەزیان دەكرد ئەو نووسراوه ببێ (فاختلفوا، وكثر اللغط) بەهۆی ئەوەوه دوبەرەكی پەیدا بوو، بوو به غەڵبه غەڵب. (قال: قوموا عني، ولا ينبغي عندي التنازع) فەرمووی هەڵسن لام و لایەق نی‌یه لای مندا نیزاع و دووبەرەكی. ئیبن عەباس كه حەزی دەكرد نووسراوەكه ببێ فەرمووی: (يقول: إن الرزية كل الرزية ما حال بين رسول الله ﷺ وبين كتابه) بەراستی زۆر موسیبەت ئەمه بوو كه بوو به بەرگری پێغەمبەر ﷺ له نووسینی ئەو نامەیە. ئینجا له بارەی ئەو رای عمرەوه قسەو باسی زۆر كراوه، به تایبەتی له لایەن شیعەوه كه به وشەیەكی ناخۆش ئەیگێڕنەوه كه گوایه وتویەتی (هجر) واته راوه ئەكات. وەڵامی زۆر دراوەتەوەو لام وایه زۆر پێویست نی‌یه بەو درێژه دانه ئەویەڕی ئەمەیه بۆچوونەكەی هەڵه بووبێ و چەند جار ئەمه ئەڵێین كه لەم ئوممەتەدا تەنها پێغەمبەر ﷺ معصومه. ئیتر با لەسەری ئەڕۆین. ئەمەش ئەڵێین شتێكی ئاشكرایه كه عمر نه خاوەنی گیان و نه خاوەنی ماڵ و نه خاوەنی هیچ شتێك نەبووه له ئاستی پێغەمبەر ﷺ كەواته ئەگەر بیزانیایه لەو فەرمودەدا جدیه هەرگیز هیچ شتێ به دەمیدا نەدەهات. ئیتر با نەفام له خۆیەوه دەمبازی و وڕێنه نەكات دەربارەی (ثانی الأفضلین)ی ئەم ئوممەته. وه بەڵگەی ئاشكرا هەیه لەسەر ئەوه كه لەو فەرمانەدا عەزم و ئیرادەی نەبوو، بەڵكو فەرمانەكەی بۆ ئیرشاد بووه، چونكه چەند رۆژێكی تر پاش ئەوه له دنیا دەرنەچوو بوو وه چەند قسەو پرسیاری له خزمەتدا ئەكرا ئەو فەرمودەی له بارەی خیلافەتەوه ئەبوو ئیتر رێگه ئەئەما بۆ دووبەرەكی . بەڵگەش لەسەر ئەم رایه هەیه، یەكێ لەو بەڵگانه ئەمەیه لەو ماوەی ئەخۆشی‌یەدا فەرمانی دا كه ئەبوبەكر ئیمامی نوێژ بێت، له پاش له دنیا دەرچوونی یەكێ لەو بەڵگانه لەسەر جێنشینی ئەبوبەكر ئەمه بوو كه پێغەمبەر ﷺ ئیمامەتەی بچووكی بۆ بڕیاردا، كەواته ئێمەش ئیمامەتی گەورەی بۆ بڕیار ئەدەین. یەكێ لەوەی كه بەڵگەیه لەسەر ئەوەی له بارەی خیلافەتەوه ئەینوسێ ئەمەیه كه ئیمامی موسلیم ئەیهێنێ كه له سەرەتای ئەخۆشی‌یەكەیدا فەرمووی به دایكی ئیمانداران باوك و براكەتم بۆ بانگ بكه (حتى أكتب كتابا، فإني أخاف أن يتمنى متمن ويقول قائل، ويأبى الله المؤمنون إلا أبابكر) چونكه مەترسی ئەكەم ئاواته خوازێك و یەكێ قسه بكات، واته له بارەی خیلافەتەوەو خواو ئیمانداران نایانەوێ بێجگه له ئەبوبەكر خەلیفه بێت.

## ٤٠- بابُ العِلْمِ وَالعِظَةِ باللَّيْلِ

١١٥- حدَّثنا صدقةُ أخبرنا ابنُ عُيَيْنةَ عَنْ مَعْمَرٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ هِنْدٍ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ. وَعمرٍو وَيحيى بنِ سعيدٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ هِنْدٍ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: اسْتَيْقَظَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللهِ مَاذَا أُنْزِلَ اللَّيْلَةَ مِنَ الْفِتَنِ، وَمَاذَا فُتِحَ مِنَ الْخَزَائِنِ».

(باب العلم والعظة بالليل) ئەمە بابی فێرکردنی عیلمە لە شەودا، لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە أم سلمەوە -خوا لێی رازی بێت- (قالت استیقظ النبي ﷺ ذات لیلة) ئەفەرموێ شەوێ لە شەوان پێغەمبەر ﷺ لە خەو خەبەری بوویەوەو فەرموی: (سبحان الله ماذا أنزل اللیلة من الفتن و ماذا فتح من الخزائن) ئای سبحان الله چەند راگەیەنراوە بە مەلائیکەکان ئەم شەو لەو شتانەی کە روو ئەدەن لە داهاتوودا. یان مەبەست ئەوەیە ئەو شتانە لە خەودا وەحی کراوەتە لای پێغەمبەر ﷺ (وماذا فتح من الخزائن) بە هەرکام مەبەست بێت ئەو سامان و غەزنەیانە کە لە رۆم و فارس و باقی وڵاتانی ترکە کەوتنە ژێر دەستی ئیسلام. ئینجا ئایا ئەو فیتنەو فەسادەو تاقی کردنەوانە هەریەک شت بێت، چونکە سەروەت و سامانی زۆر هۆی گۆڕان و لادانە لە رێگەی راست. یان ئەو دوو شتە جیاوازین بەم رەنگە مەبەست بە (فتن) ئەو رووداوانەیە کە لە پاش پێغەمبەری ئازیز ﷺ پەیدا بوون و ئەوەتا هەرچەند هەر چاوەڕوانی هاتنیان دەکرێ. بە هەر حاڵ و لەسەر هەر بار رووداني ئەوانە مەترسیان لێ دەکرێ کە ببن بە هۆی ترازانی موسڵمانان لەو رێگەی راستەی کە خوا نیشانی دان. لەبەر ئەوە فەرموی: (أیقظوا صواحبات الحجر) دانیشتوەکانی حوجرەکان خەبەر کەنەوە با هەستن بۆ عیبادەت و خواپەرستی و پێش ئەوەی ئەو شتانە روو بدەن جا بە تایبەتی فەرماندان بە دایکەکان، چونکە لەو کاتانەدا هەر ئەوانە حازر بوون لەو شەوەدا یان لەبەر ئەوەیە ئەوان شیاوو شایستە ترن بە زیادە خۆپارێزی، چونکە هاوسەری گەورەترین بەندەی خوان. وەک خوا فەرمانی دا: ﴿وأمر أهلك بالصلاة واصطبر علیها﴾ لە پێشەوە گوتمان خیلاف هەیە لەمەدا کە مەبەست بە فتن و خزائن هەریەکە یان جیاوازن، بەڵام بەراستی دڵ بەوە قایمە کە جیاوازین. ئەم رستەیە: (فرب کاسیة في الدنیا عاریة في الآخرة) زۆر ئافرەت هەیە لە دنیادا پۆشتەیە و لە قیامەتدا رووتە، ئەمە باری جیاوازی‌یەکە بەهێز دەکات.

ئەم خەو و حەدیسە چەند ئامۆژگاری و ئیرشادی لێ وەردەگیرێ لە بارەی تەربیەی ماڵ و منداڵەوە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١١٢٦، ٣٥٩٩، ٤ـ٥٨، ٦٢١٨، ٧٠٦٩)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٤١ـ بابُ السَّمَرِ فِي الْعِلْمِ

١١٦ـ حَدَّثَنَا سَعِيدُ بنُ عُفَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنِي اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَبْدُالرَّحْمَنِ بنُ خَالِدٍ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ سَالِمٍ وَأَبِي بَكْرِ بنِ سُلَيْمَانَ بنِ أَبِي حَثْمَةَ أَنَّ عَبْدَاللَّهِ بنَ عُمَرَ قَالَ: صَلَّى بِنَا النَّبِيُّ ﷺ الْعِشَاءَ فِي آخِرِ حَيَاتِهِ، فَلَمَّا سَلَّمَ قَامَ فَقَالَ: «أَرَأَيْتَكُمْ لَيْلَتَكُمْ هَذِهِ، فَإِنَّ رَأْسَ مِائَةِ سَنَةٍ مِنْهَا لاَ يَبْقَى مِمَّنْ هُوَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَحَدٌ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٥٦٤، ٦٠١)دا دووبارە بووەتەوە.

١١٧ـ حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَكَمُ قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بنَ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: بِتُّ فِي بَيْتِ خَالَتِي مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَهَا فِي لَيْلَتِهَا. فَصَلَّى النَّبِيُّ ﷺ الْعِشَاءَ، ثُمَّ جَاءَ إِلَى مَنْزِلِهِ فَصَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ نَامَ ثُمَّ قَامَ، ثُمَّ قَالَ: نَامَ الْغُلَيِّمُ -أَوْ كَلِمَةً تُشْبِهُهَا- ثُمَّ قَامَ، فَقُمْتُ عَنْ يَسَارِهِ فَجَعَلَنِي عَنْ يَمِينِهِ. فَصَلَّى خَمْسَ رَكَعَاتٍ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ نَامَ حَتَّى سَمِعْتُ غَطِيطَهُ -أَوْ خَطِيطَهُ- ثُمَّ خَرَجَ إِلَى الصَّلاَةِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٣٨، ١٨٣، ٦٩٧، ٦٩٨، ٦٩٩، ٧٢٦، ٧٢٨، ٨٥٩، ٩٢٤، ١١٩٧، ٤٥٦٩، ٤٥٧٠، ٤٥٧١، ٥٩١٩، ٦٢١٥، ٦٣١٦، ٧٤٥٢)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب السمر في العلم) ئەمە بابی قسەو دەمە تەقێیە کە مەردوم بە شەو لەناو ماڵ و منداڵدا بیکەن پێش خەوتن. بەم جۆرە جیا نەبێتەوە لە بابی (٤٠) کە ئەمەی تێدا نی‌یە پێش خەوتن.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ کە (أن عبدالله بن عمر قال: صلى بنا النبي ﷺ

العشاء آخر حياته ) عبداللەی کوڕی عمر فەرموی: پێغەمبەرﷺ نوێژی عیشای پێ کردین لە دوا دوایی ژیانیدا (فلما سلم قام فقال :«أرأيتكم ليلتكم هذه، فإن رأس مائة سنة منها لا يبقى ممن هو على ظهر الأرض أحد») ئایا دەزانن ئەم شەوەتان یان دەبینن ئەم شەوەتان بێگومان لە ئێستاوە تا سەری سەد ساڵ ئەو چینەی کە ئێستا هەیە هیچ کەسێکی تری نامێنێ ، واتە ئەم چینە ئەڕواو نامێنێ.

ئەم حەدیسە دێت لەمەوپاش لە بابی نوێژدا لەگەڵ قسەو باسێک کە تێیدا کراوە، وە لە دەمی زانایانەوە بیستوومە کە یەکێ لە خەلیفەکانی عەباسی وا دەزانم هارون الرشید بووە کە هەوڵی داوە یەکێ لە هاوەڵەکان ببینێ بۆ ئەوەی پلەی تابیعینی دەست کەوێ. وە پێیان گوتووە کە تەنها یەکێ ماوە ناوی طاوسی یەمانییە، ئینجا خەلیفە ئەنێرێ بە دوایداو کەتشریف دێنێ خەلیفە عەرزی ئەکات حەز ئەکەم حەدیسێکم بۆ ریوایەت بکەیت کە خۆت بیستبێتت لە پێغەمبەرەوەﷺ ئەویش ئەم حەدیسەی بۆ باس ئەفەرموێ کە بە چەند وتەیەک هاتووە کە هەریەک مەبەست ئەگەیەنن من ئەمەیانم باشتر بیستووە: (يشيب ابن آدم و يشيب معه خصلتان الحرص على المال و طول الأمل) ئینجا خەلیفە عەتایاو بەخششێکی پێ ئەداو ڕەوانەی ئەکات. ئینجا ئەو صەحابییە ئەگەڕێتەوەو ئەفەرموێ: ئەمە بۆ هەموو ساڵێکە یان ئەم جارەیەو ئەویش ئەڵێ: الحمد لله بۆم دەرکەوت کە حەدیسەکەت سەحیحەو بەدی هات لە خۆتدا تۆ لەم تەمەنەدا ئەم حرص و طولی ئەمەلەت هەیە. باشە بۆ هەموو ساڵێکە تا ماوی. لە پاشان کە ئەگەڕێتەوە، وەفات ئەکات لەسەری ئەم سەد ساڵەدا. ئەمەم لە دەمی زانایان بیستووەو خوا خۆی باش ئەزانێت.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە -خوا لێیان رازی بێت- کە فەرموی: (قال: بت في بيت خالتي ميمونة بن الحارث زوج النبيﷺ ، وكان النبي عندها في ليلتها) خەوتم لە ماڵی پوورم مەیمونەی کچی حارث کە حەرەمی پێغەمبەر بووﷺ وە پێغەمبەرﷺ لای بوو لە نۆبە شەوی ئەودا (فصلى النبيﷺ العشاء، ثم جاء إلى منزله فصلى أربع ركعات، ثم نام) ئینجا پێغەمبەرﷺ نوێژی عیشای کردو لە پاش ئەوە بۆ سوننەت هاتەوە بۆ مەنزڵەکەی و چوار رکاتی کرد لە پاش ئەوە خەوت. (ثم قام ثم قال: نام

فليم -أو كلمة تشبهها- ) له پاشان هه‌ڵساو فه‌رمووی كوڕه بچكۆله‌كه خه‌وت، واته ئیبن عه‌باس كه له‌و كاته‌دا نابلوغ بووه، یان ئه‌وه‌ی فه‌رموو یان وته‌یه‌كی تر به وێنه‌ی ئه‌وه (ثم قام، فقمت عن يساره فجعلني عن يمينه. فصلى خمس ركعات، ثم صلى ركعتين، ثم نام حتى سمعت غطيطه -أو خطيطه- ثم خرج إلى الصلاة) ئینجا ته‌شریفی هه‌ستا بۆ نوێژی ترو منیش هه‌ستام لای چه‌پیه‌وه وه‌ستام، ئه‌ویش خستمیه لای راستی و پێنج ركاتی تری كرد، ئه‌مه نۆ ركات. ئینجا دوو ركاتی تری كرد ئه‌مه یازده، ئینجا خه‌وت تا ده‌نگی پرمه‌م بیست. راویه‌كه دوو دڵه ئایا (غطیط)ی وت یان (خطیط)، پاشان ته‌شریفی ده‌رچوو بۆ مزگه‌وت بۆ نوێژ. وا ده‌رئه‌كه‌وێ ئه‌و دوو ركاته‌ی دوایی سوننه‌تی نوێژی به‌یانی بووبێ نه‌ك وه‌ترو شه‌ونوێژ، له‌به‌ر ئه‌وه سوننه‌ته نوێژی سوننه‌ت له ماڵدا بكرێ، كه‌واته شه‌و نوێژو وه‌تره‌كه‌ی ئه‌و شه‌وه حه‌وت ركاتی بووه.

په‌یوه‌ندی ئه‌م حه‌دیسه به حه‌دیسی پێشووه‌وه ئه‌مه‌یه ئه‌و ئه‌ندازه قسه كه ئه‌و شه‌وه كردیان به قسه‌و ده‌مه ته‌قێی ناوخۆ سه‌یر ده‌كرێ.

ئه‌م باسه به درێژیی له باسی نوێژی وه‌تر دێت، كه‌واته با هه‌ڵگیرێت بۆ ئه‌وێ.

*** *** ***

## ٤٢ـ بابُ حفْظ الْعلْم

١١٨ـ حَدَّثَنَا عَبْدُالْعَزِيزِ بنُ عَبْدِاللهِ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنَّ النَّاسَ يَقُولُونَ: أَكْثَرَ أَبُو هُرَيْرَةَ. وَلَوْلاَ آيَتَانِ فِي كِتَابِ اللهِ مَا حَدَّثْتُ حَدِيثًا. ثُمَّ يَتْلُو: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنْزَلْنَا مِنَ الْبَيِّنَاتِ -إِلَى قَوْلِهِ- الرَّحِيمُ﴾ (البقرة: ١٥٩-١٦٠) إِنَّ إِخْوَانَنَا مِنَ الْمُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالأَسْوَاقِ، وَإِنَّ إِخْوَانَنَا مِنَ الأَنْصَارِ كَانَ يَشْغَلُهُمُ الْعَمَلُ فِي أَمْوَالِهِمْ وَإِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ كَانَ يَلْزَمُ رَسُولَ اللهِ ﷺ بِشِبَعِ بَطْنِهِ، وَيَحْضُرُ مَالاَ يَحْضُرُونَ، وَيَحْفَظُ مَالاَ يَحْفَظُونَ.

ئه‌م حه‌دیسه له ژماره‌كانی: (١١٩، ٢٠٤٧، ٢٣٥٠، ٣٦٤٨، ٧٣٥٤)دا دووباره بووه‌ته‌وه.

١١٩ـ حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بنُ أَبِي بَكْرٍ أَبُو مُصْعَبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ إِبْرَاهِيمَ بنِ دِينَارٍ

عَنْ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي أَسْمَعُ مِنْكَ حَدِيثًا كَثِيرًا أَنْسَاهُ. قَالَ: ابْسُطْ رِدَاءَكَ. فَبَسَطْتُهُ. قَالَ: فَغَرَفَ بِيَدَيْهِ ثُمَّ قَالَ: ضُمَّهُ، فَضَمَمْتُهُ، فَمَا نَسِيتُ شَيْئًا بَعْدَهُ.

حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي فُدَيْكٍ بِهَذَا. أَوْ قَالَ: غَرَفَ بِيَدِهِ فِيهِ.

١٢٠- حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي أَخِي عَنْ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: حَفِظْتُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ وِعَاءَيْنِ: فَأَمَّا أَحَدُهُمَا فَبَثَثْتُهُ، وَأَمَّا الآخَرُ فَلَوْ بَثَثْتُهُ قُطِعَ هَذَا الْبُلْعُومُ.

قَالَ أَبُو عَبْدِاللهِ: الْبُلْعُومُ مَجْرَى الطَّعَامِ.

(باب حفظ العلم) ئەمە بابی پارێزگاری‌یە لە عیلم. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (قال: إن الناس يقولون: أكثر أبو هريرة) ئەڵێ: خەڵکی دەڵێن ئەبو هورەیرە حەدیسی زۆر ریوایەت دەکات. وەک باوەڕ نەبووبێ بە راستی و هەڵە نەکردن، بە تایبەتی کە خوێندەوار نەبووە، ئینجا (ولولا آيتان في كتاب الله ما حدثت حديثا. ثم يتلو: ﴿إن الذين يكتمون ما أنزلنا من البينات -إلى قوله-: الرحيم﴾ (البقرة: ١٥٩-١٦٠)) ئەگەر لەبەر دوو ئایەت نەبوایە لە قورئاندا هیچ حەدسێکم ریوایەت نەدەکرد، پاشان ئەو دوو ئایەتە دەخوێنێتەوە. واتە من عیلم و حەدیسم لایەو ئەگەر ریوایەتیان نەکەم بەری ئەو لەعنەتە ئەکەوم، وە هۆی ئەوەی کە من ئایەت و عیلمی زۆرم لایە ئەمەیە: (إن إخواننا من المهاجرين كان يشغلهم الصفق بالأسواق، وإن إخواننا من الأنصار كان يشغلهم العمل في أموالهم و إن أبا هريرة كان يلزم رسول الله ﷺ بشبع بطنه، ويحضر مالا يحضرون، و يحفظ مالا يحفظون) بەراستی برا کۆچەری‌یەکانمان خەریکن بە کڕین و فرۆشتنەوە لە بازاڕەکاندا. وە برا ئەنسارەکانمان خەریکی کارو فرمانن لە ماڵی خۆیاندا، وە ئەبو هورەیرە هەمیشە لە خزمەتی پێغەمبەردایە ﷺ لەبەر تێرکردنی سکی، وە حازری شتێکە کە ئەوان حازری نین و شتێکی لەبەر کردووە کە ئەوان لەبەریان نەکردووە. واتە هەمیشە ئاگادار بووە بەسەر هەر رووداوێک و فەرموودەیەکی لەبەر کردووە کە ئەوان نەیانبیستووە تا لەبەری بکەن. کەواتە ئەبێ عیلم و حەدیسی زۆرتری لابێ. وە هەرچیشی

لابێ نەبێ رایگەیەنێ تا دووچاری نەفرینی خوا نەبێ.

ئینجا دێتە سەر حەدیسێکی تر کە لە ئەبو هورەیرەوە ئەیهێنێ کە (قال: قلت يا رسول الله، إني أسمع منك حديثا كثيرا أنساه) ئەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەری خوا حەدیسی زۆر ئەبیسم لێتەوەو لەبیرم ئەچێتەوە، (قال: ابسط رداءك. فبسطته) فەرمووی: ریداکەت داخەو منیش دامخست (قال: فغرف بيديه ثم قال: ضمه، فضممته، فما نسيت شيئا بعده) ئەویش بە هەردوو دەستی تێی کردو فەرمووی بیگوشە بە خۆتەوە منیش گوشیم بە خۆمەوە، ئیتر پاش ئەوە هیچ شتێکم لە بیر نەچووە.

لەم دوو حەدیسەی دواییدا فەضیلەتێکی گەورە وەردەگیرێ بۆ ئەبو هورەیرە کە پێغەمبەری ئازیزﷺ بە ئیزنی خوا بەهرەی عیلم و زانینی پێ بەخشی وەک ئەو موعجیزە گەورەش ئەگەیەنێ بۆ پێغەمبەرﷺ . وە لەبارەی بەهرەی عیلمەوە کە پێغەمبەرﷺ پێیدا کە هەندێ لەو عیلمانە نهێنی و سرێک بووە ئەبو هورەیرە ئەیتوانیوە دەری ببڕێ وەک لەم حەدیسەدا کە ئەبو هورەیرە ئەفەرموێ: (حفظت من رسول اللهﷺ وعاءين: فأما أحدهما فبثثته، وأما الآخر فلو بثثته قطع هذا البلعوم) واتە وەرم گرتووە لە پێغەمبەرەوە دوو جۆر لە عیلم یەکێکیانم بلاو کردووەتەوەو ئەوی تریان ئەگەر بلاوی بکەمەوە ئەوا ئەم گەروەم ئەبڕێ. بێگومان ئەو بەشەی کە ئەیتوانیوە دەری بخات هێندێ لە رووداوی غەیبی بووە کە ئەگەر دەری بخستایە زاڵمان ئەیان کوشت، چونکە حەقیقەتی ئەو زاڵمانەی روون ئەکردەوە. جار بە جارێ بە ئیشارەت ئەیگەیاندو، ئەوەی کە ئەیگوت: (أعوذ بالله من رأس الستين و أمارة الصبيان) کە لەو کاتەدا یەزید کرا بە خەلیفەو منداڵ و نەفامەکانی ئەکرد بە کاربەدەست. کە ئەوە روویدا بە گێڕانەوەشی هەق وایە دڵ بکەوێتە تەپە تەپ وتیکە لە گەرودا بگیرێ وەک لە حەدیسدایە کە پێغەمبەری ئازیز بینی لە خەویدا مەیمون وان بەسەر مینبەرەکەیەوە، کە ئەوە بوو خێڵی یزید لەسەر مینبەرەکەی ئەو خوتبەیان ئەدا. لەشکری هێنایە سەر مەدینە لە کوشتاری حەرەدا ٧٠٠ صحابی شەهید کرا ﴿إنا لله وإنا إليه راجعون﴾ ئەو جۆرە عیلمە ئەیوێراوە بلاوی بکاتەوە ئەو جۆرە رووداوە دڵتەزێنانە بوو نەک شتێ کە حوکم و بڕیارێکی ئیسلامی تێدا بووبێ، کەواتە باطنیەکان نەفرینی خوایان لێ بێ هەر نەفرینیان بۆ ئەمێنێتەوە کە دەڵێن ئەم شەریعەتە ظاهری هەیەو باطنی هەیە، باطنیەکەی دەرچوون و گوێ

نەدانە بە دین خوا پەناممان بدات، آمین. ئم حەدیسانە کە لەم بابەدا تێپەڕیان کرد هەموو پەیوەستن بە کیتابی عیلمەوە.

*** *** ***

## ٤٣ـ بابُ الإنْصَاتِ لِلْعُلَمَاءِ

١٢١ـ حَدَّثَنَا حَجَّاجٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بنُ مُدْرِكٍ عَنْ أَبِي زُرْعَةَ عَنْ جَرِيرٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ فِي حِجَّةِ الْوَدَاعِ: اسْتَنْصِتِ النَّاسَ. فَقَالَ: «لاَ تَرْجِعُوا بَعْدِي كُفَّارًا يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ».

(باب الإنصات للعلماء) ئەمە بابی گوێ گرتن و بێ دەنگ بوونە بۆ زانایان، وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە جەریرەوە کە (أن النبيﷺ قال له في حجة الوداع: استنصت الناس) پێغەمبەرﷺ پێی وت کە خەڵکی بێ دەنگ بکەو فەرموی: («لا ترجعوا بعدي كفارا يضرب بعضكم رقاب بعض») لە پاش من هەڵنەگەڕێنەوەو کافر مەبن هێندێکتان هێندێ ترتان بکوژن، واتە کردەوەیەک مەکەن بە وێنەی کردەوەی کافران کە باکیان نی‌یە لە خواو دەسەڵاتیان بەسەر هەرکەسێکدا بوو ئەیکوژن لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە بێ دەنگ بوون و گوێ گرتن بۆ زانایان پێویستە چونکە زانایانی راستەقینەی ئیسلامی وارثی پێغەمبەرانن. وە بە هۆی ئەم خاڵەوە پەیوەندی ئەم حەدیسە ئەبێ لەگەڵ ترجمەکەدا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٤٠٥، ٦٨٦٩، ٧٠٨٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٤٤ـ بابُ مَا يُسْتَحَبُّ لِلْعَالِمِ إِذَا سُئِلَ أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ فَيَكِلُ الْعِلْمَ إِلَى اللهِ

١٢٢ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مُحَمَّدٍ قَالَ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ حَدَّثَنَا عَمْرٌو قَالَ أَخْبَرَنِي سَعِيدُ ابنُ جُبَيْرٍ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ إِنَّ نَوْفًا الْبَكَالِيَّ يَزْعُمُ أَنَّ مُوسَى لَيْسَ بِمُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنَّمَا هُوَ مُوسَى آخَرُ. فَقَالَ كَذَبَ عَدُوُّ اللهِ، حَدَّثَنَا أُبَيُّ بنُ كَعْبٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «قَامَ مُوسَى النَّبِيُّ خَطِيبًا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَسُئِلَ: أَيُّ النَّاسِ أَعْلَمُ؟ فَقَالَ: أَنَا أَعْلَمُ. فَعَتَبَ اللهُ عَلَيْهِ إِذْ لَمْ يَرُدَّ الْعِلْمَ إِلَيْهِ، فَأَوْحَى اللهُ إِلَيْهِ أَنَّ عَبْدًا مِنْ عِبَادِي بِمَجْمَعِ الْبَحْرَيْنِ هُوَ أَعْلَمُ

منك. قالَ: يا ربِّ وكَيفَ بِهِ؟ فقيلَ لَهُ: احمِلْ حوتاً في مِكتَلٍ، فإذا فقدتَهُ فهوَ ثَمَّ. فانطلقَ وانطلَقَ بفتاهُ يُوشعَ بنِ نونٍ، وحَملا حُوتاً في مِكتَلٍ، حتَّى كانا عِندَ الصَّخرةِ وضعا رُءُوسَهُما ونَاما، فانسلَّ الحُوتُ منَ المِكتَلِ فاتَّخذَ سبيلَهُ في البحرِ سَرَباً، وكانَ لمُوسَى وفتاهُ عجَباً. فانطلَقا بقيَّةَ ليلتِهِما ويَومِهِما، فلمَّا أصبحَ قالَ مُوسَى لفتاهُ: آتنا غداءَنا، لقدْ لقِينا منْ سفرِنا هَذا نصَباً. ولَمْ يَجدْ مُوسَى مَسّاً منَ النَّصَبِ حتَّى جاوزَ المكانَ الَّذي أُمِرَ بِهِ، فقالَ لَهُ فتاهُ: أرأيتَ إذْ أوَيْنا إلَى الصَّخرةِ فإنِّي نسيتُ الحُوتَ. قالَ مُوسَى: ذلكَ ما كُنَّا نَبغي. فارتدَّا علَى آثارِهِما قَصَصاً، فلمَّا انتهَيا إلَى الصَّخرةِ إذا رجُلٌ مُسجًّى بثوبٍ -أوْ قالَ: تَسجَّى بثوبِهِ- فسلَّمَ مُوسَى، فقالَ الخضِرُ: وأنَّى بأرضِكَ السَّلامُ؟ فقالَ: أنا مُوسَى. فقالَ: مُوسَى بَني إسرائيلَ؟ قالَ: نعَمْ. قالَ: هلْ أتَّبِعُكَ علَى أنْ تُعلِّمَني ممَّا عُلِّمتَ رُشداً. قالَ: إنَّكَ لَنْ تستطيعَ معيَ صبْراً. يا مُوسَى إنِّي علَى علمٍ منْ علمِ اللهِ علَّمَنيهِ لا تعلَمُهُ أنتَ، وَ أنتَ علَى علمٍ علَّمَكَهُ لا أعلمُهُ. قالَ: ستجِدُني إنْ شاءَ اللهُ صابراً ولا أعصي لكَ أمراً، فانطلَقا يَمشيانِ علَى ساحلِ البحرِ ليسَ لهُما سفينةٌ، فمرَّتْ بهِما سفينةٌ، فكلَّمُوهُمْ أنْ يحمِلُوهُما، فعُرِفَ الخضِرُ فحمَلُوهُما بغيرِ نَوْلٍ. فجاءَ عُصفورٌ فوقعَ علَى حرفِ السَّفينةِ، فنقرَ نقرةً أوْ نقرتَينِ في البحرِ، فقالَ الخضِرُ: يا مُوسَى، ما نقصَ علمي وعلمُكَ منْ علمِ اللهِ إلاَّ كنقرةِ هذا العُصفورِ في البحرِ فعمَدَ الخضِرُ إلَى لوحٍ منْ ألواحِ السَّفينةِ فنزَعَهُ. فقالَ مُوسَى قومٌ حمَلُونا بغيرِ نَوْلٍ عمَدْتَ إلَى سفينتِهِمْ فخرقْتَها لتُغرِقَ أهلَها. قالَ: ألَمْ أقُلْ لكَ إنَّكَ لَنْ تستطيعَ معيَ صبْراً. قالَ: لا تُؤاخِذْني بِما نسيتُ. فكانَتِ الأُولَى منْ مُوسَى نِسياناً. فانطلَقا، فإذا غُلامٌ يلعبُ معَ الغِلمانِ، فأخذَ الخضِرُ برأسِهِ منْ أعلاهُ فاقتلَعَ رأسَهُ بيدِهِ، فقالَ مُوسَى: أقتلْتَ نفساً زكيَّةً بغيرِ نفسٍ؟ قالَ: ألَمْ أقُلْ لكَ إنَّكَ لَنْ تستطيعَ معيَ صبْراً؟ (قالَ ابنُ عُيَينةَ: وهذا أوكدُ). فانطلَقا حتَّى إذا أتَيا أهلَ قريةٍ استطعَما أهلَها فأبَوا أنْ يُضيِّفُوهُما. فوجَدا فيها جداراً يُريدُ أنْ ينقضَّ فأقامَهُ، قالَ الخضِرُ بيدِهِ فأقامَهُ. فقالَ لَهُ مُوسَى: لوْ شئتَ لاتَّخذتَ علَيهِ أجراً. قالَ: هذا فِراقُ بيني وبينِكَ. قالَ النَّبيُّ ﷺ: «يرحمُ اللهُ مُوسَى، لوَدِدْنا لوْ صبرَ حتَّى يقُصَّ علَينا منْ

أمّرِهِمَا».

(باب ما يستحب للعالم إذا سئل أي الناس أعلم فيكل العلم إلى الله) ئەمە بابی ئەوەیە کە جوان و شیرینە بۆ زانا ئەگەر پرسیاری لێ کرا ئایا کێ زاناترە لە وەڵامدا ئەو زانینە حەواڵەی خوا بکات و بڵێ خوا ئەزانێ.

لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە کە (قال: قلت لابن عباس إن نوفا البكالي يزعم أن موسى ليس بموسى بني إسرائيل إنما هو موسى آخر) ئەڵێ وتم بە ئیبن عەباس کە نەوفی بەکالی وا گومان ئەبات کە موسا موسای بەنی ئیسرائیل نی یە، بەڵکو موسایەکی ترە (فقال كذب عدو الله) ئەویش فەرمووی درۆی کردووە ئەو دوژمنی خوا -مەبەستی ئەوە نی یە ئەو بڕیارەی لەسەر بدات، بەڵکو بێزاری دەربڕینە لە راو قسەی ناهەق- ئینجا فەرمووی: (حدثنا أبي بن كعب عن النبيﷺ: «قام موسى النبي خطيبا في بني إسرائيل) ئوبەی کوڕی کەعب باسی کرد بۆمان لە پێغەمبەرەوەﷺ کە جارێ موسا پێغەمبەر خوتبەی ئەدا لەناو بەنی ئیسرائیلی یەکاندا (فسئل: أي الناس أعلم؟ فقال: أنا أعلم) ئینجا پیاوێک پرسیاری لێ کرد ئایا کێ زاناترە لە ئادەمیدا ئەمڕۆ؟ موسا پێغەمبەر وتی: من لە هەموو کەس زاناترم لەم دنیادا (فعتب الله عليه إذ لم يرد العلم إليه، فأوحى الله إليه أن عبدا من عبادي بمجمع البحرين هو أعلم منك) خوا عیتابی لێ گرت لەبەر ئەوەی کە زانینەکەی نەگێڕایەوە بۆ لای خوا. خوای گەورە سروشی کردە لای موسا بەمەی بەندەیە لە بەندەکانی من لە شوێن تێڕژانی هەردوو دەریاکە ئەوە زاناترە لەتۆ ئەو بەندەیەش بریتی یە لە خضر وەک لەمەو پاش دێت، ئینجا مەبەست ئەوەیە زاناترە لە هێندێ شتی غەیبی ونهێنی کە بەخشراوە بەو و بە تۆ نەبەخشراوە، ئەوە نابێ بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە لە موسا پێغەمبەر گەورەتر بێت، وێنەی ئەوە لەم ئوممەتەش بووە. (من شهد له خزيمة فحسبه) هەرکەس خزیمە شایەتی بۆ بدات بەسێتی، واتە شاهێدی خزیمە بە دوو شاهید قبوڵ بووە. حذیفە خاوەنی سڕی مونافیقەکان بووە لەگەڵ ئەوەدا خلفای راشدین گەورەترن لەمان. ئینجا ئەو بەندەیە پێغەمبەر بووبێ وەک هێندێ لەزانایان ئەڵێن یان پیاوچاکێکی تر وەک هێندێکی تر ئەفەرمون، ماتوڵ خوا وەحی کرد بۆ حەزرەتی موسا ئەو

بەندەیە زاناترە ئیتر ڕێگەی قسەیەک نامێنێ، وە هەروەها هیچ پیاو چاکێکی تر لە پاش ئەو تا دنیا دنیایە نابێ وەک سەرنج بدرێ بڵێین غەیب زانە یان کارێکی بێ شەرعی کرد بێ دەنگ بین لێی گوایە ئێمە نازانین و خۆی دەزانێ(قال: یا رب وکیف به؟) ئینجا موسا فەرمووی ئەی خوای من چۆن ئەوەم دەست بکەوێ و بیناسم؟ (فقیل له: احمل حوتا في مكتل، فإذا فقدته فهو ثم) ئینجا پێی گوترا ماسییەک بخەرە ناو زەمبیلەیەکەوە هەرکاتێ لە بیرت چوو ئەوە ئەو بەندەیە لەو شوێنەدایە (فانطلق و انطلق بفتاه یوشع بن نون) ئینجا ڕۆیشت و هاوڕێ گەنجەکەی لەگەڵ خۆی برد کە یوشعی کوڕی نونە (وحملا حوتا في مكتل، حتى كانا عند الصخرة) بەو جۆرە ڕۆیشتن هەتا گەشتنە لای ئەو بەردەی کە بۆیان دیاریی کرابوو خۆیان نەیانناسی (و ضعا رءوسهما وناما، فانسل الحوت من المكتل فاتخذ سبيله في البحر سربا) لەوێدا سەریان نایەوەو نوستن، لەوێدا ماسییەکە لەزەمبیلەکە دەرپەڕی و ڕێگەی خۆی دایەبەر لە دەریاکەدا بە بێ ون بوون (وكان لموسى و فتاه عجبا. فانطلقا بقية ليلتهما ويومهما، فلما أصبح قال موسى لفتاه: آتنا غداءنا، لقد لقينا من سفرنا هذا نصبا. ولم يجد موسى مسا من النصب حتى جاوز المكان الذي أمر به) ئەوەش مایەی سەرسوڕمان بوو بۆ موساو هاوەڵەکەی، ئینجا کەوتنە ڕێ و ڕۆیشتن ئەو ئەندازەی لە شەو و ڕۆژ کە مابوویان، ئینجا کاتێ ڕۆژ بوویەوە موسا فەرمووی بە هاوەڵەکەی خۆراکەکەمان بۆ بێنە بەڕاستی لە سەفەرەکەماندا تووشی ماندوێتی بووین. وە موسا هەستی نەکرد بە ماندوویێتی هەتا تێپەڕی لەو شوێنەی کە فەرمانی پێ درابوو (فقال له فتاه: أرأيت إذ أوينا إلى الصخرة فإني نسيت الحوت. قال موسى: ذلك ما كنا نبغي. فارتدا على آثارهما قصصا، فلما انتهيا إلى الصخرة إذا رجل مسجى بثوب -أو قال: تسجى بثوبه- فسلم موسى، فقال الخضر: وأنى بأرضك السلام؟ فقال: أنا موسى. فقال: موسى بني إسرائيل؟ قال: نعم) هاوەڵەکەی گوتی: ئەزانی کە گەیشتینە لای بەردە گەورەکە من بەڕاستی ماسییەکەم لە بیر چوو، موسا فەرمووی: ئەو شوێنە ئەوە بوو کە ئێمە ئەمان ویست، بە هۆی ئەوەوە پاشەو پاش بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە، ئینجا کە گەیشتنە لای بەردە گەورەکە بینیان پیاوێک خۆی داپۆشیوە بە جلەکانی، موسا سەلامی کردو خضر وتی: سەلام لە کوێ هەیە لە وڵاتی ئێوەدا؟

ئینجا فەرمووی من موسام، ئەویش فەرمووی موسای بەنی ئیسرائیل؟ فەرمووی: بەڵێ. (قال: هل أتبعك على أن تعلمني مما علمت رشدا. قال: إنك لن تستطيع معي صبرا. يا موسى إني على علم من علم الله علمنيه لا تعلمه أنت، و أنت على علم علمكه الله لا أعلمه) موسا فەرمووی: با شوێنت بکەوم و لەگەڵت بم بۆ ئەوەی فێرم بکەیت و ئاگادارم بکەی لەو زانین و لێزانی‌یەی کە فێر کراوی، ئەویش فەرمووی: تۆ ناتوانی هەرگیز لەگەڵ من خۆت بگری، ئەی موسا من خوا فێری جۆرێ لە زانینی کردووم تۆ نایزانی وە تۆش خوا فێری هێندێ زانینی کردووی من نایزانم. (قال: ستجدني إن شاء الله صابرا ولا أعصي لك أمرا، فانطلقا يمشيان على ساحل البحر ليس لهما سفينة، فمرت بهما سفينة، فكلموهم أن يحملوهما، فعرف الخضر فحملوهما بغير نول. فجاء عصفور فوقع على حرف السفينة، فنقر نقرة أو نقرتين في البحر، فقال الخضر :يا موسى، ما نقص علمي و علمك من علم الله إلا كنقرة هذا العصفور في البحر) موسا فەرمووی: إن شاء الله منت دەست نەکەوێ بە خۆگرو پێچەوانەی فەرمانی تۆ ناکەم، پاشان ڕۆیشتن بە قەراغی دەریایەکەداو کەشتیان نەبوو، لەوێدا کەشتی‌یەک تێپەڕی بەلایانداو داوایان لێ کردن کە سواریان بکات، کەشتیەوانەکان خضریان دەناسی لەبەر ئەوە بەبێ کرێ سواریان کردن. لەو کاتەدا پەلەوەرێک -پاساری- هات و دەڵی پلی سرگ بووە هات و دەنووکێک یان دوو دەنووکی دا لە دەریاکە، خضر فەرمووی: ئەی موسا زانینی من و تۆ چاو نادات لە چاو زانینی خوادا مەگەر بە ئەندازەی کەم کردنی ئەو ئاوی دەنووکی ئەو پەلەوەرە لە دەریاکە (فعمد الخضر إلى لوح من ألواح السفينة فنزعه، فقال موسى قوم حملونا بغير نول عمدت إلى سفينتهم فخرقتها لتغرق أهلها) ئینجا خضر دەستی برد تەختەیەک یا دوو تەختەی کەشتی‌یەکەی دەرهێنا، موسا فەرمووی: کۆمەڵێک ئێمەیان سوار کردووە بە بێ کرێ و تۆش دەست کاریت کردو کونت تێ کرد تا خەڵکەکەی نوقم بکەیت، واتە کارێکی نارەوات کرد (قال: ألم أقل إنك لن تستطيع معي صبرا. قال: لا تؤاخذني بما نسيت. فكانت الأولى من موسى نسيانا) خضر فەرمووی: من پێم نەگوتی کە تۆ ناتوانی لەگەڵ من خۆت بگری، موسا فەرمووی:لێم مەگرە بە هۆی ئەوەوە لەبیرم نەبوو، کەواتە ئەم جارەی موسا لەبەر لەبیر نەبوون بوو (فانطلقا، فإذا

غلام يلعب مع الغلمان، فأخذ الخضر برأسه من أعلاه فاقتلع رأسه بيده، فقال موسى: أقتلت نفسا زكية بغير نفس؟) ئينجا رۆيشتن و ديتيان منداڵێک گەمە ئەکات لە ناو منداڵاندا، ئيجا خضر گرتى بەسەرى بە دەستى خۆى سەرى هەڵکەند، ئينجا موسا فەرمووى: ئايا تۆ کەسێکى بێ تاوان ئەکوژى بە ناهەق. (قال: ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبرا؟) خضر فەرمووى پێى: من پێم نەگوتى تۆ ناتوانى لەگەڵ من خۆت بگرى (قال ابن عيينة: وهذا أوكد) ئيبن عويەينە کە ريوايەتە ئەکات ئەڵێ ئەم کارە سەخت تر بوو لەکارى پێشوو. (فانطلقا حتى إذا أتيا أهل قرية استطعما أهلها فأبو أن يضيفوهما. فوجدا فيها جدارا يريد أن ينقض فأقامه، قال الخضر بيده فأقامه. فقال له موسى: لو شئت لاتخذت عليه أجرا) ئينجا پێکەوە رۆيشتن هەتا گەيشتنە شارێک داواى خۆراکيان لى کردن ئەوانيش سەرپێچى‌يان کرد لە نان پێدان و ميوانداريان و لەو شارەدا ديوارێکيان بينى کە خەريک بوو بکەوێ، کەچى خضر راستى کردەوە بە دەستى خۆى، موسا پێى فەرمو: ئەگەر مەيلت ببوايە کرێت وەرئەگرت لەسەر راست کردنەوەى (قال: هذا فراق بيني و بينك) لەوێدا خضر فەرمووى: ئەمە کاتى جوێ بوونەوەى نێوان من و تۆيەو ئيتر هاورێيەتيت ناکەم (قال النبي ﷺ: «يرحم الله موسى، لوددنا لو صبر حتى يقص علينا من أمرهما») پێغەمبەر ﷺ فەرمووى: خوا رەحم بکات بە موسا پێمان خۆش بوو سەبرى بکردايە هەتا لە کارى ئەم دوانەمان بۆ باس بکرايە.

لە تەفسيرەکەدا و لێرەشدا دەڵێين کە هەر کەسێ بە گەورەو زانا سەرنج بدرێ و بە وەلى دابنرێ هەرکاتێ کارێکى بێ شەرعى کرد ئەبێ ئينکارى بکرێ ونابێ هيچ کەس بڵێ ئێمە نازانين و ئەو خۆى ئەزانێ. زۆر لە موسڵمانان دەربارەى ئەم جۆرە گەورانە دەبينين دەڵێن خۆى بەرچاوى روونە وەک خضر کە ئەو شتە بێ شەرعيانەى کرد لەبەرئەوەى ئەو سيرەکەى دەزانێ رەخنەکانى حەزرەتى موسا پەسەند نەکرا. زۆر لە موسڵمانان ئەو هەڵە گەورە ئەکەن، بەڵام شتێکى ئاشکرايە هيچ کەسێکى تر ناگاتە ريزى ئەو چونکە ئەو پێغەمبەر بووەو بە وەحى شتەکەى بۆ روون کراوەتەوە، ئەگەر پێغەمبەريش نەبووبێ خواو پێغەمبەرێکى مورسەلى وەک موساى ئاگادار کردووە بە راست و رەوايى کردەوەکانى خضر. بێجگە لەوەش کردەوەکانى خضر لە راستيدا بێ شەرعى نەبوون، لەم رووداوى حەزرەتى موساو خضردا چەند شتێک

وەردەگیرێ:

١) ژیری و زانینی ئێمەو کاروکردەوەی خوا بەراورد ناکرێ، بەڵکو هەموو شتێ بە پێی مەیل و بڕیاری خوایەو ئێمە لەسەرمانە گوێ رایەڵی و رەزامەندی و مل کەچیی.

٢) نابێ بۆچی و چۆن لە ئێمەوە بێ دەربارەی کارو بڕیارەکانی خوا، وە عەقڵ و ژیریی ئێمە رێ نابات بە چاکی و خراپی و سودو زیان و بڕیاری ئەوە نادات بەڵکو ئەبێ لە شەرعەوە ئەو شتانە وەربگیرێ و بە پێی شەرع پێوانە ئەکرێن.

٣) خوا خۆی موختارەو هیچ شتێ واجب نیيە لەسەر خوا.

٤) نابێ لەم رووداوەوە وا بزانرێ کە خضر گەورەترە لەحەزرەتی موسا، چونکە ئەگەر پێغەمبەریش بێت هەموو پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلی تابیعی ئەون.

*** *** ***

## ٤٥ـ بابُ مَنْ سَأَلَ وَهُوَ قَائِمٌ عَالِمًا جَالِسًا

١٢٣ـ حَدَّثَنَا عُثْمَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا جَرِيرٌ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ أَبِي مُوسَى قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مَا الْقِتَالُ فِي سَبِيلِ اللهِ؟ فَإِنَّ أَحَدَنَا يُقَاتِلُ غَضَبًا وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً. فَرَفَعَ إِلَيْهِ رَأْسَهُ -قَالَ: وَمَا رَفَعَ إِلَيْهِ رَأْسَهُ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ قَائِمًا- فَقَالَ: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللهِ عَزَّوَجَلَّ».

(باب من سأل وهو قائم عالما جالسا) ئەمە بابی کەسێکە کە بە پێوە پرسیار بکات لە عالمێک کە دانیشتبێت. واتە ئەگەر کەسێک بەو شێوە پرسیار بکات و زاناکە دانیشتبێ دروستەو نابێ بەبێ شەرعی، بە پێی ئەو حەدیسەی کە هەڕەشە ئەکات لەو کەسانە کە خەڵکی لەبەردەمیاندا ئەوەستێ بەڵام پێویستە زاناکە عوجب نەیگرێ.

لەم بارەیەوە ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو موساوە کە ئەفەرموێ: (جاء رجل إلى النبي ﷺ فقال: يا رسول الله، ما القتال في سبيل الله؟) پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا جەنگ لە رێی خوادا کامەیە (فإن أحدنا يقاتل غضبا و يقاتل حمية. فرفع إليه رأسه -قال: وما رفع إليه رأسه إلا أنه كان قائما-) چونکە هێنی وامان هەیە لەبەر تایفەگەرێتی دەجەنگێ، کە سەری بەرز کردەوە بۆ لای -لەبەر ئەوە پرسیارکەرەکە بەپێوە بووە- وەڵامی دایەوەو فەرمووی: (فقال: «من قاتل

لتكون كلمة الله هي العليا فهو في سبيل الله عزوجل») هەركەس جەنگ بكات لەبەر ئەوەی هەر كەلیمەی خوا بڵند بێت هەر ئەوە لە ڕێگەی خوادایە. واتە هیچ نیازێكی تری نەبێت لەو جەنگەدا. بێجگە لە بەرزكردنەوەی ئایین و حوكمی خوا، وە تەنها كردەوەی رواڵەتی بەس نی‌یە، بەڵكو ئەبێ هەر ئەوەی نیاز بێ، وە لەم فەرمودەوە وەرئەگیرێ كەسوننەتە پرسیار لێ كراو روو بكاتە پرسیار كەر. وە لە بابی جیهاددا چەند شتێ هەیە بە ئیزنی خوا لەوێ باسی ئەكەین.

ئەم حەدیسە لە ژمارەكانی: (٢٨١٠، ٣١٢٦، ٧٤٥٨)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٤٦- بابُ السُّؤَالِ وَالْفُتْيَا عِنْدَ رَمْيِ الْجِمَارِ

١٢٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْعَزِيزِ بنِ أَبِي سَلَمَةَ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ عِيسَى ابْنِ طَلْحَةَ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَمْرٍو قَالَ: «رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ عِنْدَ الْجَمْرَةِ وَهُوَ يُسْأَلُ فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللهِ نَحَرْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِيَ. قَالَ: ارْمِ وَلاَ حَرَجَ. قَالَ آخَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَنْحَرَ. قَالَ: انْحَرْ وَلاَ حَرَجَ. فَمَا سُئِلَ عَنْ شَيْءٍ قُدِّمَ وَلاَ أُخِّرَ إِلاَّ قَالَ: افْعَلْ وَلاَ حَرَجَ».

(باب السؤال و الفتيا عند رمي الجمار) ئەمە بابی پرسیارو فتوایە لە كاتی رەمی جەمەرەدا لە كاتی حەج. واتە خەریک بوون بە عیبادەتێكەوە نابێ بە مانع لە عیبادەتێكی تر كە بكونجێن بەجێ هێنانیان پێكەوە، هەروەها وەرئەگیرێ كە قسە كردن لەو كاتەدا دروستە. ئینجا ئەگەر كەسێ بڵێ لە حەدیسەكەدا ئەمە نی‌یە كە پرسیارو وەڵامەكە لە كاتی رەمیدا بووبێ لەوەڵامدا دەڵێین:هەوڵدان وچوونە پێشەوە بۆ رەمی هەر بە كاتی رەمیەكە سەیر ئەكرێ، كەواتە ترجمەكەی ئیمامی بوخاری هیچ رەخنەی تێدا نی‌یە -رەحمەتی خوای لێ بێت-.

لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە عبداللەی كوڕی عمرەوە كە ئەفەرموێ: («رأيت النبي ﷺ عند الجمرة وهو يسأل) پێغەمبەرم ﷺ بینی لە كاتی جەمەرەدا پرسیاری لێ ئەكرا (فقال رجل: يا رسول الله نحرت قبل أن أرمي. قال: أرم ولا حرج.) پیاوێک عەرزی پێغەمبەری كرد ئەی پێغەمبەری خوا نەحرم كرد پێش رەمی، پێغەمبەریش فەرموی: رەمی بكەو هیچ ئەرەجێک نی‌یە، (قال آخر: يا رسول الله حلقت قبل أن أنحر. قال: انحر ولا

حرج.) یەکێ تر عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خوا حەلقم کرد پێش نەحر، ئەویش فەرمووی: نەحر بکەو هیچ ئەرەجێک نیە (فما سئل عن شئ قدم ولا أخر إلا قال: افعل ولا حرج) هەر پرسیارێکی لێ ئەکرا بۆ پێش خستن یان دوا خستن ئەیفەرموو بیکەو هیچ ئەرەجێک نیە.

*** *** ***

٤٧- بابُ قَوْلِ اللهِ تَعَالَى: ﴿وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ (الإسراء:٨٥)

١٢٥- حَدَّثَنَا قَيْسُ بنُ حَفْصٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ سُلَيْمَانُ عَنْ إِبْرَاهِيمَ عَنْ عَلْقَمَةَ عَنْ عَبْدِاللهِ قَالَ: بَيْنَا أَنَا أَمْشِي مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي خَرِبِ الْمَدِينَةِ -وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى عَسِيبٍ مَعَهُ- فَمَرَّ بِنَفَرٍ مِنَ الْيَهُودِ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ: سَلُوهُ عَنِ الرُّوحِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ لاَ تَسْأَلُوهُ لاَ يَجِيءُ بِشَيْءٍ تَكْرَهُونَهُ. فَقَالَ بَعْضُهُمْ لَنَسْأَلَنَّهُ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْهُمْ فَقَالَ: يَا أَبَا الْقَاسِمِ، مَا الرُّوحُ؟ فَسَكَتَ. فَقُلْتُ: إِنَّهُ يُوحَى إِلَيْهِ، فَقُمْتُ. فَلَمَّا انْجَلَى عَنْهُ، فَقَالَ: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الرُّوحِ قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُمْ مِنَ الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾ قَالَ الأَعْمَشُ: هَكَذَا فِي قِرَاءَتِنَا.

(باب قول الله تعالى: ﴿وما أوتيتم من العلم إلا قليلا﴾ (الإسراء:٨٥)) ئەمە بابی ئەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێت: بێجگە لە شتێکی کەم زانینتان پێ نەبەخشراوە.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عبداللەوە کە فەرمووی: (بینا أنا أمشي مع النبي ﷺ في خرب المدينة -وهو يتوكأ على عسيب معه-) کاتێ من ئەگەڕام لەگەڵ پێغەمبەردا لە کەلاوەو شوێنە چۆڵەکانی مەدینەدا لە کاتێکدا خۆی دابوو بەسەر داردەستێکدا لە پەلی خورما (فمر بنفر من اليهود، فقال بعضهم لبعض: سلوه عن الروح.) ڕابورد بەلای چەند کەسێک لە جولەکەدا لەناو خۆیاندا گوتیان پرسیاری لێ بکەن لە بارەی ڕۆح (وقال بعضهم لاتسألوه لا يجيء بشيء تكرهونه.) هێندێکیان گوتیان پرسیاری لێ مەکەن وەڵامتان ناداتەوە بە شتێ کە ئێوە پێتان ناخۆشە، واتە شتێ نالێ کە پێچەوانە بێت تا ئەوە بکەن بە ڕەخنە بەسەریەوە (فقال بعضهم لنسألنه، فقام رجل منهم فقال: يا أبا القاسم، ما الروح؟) هێندێکیان گوتیان بە خوا پرسیاری لێ دەکەین، ئینجا یەکێکیان هەستاو گوتی ئەی

ئەبولقاسم رۆح چی‌یە؟ (فسكت. فقلت: إنه يوحى إليه) ئەمیش بێ دەنگ بوو، عبدالله ئەفەرموێ: زانیم وەحی بۆ دێت. (فقمت. فلما انجلى عنه، فقال: ﴿و يسألونك عن الروح قل الروح من أمر ربي وما أوتيتم من العلم إلا قليلا﴾) منیش هەستام بۆ ئەوەی وەزعەکەی لێ تێک نەدەم یان بۆ ئەوەی ببم بە حائیل لە نێوان ئەم و ئەواندا. وتەی رۆح بەکارهێنراوە بۆ جوبرەئیل، قورئان، وەحی، عیسا، گیان. لەناو ئەوانەدا لێرەدا دڵ بۆ گیان دەڕوا. واتە مەبەستی جولەکەکان پرسیار بوبێ لە گیان کە هیچ کەس نازانێ چی‌یە بێجگە لە خواو لە جۆری ئەم جیهانی ئێمە نی‌یە، لێرەدا ئەمە هەیە (قال الأعمش: هكذا في قراءتنا) ئەم رستەیە ئەهێڵینەوە تا کاتێکی تر مەبەستەکەمان بۆ دەرئەکەوێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٧٢١، ٧٢٩٧، ٧٤٥٦، ٧٤٦٢)دا دووبارە بووەتەوە.

***   ***   ***

## ٤٨ـ بابُ مَنْ تَرَكَ بَعْضَ الإِخْتِيَارِ مُخَالَفَةَ أَنْ يَقْصُرَ فَهْمُ بَعْضِ النَّاسِ عَنْهُ فَيَقَعُوا فِي أَشَدَّ مِنْهُ.

١٢٦ـ حَدَّثَنَا عُبَيْدُاللهِ بنِ مُوسَى عَنْ إِسْرَائِيلَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ عَنِ الأَسْوَدِ قَالَ: قَالَ لِي ابْنُ الزُّبَيْرِ: كَانَتْ عَائِشَةَ تُسِرُّ إِلَيْكَ كَثِيراً، فَمَا حَدَّثَتْكَ فِي الْكَعْبَةِ؟ قُلْتُ قَالَتْ لِي: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا عَائِشَةَ لَوْلاَ قَوْمُكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ -قَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: بِكُفْرٍ- لَنَقَضْتُ الْكَعْبَةَ فَجَعَلْتُ لَهَا بَابَيْنِ: بَابٌ يَدْخُلُ النَّاسُ، وَ بَابٌ يَخْرُجُونَ» فَفَعَلَهُ ابْنُ الزُّبَيْرِ.

(باب من ترك بعض الاختيار مخالفة أن يقصر فهم بعض الناس عنه فيقعوا في أشد منه) ئەمە بابی ئەوەیە کەسێک هێندێ کاری چاک واز لێ بێنێ و راینەگەیەنێ لەبەر ئەوەی هێندێ تێ‌ی نەگات و بە هۆی ئەوەوە نەکەوێتە هەڵەیەکی سەخت تر.

لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن و زوبەیرەوە کە ئەفەرموێ: (كانت عائشة تسر إليك كثيرا، فما حدثتك في الكعبة؟) ئەڵێ گوتیان پێم عائشە هەواڵی نهێنی زۆرت پێ‌یە ئەڵێ ئایا لە بارەی کەعبەوە چی باس کردووە بۆت؟ (قلت قالت لي: قال النبي ﷺ: «يا عائشة لولا قومك حديث عهدهم -قال ابن الزبير: بكفر-) پێ‌ی گوتم پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی عائشە ئەگەر قەومەکەت تازە نەبوونایە لە بارەی دەق گرتنەوە بە کوفر

(لنقضت الكعبة فجعلت لها بابين: باب يدخل الناس، و باب يخرجون، ففعله ابن الزبير) ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کەعبەم ئەڕوخاندو سەر لە نوێ تازەم ئەکردەوەو دوو قاپیم بۆ دائەنا، واتە ئەو گەلە ئەوەندە کەعبەیان بەلاوە گەورەو پیرۆزە ئەگەر دەستکاری بکەم لەوانەیە لە دین وەربگەڕێن، بەڵام ئەو کارە چاکە بەجێ ناهێنم لەبەر ئەو مەترسی‌یە. کاتی خۆی حەزرەتی ئیبراهیم کەعبەی بینا کرد بە جۆری شازروانی و حجری لەسەر بوو، لە پاشان قورەیش پارەو ماڵی حەلاڵیان کۆکردەوە ئەوەندە نەبوو کە لەسەر بناغەکەی حەزرەتی ئیبراهیم دروستی بکەنەوە. جا پێغەمبەری ئازیز پێی خۆش بوو لەسەر بناغە ئەسڵی‌یەکەی دروستی بکاتەوە کە ئەوە کارێکی چاک تر بوو. والحمد لله لەم ساڵی ١٤١٧دا دەوڵەتی سعودیە ئەو کارە پیرۆزەیان ئەنجامداو بەو شێوە بینایان کردووە. لەم حەدیسە پیرۆزەوە دەرئەکەوێ مەبەستی ترجمەکەی تێدایەکە وازهێنانە لە کاری چاک لەبەر مەترسی لە ڕوودانی کاری خراپ، وە ئەو یاسا پیرۆزەی تێدایە: (ترك المصلحة أولى من الوقوع في المفسدة) هەروەها واز هێنانی لە ئینکاری شتی منکەر لەبەر مەترسی لە ڕوودانی کاری بەدتر. وە ئەمەش وەرئەگیرێ کە کاربەدەست پێویستە سیاسەتی خەڵکی ببا بەڕێوە بە شێوەیەک کە سەرنجی خەڵکی ڕاکێشێ بۆ ئیسلام ماتوانێ ئەو بارە حەرام نەبێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٥٨٣، ١٥٨٤، ١٥٨٥، ١٥٨٦، ٣٣٦٨، ٤٤٨٤، ٧٢٤٣)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

٤٩- بابُ مَنْ خَصَّ بِالْعِلْمِ قَوْمًا دُونَ قَوْمٍ كَرَاهِيَةَ أَنْ لاَ يَفْهَمُوا.

وَقَالَ عَلِيٌّ: حَدِّثُوا النَّاسَ بِمَا يَعْرِفُونَ، أَتُحِبُّونَ أَنْ يُكَذَّبَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ؟

١٢٧- حَدَّثَنَا عُبَيْدُاللهِ بنِ مُوسَى عَنْ مَعْرُوفِ بنِ خَرَّبُوذٍ عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ عَنْ عَلِيٍّ بِذَلِكَ.

١٢٨- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا مُعَاذُ بنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بنُ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ -وَمُعَاذٌ رَدِيفُهُ عَلَى الرَّحْلِ- قَالَ: يَا مُعَاذُ ابْنَ جَبَلٍ. قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ. قَالَ: يَا مُعَاذُ. قَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللهِ وَسَعْدَيْكَ

(ثَلاَثًا) ، قَالَ: «مَا مِنْ أَحَدٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ صِدْقًا مِنْ قَلْبِهِ إِلاَّ حَرَّمَهُ اللَّهُ عَلَى النَّارِ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلاَ أُخْبِرُ بِهِ النَّاسَ فَيَسْتَبْشِرُوا؟ قَالَ: إِذًا يَتَّكِلُوا. وَأَخْبَرَ بِهَا مُعَاذٌ عِنْدَ مَوْتِهِ تَأَثُّمًا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (١٢٩)دا دووبارە بووەتەوە.

١٢٩ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ سَمِعْتُ أَبِي قَالَ سَمِعْتُ أَنَسًا قَالَ: ذُكِرَ لِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِمُعَاذٍ: «مَنْ لَقِيَ اللَّهَ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ» قَالَ: أَلاَ أُبَشِّرُ النَّاسَ؟ قَالَ «لاَ: إِنِّي أَخَافُ أَنْ يَتَّكِلُوا».

(باب من خص بالعلم قوما دون قوم كراهية أن لا يفهموا) ئەمە بابی ئەوە کەسێک عیلم و زانینێک تایبەتی بکات بە تاقمێکەوەو نەیگەیەنێ بە تاقمێ تر نەک ئەو تاقمە تێ ی نەگەن و لەم بارەوە ئیمامی عەلی خوای لێ رازی بێ ئەفەرموێ: (وقال علي: (حدثوا الناس بما يعرفون، أتحبون أن يكذب الله ورسوله؟) بۆ خەڵکی شتێ باس بکەن و رایگەیەنن کە بیزانن و وەری بگرن ئایا پێتان خۆشە باوەڕ نەکرێ بە خواو پێغەمبەر. واتە ئەگەر شتێ باس بکەن کە لە ژێری ئەوان بەدەر بێت بە درۆی دائەنێن و ئەو کاتە کافر ئەبن. وە لەم بارەوە ئیمامەکان وهاوەڵەکانی جڵەوگیریان کردووە لە هەواڵدان و گێڕانەوەی ئەو شتانەی کە سەر تێک ئەدەن لە نەزانان. بە کورتی هەرشتێ کە رواڵەتی حەدیسەکە بیدعەت و لادان نیشان بدات و ئەوەش مەبەست نەبێ بێ دەنگ بوون لێ ی چاکە. ئەم حەدیسە هەر وەک حەدیسی پێشوو وایە، بەڵام ئیمامی بوخاری ئەیانهێنێ بۆ گەیاندنی هەر حەدیسێ کە پێ ی گەشتبێ و وەک تاکید وایە بۆ حەدیسەکەی تر. بێجگە لەوەش ئەم دوو حەدیسە جیاوازن لەم بارەیەوە کە ئەم حەدیسە بۆ گوتنەو حەدیسی پێشوو بۆ کردەوەیە یان بۆ هەردووکیان.

هەر لەم بابەدا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە موعازی کوڕی جەبەلەوە کە (قال: حدثنا أنس بن مالك أن النبي ﷺ -ومعاذ رديفه على الرحل-) ئەفەرموێ: موعاز لە کاتێکدا لە پشت پێغەمبەرەوە بووە (قال: يا معاذ ابن جبل.) فەرموی: ئەی موعازی کوڕی جەبەل. (قال: لبيك يا رسول الله و سعديك. قال: يا معاذ. قال: لبيك يا رسول الله و سعديك «ثلاثا»)ئەویش سێ جار ئەو فەرمودەی تیکرار کردەوەو موعازیش بەو شێوە وەڵامی

داوەتەوەو ئینجا (قال: «ما من أحد يشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله صدقا من قلبه إلا حرمه الله على النار») هەرکەسێک شایەتومان بێنێ بەراستی لە دڵیەوە خوا قەدەغەی ئەکات لە ئاگرو ئاگری دۆزەخ نایسوتێنێ. بێگومان حەدیسی زۆر هەیە کە باسی عەزابی موسڵمانانی گوناهبار ئەکات هەموو زانایانی باوەڕ پێکراو لەسەر ئەوەن، کەواتە ئەبێ ئەم حەدیسی ئەبو زەڕە رێک بخرێ لەگەڵ ئەوانەو ئەم دژایەتی‌یە نەهێڵرێ، بۆ ئەو مەبەستە زانایان چەند شتێکیان فەرموە هێندێکیان ئەهێنین کە بەلامانەوە بەهێزترە. یەکەم مەبەست قەدەغەکردنی هەمیشەیی و ئیجگاری‌یە ، واتە هەرکەسێ بەو باوەڕەوە بمرێ ئەبەدی نابێ، دووەم مەبەست قەدەغە کردنی هەموو لەشە بە جارێ، واتە هەموو لەشی ناسوتێنێ وەک لە حەدیسدا هاتووە زمان و دڵ و ئەو شوێنانەی کە ئاوی دەست نوێژی لێ کەوتبێ خوا نایسوتێنێ. سێ‌یەم مەبەست ئەو ئاگرەیە کە دیاریی کراوە بۆ سوتاندنی کافران نەک تەبەقەی یەکەم کە سوک ترینەو دانراوە بۆ باوەڕدارانی گوناهبار. زانینی تەواو لای خوایە. لەم حەدیسەدا دەرئەکەوێ ئەوپەڕی بەزەیی و میهرەبانی پێغەمبەری ئازیزﷺ دەربارەی یارەکانی کە خستوونی‌یە پاشکۆی خۆی، هەروەها رادەو پلەی بەرزی موعاذە کە تا ئەو رادەیە نزیک بووە لەو لوتف و میهرەبانی‌یە، هەروەها راگەیاندنی ئەو موژدەیە بە هۆی ئەو، هەروەها وەرئەگیرێ کە قوتابی بۆی هەیە پرسیار بکات لە مامۆستا لە هەر شتێ تا بۆ روون ئەبێتەوە، وە بۆ راگەیاندنی ئەوعیلمەی کە پێی گوتراوە پرس بکات لە مامۆستا بۆ بلاو کردنەوەی ئەوەی پێی گوتراوە.

لە حەدیسی حەسەندا هاتووە کە موعاز تووشی عمر دێت -خوایان لێ رازی بێت- و ئەم حەدیسەی بۆ باس ئەکات و ئەویش ئەفەرموێ پەلە مەکەو ئینجا دێتە خزمەت پێغەمبەرﷺ تۆ باش ئەزانی، بەلام ئەگەر خەڵکی ئەمە ببیستن ئیتر پاڵ ئەدەنەوە بەبێ غەم، ئەفەرموێ: ئەویش راکەی فاروقی پەسەند کرد، لەبەر ئەوە فەرموی بە موعاذ کە رایئەگەیەنێ. لەوەیشەوە دەرئەکەوێ کە ئیجتیهاد دروست بووە لە حوزوری پێغەمبەریشداﷺ . ئەو رای فاروقە یەکێکە لە راو بۆچوونە بەرزەکانی کە موافیقی هەق دەرچووە. ئینجا ئەم حەدیسەی موعاز لە کاتی مردنیدا رایگەیاند تا گوناهبار نەبێ لە بارەی کەتمی عیلمەوە.

***     ***     ***

## ٥٠ـ بابَ الْحَيَاءِ فِي الْعِلْمِ

وَقَالَ مُجَاهِدٌ: لاَ يَتَعَلَّمُ الْعِلْمَ مُسْتَحْيٍ وَلاَ مُسْتَكْبِرٌ. وَقَالَتْ عَائِشَةُ: نِعْمَ النِّسَاءُ الأَنْصَارِ، لَمْ يَمْنَعْهُنَّ الْحَيَاءُ أَنْ يَتَفَقَّهْنَ فِي الدِّيْنِ.

١٣٠ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ سَلاَمٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ عَنْ أَبِيْهِ عَنْ ابْنَةِ أُمِّ سَلَمَةَ قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ، إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ، فَهَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذَا احْتَلَمَتْ؟ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ. ن أُمُّ سَلَمَةَ -تَعْنِي وَجْهَهَا- وَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ وَتَحْتَلِمُ الْمَرْأَةُ؟ قَالَ: نَعَمْ، تَرِبَتْ ي، فَبِمَ يُشْبِهُهَا وَلَدُهَا؟

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٨٢، ٣٣٢٨، ٦٠٩١، ٦١٢١)دا دووبارە بووەتەوە.

١٣١ـ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ دِيْنَارٍ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عُمَرَ ولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنَ الشَّجَرِ شَجَرَةً لاَ يَسْقُطُ وَرَقُهَا وَهِيَ مَثَلُ الْمُسْلِمِ، حَدِّثُونِي يَ؟ فَوَقَعَ النَّاسُ فِي شَجَرِ الْبَادِيَةِ، وَوَقَعَ فِي نَفْسِي أَنَّهَا النَّخْلَةُ، قَالَ: عَبْدُاللهِ: حيَيْتُ. فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ أَخْبِرْنَا بِهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: هِيَ النَّخْلَةُ. قَالَ ه: فَحَدَّثْتُ أَبِي بِمَا وَقَعَ فِي نَفْسِي، فَقَالَ: لأَنْ تَكُونَ قُلْتَهَا أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يَكُونَ لِي كَذَا».

(باب الحيـاء في العلم) ئەمـە بابی ئەوەیە نابێ شـەرم و حـەیا بکرێ لە بارەی ندنی عیلمەوە.

لەم بارەیەوە ئیـمـامی بوخـاری رای مـوجـاهیـد ئەهێنێ بۆ هاندان لەسـەر راگـەیاندن ێ: (لا یتعلم العلم مستحي ولا مستکبر) هەرکەسێ شەرم بکات عیلم فێر نابێ، ها کەسێک خۆی بە گەورەو زل سەیر بکات فێر نابێ، چونکە دەماری ناهێنێ کە بە سەیر بکرێ. هەروەها دایکی هەموومان عـائشـە خـوای لێ رازی بێت، ئەفـەرمـوێ: لت عـائشـة: نعم النسـاء نسـاء الأنصار، لم يمنعهن الحيـاء أن يتـفـقـهن في الدين) انی ئەنصار زۆر چاکن شەرم کردن بەرگری نەکردن لەوەی زانا بن لە ئاییندا. واتە نابێ بکرێ و هەرکارێکی دین بێتە پێشەوە با پرس بکرێ و خۆ زانا بکرێ.

لەم بارەیەوە ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئوم سەلەمەوە کە ئەفەرموێ: (جاءت أم سليم إلى رسول اللهﷺ فقالت: يا رسول الله، إن الله لا يستحي من الحق، فهل على المرأة من غسل إذا احتلمت؟) کە ئوم سلیم هات و عەرزی پێغەمبەری کرد: خوا شەرم ناکات لەهەق ئایا ئافرەت غوسڵی لەسەرە کاتێ ئیحتیلام ببێ. (قال النبي إذا رأت الماء) پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەگەر ئاوی بینی. (فغطت أم سلمة -تعني وجهها- وقالت: يا رسول الله وتحتلم المرأة؟) ئینجا ئوم سەلەمە لە شەرمدا دەم و چاوی خۆی داپۆشی و گوتی: ئایا ئافرەت ئیحتیلامی ئەبێ؟ (قال: نعم، تربت يمينك، فبم يشبهها ولدها؟) بەڵێ دەستت بدرێ بە خۆڵەوە، ئەم وتەیە باو بووە لە کاتێ بێزاری دەربڕین لە قسەی بێ جێ. فەرموی بەڵێ ئیحتیلامی ئەبێ و ئاوی هەیە، ئەی ئەگەر ئاوی نی‌یە بە هۆی چی شێوەی منداڵی وەک خۆی وا ئەبێ. لە حەدیسێکی سەحیحدا هاتووە ئەگەر پیاو لە پێشەوە ئاوی هاتەوە کە منداڵیان ببێ شێوەی وەک باوکی وا ئەبێ، وە ئەگەر ئافرەت لە پێش مێردەکە ئاوی هاتەوە شێوەی منداڵەکە وەک دایکی وایە. ئەم باسە لە کتابی طهارەدا دێت و لەوێش قسەی لێ دەکرێ.

هەر لەم بابەدا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئیبن وعومەرەوە -خوا لێیان رازی بێت کە ئەفەرموێ: (أن رسول اللهﷺ قال: «إن من الشجر شجرة لا يسقط ورقها وهي كالمسلم، حدثوني ما هي؟) فەرمووی لەناو درەختەکاندا درەختێک هەیە گەڵاڕێزان ناکات و هەمیشە گەڵاکانی سەوزەو ئەو درەختە وێنەی موسڵمانە. بۆم باس بکەن ئەو درەختە کامەیە؟ (فوقع الناس في شجر البادية، ووقع في نفسي أنها النخلة) ئینجا خەڵکی کەوتنە بیر کردنەوە لە درەختەکانی شیو و دۆڵەکان. وە کەوتە دڵی من ئەو درەختە دارخورمایە (قال: عبدالله: فاستحييت. فقالوا: يا رسول الله أخبرنا بها) بەڵام شەرمم کرد نەمگوت. ئینجا خەڵکەکە ئەیان دۆزی‌یەوە، پرسیاریان کردو گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا هەواڵی ئەو درەختەمان پێ بدەو ئەویش فەرموی: (هي النخلة) ئەوە دارخورمایە. (قال عبدالله: فحدثت أبي بما وقع في نفسي، فقال: لأن تكون قلتها أحب إلي من أن يكون لي كذا و كذا) عبدالله ئەفەرموێ: عەرزی باوکمم کرد کە من ئەوە چووە دڵمەوەو شەرمم کرد نەمگوت، ئەویش

فەرموی ئەگەر بتگوتایە پێم خۆشتر بوو لەوەی شتی زۆر گەورەم دەست بکەوتایە، ئەم حەدیسە تاکید ئەکاتەوە لەوەی کە لە حەدیسی پێشوودا هات کە نابێ شەرم بکرێ لە شتی راست و هەق.

*** *** ***

## ٥١ـ بابُ مَنْ اسْتَحْيَا فَأَمَرَ غَيْرَهُ بِالسُّؤَالِ

١٣٢ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ دَاوُدَ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ مُنْذِرٍ الثَّوْرِيِّ عَنْ مُحَمَّدِ بنِ الْحَنَفِيَّةِ عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً، فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ أَنْ يَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ فَقَالَ: فِيهِ الْوُضُوءُ.

(باب من استحيا فأمر غيره بالسؤال) ئەمە بابی ئەوەیە ئەگەر کەسێ پرسیارێکی هەبێ و شەرم بکات لە گوتنی و بە هۆی ئەوەوە داوا بکات لە یەکێکی تر پرسیارەکەی بۆ بکات و لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیمامی عەلیەوە کە فەرموی: (کنت رجلا مذاء، فأمرت المقداد أن یسأل النبي ﷺ فسأله فقال: فیه الوضوء) من پیاوێک بووم وەزیم زۆر بوو شەرمم ئەکرد پرسیار بکەم لە پێغەمبەرﷺ لەبەرئەوە داوام کرد لە مقداد کە پرس بکات و ئەویش پرسی کردو پێغەمبەریش فەرموی: هەر دەست نوێژی لەسەرە، واتە لەشی پیس نابێ، دیارە پیسە وەک میز، کەواتە شۆرینی عەورەتیش پێویستە. وە لەبەرئەوەی بە هۆی مقدادەوە کارەکەی بۆ دەرکەوتووە، کەواتە رەخنەی لێ ناگیرێ بەوەی ئەنەبوو شەرمی بکردایە لە کاری دینیدا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٧٨ ، ٢٦٩)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٥٢ـ بابُ ذِكْرِ الْعِلْمِ وَالْفُتْيَا فِي الْمَسْجِدِ

١٣٣ـ حَدَّثَنِي قُتَيْبَةُ بنُ سَعِيدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ بنُ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا نَافِعٌ مَوْلَى عَبْدِاللهِ بنِ عُمَرَ بنِ الْخَطَّابِ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عُمَرَ أَنَّ رَجُلاً قَامَ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ، مِنْ أَيْنَ تَأْمُرُنَا أَنْ نُهِلَّ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «يُهِلُّ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَيُهِلُّ أَهْلُ الشَّامِ مِنَ الْجُحْفَةِ، وَيُهِلُّ أَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ». وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: وَ يَزْعُمُونَ أَنَّ رَسُولَ

اللهﷺ قَالَ: «وَيُهِلُّ أَهْلُ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ» وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: لَمْ أَفْقَهْ هَذِهِ مِنْ رَسُولِ اللهﷺ.

(باب ذكر العلم والفتيا في المسجد) ئەمە بابی ئەوەیە کە عیلم و فتوا لە مزگەوتدا شتێکی پەسەندە، لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عومەرەوە کە ئەفەرموێ: (أن رجلا قام في المسجد فقال: يا رسول الله، من أين تأمرنا أن نهل؟) کە پیاوێک لە مزگەوتدا هەستاو گوتی ئەی پێغەمبەری خوا لە کوێدا فەرمانمان پێ دەکەی کە ئیحرام ببەستین (فقال رسول اللهﷺ: «يهل أهل المدينة من ذي الحليفة، ويهل أهل الشام من الجحفة، ويهل أهل نجد من قرن») پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەهلی مەدینە ئیحرام ئەبەستن لە ذی الحلیفەو ئەهلی شام لە جحفەو، ئەهلی نجد لە قەرنەوە (وقال ابن عمر و يزعمون أن رسول اللهﷺ قال يهل أهل اليمن من يلملم) وە خەڵکی دەڵێن پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەهلی یەمەن لە یەلەملەمەوە (وكان ابن عمر يقول: لم أفقه هذه من رسول اللهﷺ) ئیبن عومەر ئەیفەرمو: من لە پێغەمبەرەوە وەرم نەگرتووە. ئەوە بەڵگەیە لەسەر زیادە وەرعی ئیبن عومەر، لەمەوپاش لە کیتابی حەجدا لەگەڵ سودی ئەمانەدا دێت.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٥٢٢، ١٥٢٥، ١٥٢٧، ١٥٢٨، ٧٣٣٤)دا دووبارە بووەتەوە.

***　　***　　***

## ٥٣ـ بابُ مَنْ أجَابَ السَّائِلَ بِأكْثَرَ مِمَّا سَألَهُ

١٣٤ـ حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ عَنْ نَافِعٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّﷺ، وَعَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ سَالِمٍ عَنْ ابْنِ عُمَرَ عَنِ النَّبِيِّﷺ، أَنَّ رَجُلاً سَأَلَهُ: مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ؟ فَقَالَ: «لاَ يَلْبَسُ الْقَمِيصَ وَلاَ الْعِمَامَةَ وَلاَ السَّرَاوِيلَ وَلاَ الْبُرْنُسَ وَلاَ ثَوْبًا مَسَّهُ الْوَرْسُ أَوِ الزَّعْفَرَانُ، فَإِنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا حَتَّى يَكُونَا تَحْتَ الْكَعْبَيْنِ».

(باب من أجاب السائل بأكثر مما سأله) ئەمە بابی ئەوەیە کەسێک وەڵامی پرسیار بداتەوە بە زیاتر لە پرسیارەکەی. واتە ئەسڵ وایە سەروبەر بێت لەگەڵ پرسیار، بەڵام لەبەر هۆیەکی پەسەند پەسەندە زیادە گوتن.

لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عومەرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە. وە لە زەهەری ئەویش لە سالم ئەویش لە ئیبن عومەرەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ: (أن رجلا سأله: ما یلبس المحرم؟) کە پیاوێک پرسیاری کرد لە پێغەمبەرﷺ ئایا کەسێ لە ئیحرامدا بێ چی بپۆشێ؟ (فقال: «لا یلبس القمیص ولا العمامة ولا السراویل ولا البرنس ولا ثوبا مسه الورس أو الزعفران، فإن لم یجد النعلین فلیلبس الخفین، ولیقطعهما حتی یکونا تحت الکعبین») بەم جۆرە وەڵامی دایەوە کە فەرموی: کراس نەپۆشن وە مێزەرو شەرواڵ و کڵاو و هەر پۆشاکێک کە بۆن خۆش کرابێ وە (زەعفەران)ی لێ درابێ وە ئەگەر پێڵاوی نەبوو با خوف بپۆشێ کە ژێرەکەی ببڕێ تا ئەگاتە ئەمە قاپی، ئەمە پێویست بوو، وە وەڵام لازم ناکاتە رێک بێت بە تایبەت کاتێ کە وەڵام گشتی بێت.ئەو کاتە وەڵامەکەشی تێدایەو زیادە فائیدەش رائەگەیەنێ، وە ئەمانەی کە ئەفەرموێ بێگانە نین لە پرسیارەکە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٦٦، ١٥٤٢، ١٨٣٨، ١٨٤٢، ٥٧٩٤، ٥٨٠٣، ٥٨٠٥، ٥٨٠٦، ٥٨٤٧، ٥٨٥٢)دا دووبارە بووەتەوە.

ئینجا لە دوا دوایی ئەم کیتابی عیلمەدا ئەوەش باس دەکەین کە ژمارەی ئەو حەدیسانەی کە لە حەدیسە مرفوعەکانن ١٥٢ حەدیسە و مکررەکانیش ١٦ حەدیسە وەک تێپەڕیان کردو رەحمەتی خوا لە ئیمامی بوخاری و خوا ئێمەش بەهرەمەند بکات بە حەدیس و ئیرشادەکانی، آمین.

سەر لە بەیانی سێ شەممە ئەم کیتابە دوایی هات، بە ئیزنی خوا دەست ئەکەین بە کیتابی وضوء. ٢٨ / ربیع الأول ١٤١٩.

*** *** ***

(٤)

# كِتَابُ الْوُضُوءِ

## ١ـ بَابُ مَا جَاءَ فِي الْوُضُوءِ،

وَقَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاَةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ، وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾ (المائدة: ٦)، قَالَ أَبُو عَبْدِاللهِ: وَبَيَّنَ النَّبِيُّ ﷺ أَنَّ فَرْضَ الْوُضُوءِ مَرَّةً مَرَّةً، وَتَوَضَّأَ أَيْضًا مَرَّتَيْنِ، وَثَلاَثًا، وَلَمْ يَزِدْ عَلَى ثَلاَثٍ. وَكَرِهَ أَهْلُ الْعِلْمِ الإِسْرَافَ فِيهِ، وَأَنْ يُجَاوِزُوا فِعْلَ النَّبِيِّ ﷺ.

(باب ما جاء في الوضوء) ئەمە بابی ئەو ئەحکامانەیە کە هاتووە لە بارەی دەست نوێژەوە بەپێی ئەو حەدیسانەی کە ئیمامی بوخاری دەستی کەوتوون. (و قول الله تعالى: ﴿إذا قمتم إلى الصلاة فاغسلوا وجوهكم و أيديكم إلى المرافق، وامسحوا برءوسكم و أرجلكم إلى الكعبين﴾ (المائدة: ٦)) وە بابی فەرمودەی خوایە ئیمامی بوخاری خوای لێ رازی بێت باوی وایە لەم کتێبە پیرۆزەدا هەر ئایەتێکی دەست کەوتبێ بۆ هەر کیتابێ لەپێشەوە هێناویەتی، ئینجا چووە بۆ حەدیسەکان. جا لێرەدا ئیمام ئەفەرموێ: (وبين النبيﷺ أن فرض الوضوء مرة مرة) پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی کە فەرزی دەست نوێژ بۆ ئەندامەکان یەک یەکە. واتە یەکجار بۆ دەم وچاو و یەک جار بۆ ئەندامەکانی تر. واتە بە یەک جار پێک دێت بەڵام (و توضأ أيضا مرتين، و ثلاثا، ولم يزد على ثلاث) بە دوویش و بە سێیش خۆی دەست نوێژی گرتووەو زیادی نەکردووە لە سێ. (وكره أهل العلم الإسراف فيه، و أن يجاوزوا فعل النبيﷺ) زانایان پێیان ناخۆش بووە زیادە رەوی لە دەست نوێژداو

تەجاوز کردن لە کردەوەی پێغەمبەرﷺ .

زانایانی سەلەف لە معنای ئایەتەکەدا دووبەرەکین. زۆربە لەسەر ئەوەن دەست نوێژ فەرزە کاتێ هەستای بۆ نوێژ ئەگەر بێ دەست نوێژ بووی، هێندێ ئەفەرمون مەبەست گشتی یە دەست نوێژ ببێ یان نا، کەواتە بە پێی ئەم رایە دەست نوێژ گرتن فەرزە بۆ هەموو نوێژێک و دەست نوێژ هەر یەک نوێژی پێ ئەکرێ. جا وا دەرئەکەوێ لە پێشەوە هەر وا بووە، لە پاشان ئەو سڕاوەتەوە لەبەر ئەرک و نارەحەتی وەک لە حەدیسی عبداللەی کوڕی حنظلەدا بەدەقی ئەوە هاتووە، لە حەدیسی موسلیمیشدا هاتووە کە پێغەمبەرﷺ بۆ هەموو نوێژێک دەست نوێژی ئەگرت تا ساڵی فەتحی مەککە لەوێدا بە یەک دەست نوێژ هەر پێنج نوێژە فەرزەکەی کردو حەزرەتی عومەر عەرزی کرد کە تۆ کردەوەیەکت کرد تا ئێستا نەت کردووە، ئەویش فەرموی: بە دەست قەست وام کرد واتە تا دەرکەوێ ئەوە دروستە، ئینجا هێندێ قسەی تر هەیە لەناو زانایاندا گوتراوە، بە پێویستم نەزانی باسی بکەم.

***        ***        ***

## ٢ـ بَابُ لاَ تُقْبَلُ صَلاَةٌ بِغَيْرِ طَهُورٍ

١٣٥ـ حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بنُ إِبْرَاهِيمَ الْحَنْظَلِيُّ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُالرَّزَّاقِ قَالَ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنْ هَمَّامِ بنِ مُنَبِّه أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ : «لاَ تُقْبَلُ صَلاَةُ مَنْ أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ» قَالَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ: مَا الْحَدَثُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: فُسَاءٌ أَوْ ضُرَاطٌ.

(باب لا تقبل صلاة بغير طهور) ئەمە بابێکە لە بارەی ئەوەی کە نوێژ بە بێ دەست نوێژ وەرناگیرێ.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (یقول: قال رسول اللهﷺ: «لا تقبل صلاة من أحدث حتى يتوضأ») ئەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرموی: کەسێ کە دەست نوێژی ئەبێ نوێژی لێ وەرناگیرێ هەتا دەست نوێژ ئەگرێ، واتە نوێژەکەی دانامەزرێ نەک مەبەست ئەوەیە کە سەوابی نامێنێ وەک هێندێ کردەوەی خراپ کە سەوابی نوێژ ناهێڵێ وەک ئەفەرموێ: (من أتى عرافا لم تقبل له صلاة). ئینجا هێندێ دەڵێن کە پێویستی دەست نوێژ لە مەدینەدا هات، بەڵام حەدیسی تر هەیە کە هەر لە مەککەشدا فەرز بووە، وە پێغەمبەری

ئازیزﷺ نوێژی بەبێ غوسل و دەست نوێژ هەرگیز نەبووە، وە مەبەست بە دە ست نوێژ تەیەمومیشە، کەواتە ئەگەر نوێژ بە تەیەموم کرا لە کاتی نەبوونی ئاو یان نەگونجانی بەکارهێنانی ئاو (قال رجل من حضرموت: ما الحدث يا أبا هريرة؟ قال: فساء أو ضراط).

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٦٩٥٤)دا دووبارە بووەتەوە.

***  ***  ***

## ٣ـ بَابُ فَضْلِ الْوُضُوءِ، وَالْغُرُّ الْمُحَجَّلُونَ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ

١٣٦ـ حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ خَالِدٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِلَالٍ عَنْ نُعَيْمٍ الْمُجْمِرِ قَالَ: رَقِيتُ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ عَلَى ظَهْرِ الْمَسْجِدِ فَتَوَضَّأَ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ «إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ».

(باب فضل الوضوء، والغر المحجلون من آثار الوضوء) ئەمە بابی گەورەیی دەست نوێژو باسی ئەوەیە کە ئوممەت ناو ئەبرێن و بانگ ئەکرێ بە دەم و چاو و قاچ سپێتی لە رۆژی دواییدا لەبەر بەرهەمی دەست نوێژەکەیان. واتە موسڵمانانی ئەم ئوممەتە لە رۆژی دواییدا بە دەم و چاو و قاچ سپێتی زیندوو ئەکرێنەوە لەبەر ئاوی ئەو دەست نوێژەی کە بوویانە.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە نعیم مجمر کە (قال: رقيت مع أبي هريرة على ظهر المسجد فتوضأ فقال:) ئەفەرموێ: لەگەڵ ئەبو هورەیرە چوینە سەربانی مزگەوت و دەست نوێژی گرت و ئینجا گوتی: (إني سمعت النبيﷺ يقول «إن أمتي يدعون يوم القيامة غرا محجلين من آثار الوضوء، فمن استطاع منكم أن يطيل غرته فليفعل») بیستم لە پێغەمبەرﷺ فەرموی ئوممەتی من لە رۆژی دواییدا بانگ ئەکرێن بە دەم و چاو و قاچ سپێتی لەبەر بەرهەمی دەست نوێژەکانیان، جا هەرکەس ئەیەوێ سپێتییەکەی زیاتر بکات با بیکات.

لەم حەدیسەوە وا دەرئەکەوێ و گومان ئەبرێ کە دەست نوێژ هەر لەم ئوممەتەدا بووەو لەگەڵ ئەوەدا بە حەدیس ثابتە کە دەست نوێژ لەپێش ئەم ئوممەتەشدا بووبێ. بەڵام ئەو رەخنەیە

ناچێته سەر چونکه له حەدیسەکەدا ئەو لەقەبەی حەسر نەکردووە لەسەر ئەم ئوممەته، کەواته با کەسانی تریش بێن هیچ مانع نی‌یەو ئەتوانین بڵێین ئەم نیشانەیە با یەکێ بێت لەو خەڵاته گرنگانەی که خوا بەخشیویەتی بەم ئوممەته. لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ دەست نوێژ گرتن بەسەر بانی مزگەوتەوە رەوایە، بەڵام بە مەرجێ سەریانەکه بپارێزێ له هەرچی شتێ که شایسته نی‌یە بۆ مزگەوت.

*** *** ***

## ٤ـ بَابُ لاَ يَتَوَضَّأُ مِنَ الشَّكِّ حَتَّى يَسْتَيْقِنَ

١٣٧ـ حَدَّثَنَا عَلِيٌّ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ وَعَنْ عَبَّادِ بْنِ تَمِيمٍ عَنْ عَمِّهِ أَنَّهُ شَكَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الرَّجُلُ الَّذِي يُخَيَّلُ إِلَيْهِ أَنَّهُ يَجِدُ الشَّيْءَ فِي الصَّلاَةِ، فَقَالَ: «لاَ يَنْفَتِلْ -أَوْ لاَ يَنْصَرِفْ- حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا».

(باب لا يتوضأ من الشك حتى يستيقن) ئەمە بابێکه ئەفەرموێ دەست نوێژ فەرز نی‌یە لەبەر گومانی بێ دەست نوێژی هەتا نوێژکەرەکه یەقینی نەبێ که دەست نوێژی نی‌یە.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ له مامی عبادی کوری تەمیمەوە (أنه شكا إلى رسول الله ﷺ الرجل الذي يخيل إليه أنه يجد الشيء في الصلاة) که باسی پیاوێکی کرد که له نوێژدا وا ئەکەوێته دڵیەوە که دەست نوێژی شکابێ و یەقینی نی‌یە که شکابێ ئایا چی بکات؟ (فقال: «لا ينفتل -أو لا ينصرف- حتى يسمع صوتا أو يجد ريحا») ئەویش فەرموی: نەیبرێ هەتا دەنگ دەبیستێ یان بۆن دێت بەسەریدا.

کۆڕو کۆمەڵی زانایان بە پێی ئەم حەدیسە رایان هەیە نیتر له کاتی نوێژەکەدا ئەوەی بەسەر بێت یان له پاش نوێژەکه. ئینجا ئەگەر ئیحتیات بکات چاکترە.

ئەم حەدیسە له ژمارەکانی: (١٧٧، ٢٠٥٦)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٥ـ بَابُ التَّخْفِيفِ فِي الْوُضُوءِ

١٣٨ـ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بْنُ عَبْدِاللَّهِ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ عَمْرٍو قَالَ أَخْبَرَنِي كُرَيْبٌ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَامَ حَتَّى نَفَخَ، ثُمَّ صَلَّى -وَرُبَّمَا قَالَ اضْطَجَعَ حَتَّى نَفَخَ ثُمَّ قَامَ

فصلى- ثمْ حدثنا به سفيانُ مرةً بعدَ مرةٍ عنْ عمرو عنْ كريبٍ عنِ ابنِ عبّاسٍ قالَ: بتُّ عندَ خالتي ميمونةَ ليلةً، فقامَ النبيُّ ﷺ منَ الليلِ، فلمّا كانَ في بعضِ الليلِ قامَ النبيُّ ﷺ فتوضأَ منْ شنٍّ معلّقٍ وضوءاً خفيفاً -يخففهُ عمرو ويقللهُ- وقامَ يصلي، فتوضأتُ نحواً ممّا توضأ، ثمْ جئتُ فقمتُ عنْ يسارهِ -وربّما قالَ سفيانُ: عنْ شمالهِ- فحولني فجعلني عنْ يمينهِ. ثمْ صلى ما شاءَ، ثمْ اضطجعَ فنامَ حتى نفخَ، ثمْ أتاهُ المنادي فآذنهُ بالصلاةِ، فقامَ معهُ إلى الصلاةِ فصلى ولمْ يتوضأْ. قلنا لعمرو: إنَّ ناساً يقولونَ: إنَّ رسولَ اللهِ ﷺ تنامُ عينهُ ولا ينامُ قلبهُ، قالَ عمرٌو: سمعتُ عبيدَ بنَ عميرٍ يقولُ: رؤيا الأنبياءِ وحيٌ ثمَّ قرأَ ﴿إنّي أرى في المنامِ أنّي أذبحُكَ﴾ (الصافات:١٠٢).

ئينجا دێته سەر باسی سووک و سوڵی لە دەست نوێژ گرتندا نەک بە قوڵی بۆ ی داچی وەک لە وڵاتی ئێمەدا باوە کە دەست نوێژەکە بە توندی ئەگرن و نوێژەکە هەروا بە بێ رۆح و پەلە ئەیکەن، ئەفەرموێ: (باب التخفيف في الوضوء) ئەمە بابی ئەوەیە کە سووک و سوڵی بەکار بهێنرێ لە دەست نوێژدا.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە -خوا لێیان رازی بێت- کە (أن النبيﷺ نام حتى نفخ، ثم صلى -وربماقال اضطجع حتى نفخ ثم قام فصلى- ثم حدثنا به سفيان مرة بعد مرة عن عمرو عن كريب عن ابن عباس) ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ خەوت هەتا پرخەی لێدا، ئینجا هەڵسا نوێژی کرد، ئینجا ئەفەرموێ: وا ئەزانم وتەی (نام)ی گوت یان (اضطجع) ئینجا سوفیان ریوایەتی کرد بۆمان جار لە پاش جار، واتە کاتێ بە کورتی باسی کردو کاتێکی تر بە درێژیی لە ئیبن عەباسەوە کە (قال: بت عند خالتي ميمونة ليلة، فقام النبيﷺ من الليل، فلما كان في بعض الليل قام النبيﷺ فتوضأ من شن معلق وضوءا خفيفا -يخففه عمرو ويقلله-) ئەفەرموێ: شەوێک مامەوە لای پورم کە میمونەیە -دایکی ئیمانداران- ئینجا پێغەمبەرﷺ هەستا بۆ شەونوێژ وە لە پاشان خەوت و ئینجا هەستا دەست نوێژێکی سووکی گرت لە کوندەیەک کە هەڵوسرابوو، واتە زۆر زۆر دەستی ئەهێنا بە ئەعزاکانیداو زیاد لە یەک جاری ئاوی ئەدا بە ئەعزاکانیدا (وقام يصلي) ئیبن

عەباس ئەفەرموێ: هەستاو نوێژی کرد (فتوضأت نحوا مما توضأ، ثم جئت فقمت عن يساره -وربما قال سفيان: عن شماله-) ئینجا منیش هەستام دەست نوێژم گرت بە وێنەی دەست نوێژەکەی ئەو و لە لای چەپیەوە وەستام (فحولني فجعلني عن يمينه) ئینجا وەری گێرام و خستمیە لای راستیەوە (ثم صلى ما شاء، ثم اضطجع فنام حتى نفخ، ثم أتاه المنادي فآذنه بالصلاة، فقام معه إلى الصلاة فصلى ولم يتوضأ) ئینجا نوێژی کرد ئەوە خوا ئیرادەی کردبوو لەپاشان راکشاوخەوت هەتا پرخەی لێداو ئینجا بانگ بێژ هات و هەواڵی پێدا بۆ نوێژکردن لەگەڵ خەڵکی و دەست نوێژی نەگرت، ئەوە بوو کە (قلنا لعمرو: إن ناسا يقولون: إن رسول الله ﷺ تنام عينه ولا ينام قلبه) وتمان بە عەمر چەند کەسێک دەڵێن پێغەمبەر ﷺ چاوی خەوتووەو دڵی نەخەوتووە، خەتابی دەڵێ: دڵی نەخەوتووە لەبەر ئەوەی ئاگادار بێت بە وەحیەک کە لە خەودا بۆی هاتبێ (قال عمرو: سمعت عبيد بن عمير يقول: رؤيا الأنبياء وحي ثم قرأ ﴿إني أرى في المنام أني أذبحك﴾ «الصافات:١٠٢») عەمر ئەفەرموێ: لە عوبیدی کوڕی عومیرم بیست کە ئەیفەرموو: خەو دیتنی پێغەمبەران وەحیەو ئینجا ئەم ئایەتەی کرد بە بەڵگە کە حەزرەتی ئیبراهیم فەرموی بە ئیسماعیل بەراستی من لە خەودا بینیم کە من تۆ سەر ئەبڕم.

ئەم حەدیسە بە روونی ئەو سووک و ئاسانی دەست نوێژ گرتنەی روون کردەوە کە مەبەستی بابەکە بوو.

***    ***    ***

## ٦ـ بَابُ إِسْبَاغِ الْوُضُوءِ.

### وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِسْبَاغُ الْوُضُوءِ: الإِنْقَاءُ

١٣٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مَسْلَمَةَ عَنْ مَالِكٍ عَنْ مُوسَى بنِ عُقْبَةَ عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ أُسَامَةَ بنِ زَيْدٍ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ: دَفَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ عَرَفَةَ حَتَّى إِذَا كَانَ بِالشِّعْبِ نَزَلَ فَبَالَ، ثُمَّ تَوَضَّأَ وَلَمْ يُسْبِغِ الْوُضُوءَ. فَقُلْتُ: الصَّلاَةَ يَا رَسُولَ اللهِ: فَقَالَ: الصَّلاَةُ أَمَامَكَ. فَرَكِبَ. فَلَمَّا جَاءَ الْمُزْدَلِفَةَ نَزَلَ فَتَوَضَّأَ فَأَسْبَغَ الْوُضُوءَ ثُمَّ أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ فَصَلَّى الْمَغْرِبَ، ثُمَّ أَنَاخَ كُلُّ إِنْسَانٍ بَعِيرَهُ فِي مَنْزِلِهِ، ثُمَّ أُقِيمَتِ الْعِشَاءُ فَصَلَّى، وَلَمْ يُصَلِّ

بينهما .

(باب إسباغ الوضوء. وقال ابن عمر : إسباغ الوضوء : الإنقاء) ئەمە بابی ئەوەیە کە دەست نوێژ بە تێرو تەواوی بگیرێ، ئیبن عومەر -خوایان لێ رازی بێت- مەبەستەکە روون ئەکاتەوە کە (إسباغ) بریتیە لە پاک و تەمیزی کردنی ئەندامەکانی دەست نوێژ.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە کە کورەیب بیستوویەتی کە (یقول : دفع رسول اللهﷺ من عرفة حتى إذا كان بالشعب نزل فبال، ثم توضأ) پێغەمبەرﷺ لە عەرەفە دەرچوو بەرەو موزدەلیفە هەتا گەیشتە ڕێگەکە کە ناسراوە دابەزی و دەست نوێژی شکاندو ئینجا دەست نوێژی گرتەوە (ولم يسبغ الوضوء) دەست نوێژێکی سووک (فقلت : الصلاة يا رسول الله: فقال : الصلاة أمامك) وتم: نوێژ ئەی پێغەمبەری خوا، ئەویش فەرمووی: نوێژ وا لە پێشمانەوە، واتە لەمەو پاش دەیکەین (فركب. فلما جاء المزدلفة نزل فتوضأ فأسبغ الوضوء ثم أقيمت الصلاة فصلى المغرب، ثم أناخ كل إنسان بعيره في منزله ،ثم أقيمت العشاء فصلى، ولم يصل بينهما )ئینجا سوار بوو کاتێ گەیشتە موزدەلیفە دابەزی و دەست نوێژی تەواوی گرت و ئینجا قامەت کراو نوێژی مەغریبی کرد، ئینجا هەرکەس حوشتری خۆی خوسداو لە مەنزڵی خۆی دانیشت و ئینجا قامەت کرا بۆ نوێژی عیشاو نوێژی کردو لە نێوان ئەو دوو نوێژەدا نوێژی تری نەکرد.

بۆ ئاگاداری ئەو ئاوەی کە دەست نوێژی پێ ئەگرت لەو شەوەدا ئاوی زەمزەم بوو، کەواتە ئەو کەسەی کە ئەڵێ ئاوی زەمزەم هەر بۆ خواردنەوەیە راستی نەکردووە. چەند شتێکی تر ماوە لەبارەی ئەم بابەوە لە کیتابی حەجدا دێت.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٨١، ١٦٦٩، ١٦٧٢)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٧ـ بابُ غَسْلِ الْوَجْهِ بِالْيَدَيْنِ مِنْ غَرْفَةٍ وَاحِدَةٍ

١٤٠ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ عَبْدِالرَّحِيم قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو سَلَمَةَ الْخُزَاعِي مَنْصُورُ بنُ سَلَمَةَ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ بِلاَلٍ -يَعْنِي سُلَيْمَانَ- عَنْ زَيْدِ بنِ أَسْلَمَ عَنْ عَطَاءِ بنِ يَسَارٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ تَوَضَّأَ فَغَسَلَ وَجْهَهُ، أَخَذَ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَمَضْمَضَ بِهَا وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ أَخَذَ غَرْفَةً مِنْ

مَاءٍ فَجَعَلَ بِهَا هَكَذَا أَضَافَهَا إِلَى يَدِهِ الأُخْرَى فَغَسَلَ بِهِمَا وَجْهَهُ، ثُمَّ أَخَذَ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَغَسَلَ بِهَا يَدَهُ الْيُمْنَى، ثُمَّ أَخَذَ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَغَسَلَ بِهَا يَدَهُ الْيُسْرَى، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ أَخَذَ غَرْفَةً مِنْ مَاءٍ فَرَشَّ عَلَى رِجْلِهِ الْيُمْنَى حَتَّى غَسَلَهَا، ثُمَّ أَخَذَ غَرْفَةً أُخْرَى فَغَسَلَ بِهَا رِجْلَهُ -يَعْنِي الْيُسْرَى- ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ يَتَوَضَّأُ.

(باب غسل الوجه باليدين من غرفة واحدة) ئەمە بابی ئەوەیە کە شۆردنی هەردوو دەست بە یەک مشت دروستەو رەوایە.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە کە (أنه توضأ فغسل وجهه، أخذ غرفة من ماء فمضمض بها واستنشق، ثم أخذ غرفة من ماء فجعل بها هكذا أضافها إلى يده الأخرى فغسل بهما وجهه، ثم أخذ غرفة من ماء يده اليمنى، ثم أخذ غرفة من ماء فغسل بها يده اليسرى، ثم مسح برأسه، ثم أخذ غرفة من ماء فرش على رجله اليمنى حتى غسلها، ثم أخذ غرفة أخرى فغسل بها رجله -يعني اليسرى- ثم قال: هكذا رأيت رسول الله يتوضأ) بەم شێوەیە بەدرێژی دەست نوێژی نیشاندایین، وە ئەو کەسەی کە ئەڵێ بەو تەڕی دەستییە مەسحی سەری کرد، کەواتە ئاوی بەکارهێنراو دەست نوێژی پێ ئەگیرێ قسەکەی بە راست دەرناچێ، چونکە ئاوی بەکارهێنراو ئەوەیە کە لە پاش شۆرین لە ئەعزاکە بێتەوە، دەی ئەمە جوێ نەبووەتەوە، دووەم ئەبو داود: (ثم قبض قبضة من الماء ثم قبض يده ثم مسح رأسه).

*** *** ***

## ٨ـ بَابُ التَّسْمِيَةِ عَلَى كُلِّ حَالٍ، وَعِنْدَ الْوِقَاعِ

١٤١ـ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بنُ عَبْدِاللهِ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ سَالِمِ بنِ أَبِي الْجَعْدِ عَنْ كُرَيْبٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ يَبْلُغُ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ قَالَ: بِسْمِ اللهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَقُضِيَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ لَمْ يَضُرَّهُ».

(باب التسمية على كل حال، وعند الوقاع) ئەمە بابی ئەوەیە کە (بسم الله) گوتن سوننەتە لەسەر هەموو حاڵ و بارێک و لە کاتی جیماعدا، لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە

ئیبن عەباسەوە کە لە پێغەمبەرەوەﷺ هەواڵ ئەدات کە (قال: «لو أن أحدكم إذا أتى أهله قال: بسم الله، اللهم جنبنا الشيطان، وجنب الشيطان ما رزقتنا، فقضي بينهما ولد لم يضره») ئەفەرموێ ئەگەر هەرکەس لە ئێوە کاتێ چووە لای خێزانەکەی بڵێ (بسم الله) ئینجا ئەم نزایە بکات:خوا شەیتانمان لێ دوور بخەرەوەو شەیتان دوور بخەرەوە لەوەی پێمان ئەبەخشی، ئینجا رۆڵەیەکیان پێ ببەخشێ شەیتان زیان ناگەیەنێ بەو منداڵە.

دیارە (بسم الله) گوتن ئەبێ لەسەر شتی حەلاڵ بێت، کەواتە ئەم وتە گشتییە تایبەتە بە کارو کردەوەی حەلاڵەوە، ئینجا لەبەر ئەوەی حەدیس هەیە کە لە کاتی جیماعدا بێ دەنگی سوننەتە، کەواتە پێش ئەوەوکاتێ نیازی ئەوەی کرد (بسم الله) بکات. وە لە کیتابی نیکاحدا چەند باسێکی تر هەیە لەم بارەیەوە هەڵی دەگرین بۆ ئەوێ بە ئیزنی خوا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٢٧١، ٣٢٨٣، ٥١٦٥، ٦٣٨٨، ٧٣٩٦)دا دووبارە بووەتەوە.

***　　***　　***

## ٩ـ بَابُ مَا يَقُولُ عِنْدَ الْخَلاَءِ

١٤٢ـ حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَبْدِالْعَزِيزِ بنِ صُهَيْبٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذَا دَخَلَ الْخَلاَءَ قَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ».

تَابَعَهُ ابْنُ عَرْعَرَةَ عَنْ شُعْبَةَ. وَقَالَ غُنْدَرٌ عَنْ شُعْبَةَ «إِذَا أَتَى الْخَلاَءَ». قَالَ مُوسَى عَنْ حَمَّادٍ: «إِذَا دَخَلَ». وَقَالَ سَعِيدُ بنُ زَيْدٍ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْعَزِيزِ «إِذَا أَرَادَ أَنْ يَدْخُلَ».

(باب ما يقول عند الخلاء) ئەمە بابی ئەوەیە کە موسڵمان بیڵێ کاتێ بچێتە سەر ئاودەست. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسەوە کە (يقول: كان النبيﷺ إذا دخل الخلاء قال: «اللهم إني أعوذ بك من الخبث والخبائث») ئەڵێ عادەتی پێغەمبەرﷺ وا بوو کاتێ بچوایەتە شوێنی خۆ خاڵی کردنەوە ئەیفەرمو: خوایە پەنات پێ دەگرم لە شەڕی شەیتانە نێرو شەیتانە مێیەکان.

ئەم وتەیە بە چەند جۆرێ هاتووە («إذا أتى الخلاء»)، («إذا دخل») کە هەریەک مەبەستە. لێرەشدا دەڵێین لە کاتی خۆ خاڵی کردنەوەدا ئەبێ موسڵمان بێ دەنگ بێت،

کەواتە ئەڵێین کاتێ نیازی کرد ئەوە بڵێ، وەک ئەم ریوایەتەش کە عبدالعزیز ئەیهێنێ و لەوەدا ئەفەرموێ: («إذا أراد أن يدخل») هێندێ چەند رەخنەیەکیان گرتووە لە ئیمامی بوخاری کە لێرەدا ئەم ئەحکامانەی بە رێکی ریز نەکردووە، بەڵام وەڵام دراوەتەوەو دەرخراوە کە کارەکەی ئەم رێکەو با تەماشای شەرحەکان بکرێ یەکێ لەوانە فتح الباری.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٦٣٢٢)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٠ـ بَابُ وَضْعِ الْمَاءِ عِنْدَ الْخَلاَءِ

١٤٣ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هَاشِمُ بنُ الْقَاسِمِ قَالَ: حَدَّثَنَا وَرْقَاءُ عَنْ عُبَيْدِاللهِ ابْنِ أَبِي يَزِيْدٍ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ الْخَلاَءَ فَوَضَعْتُ لَهُ وُضُوءاً. قَالَ مَنْ وَضَعَ هَذَا؟ فَأُخْبِرَ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ فَقِّهْهُ فِي الدِّيْنِ».

(باب وضع الماء عند الخلاء) ئەمە بابی ئەوەیە کە چاکتر ئەوەیە ئاوی تارەت گرتن لەو شوێنەدا بێت کە جێگەی خۆ خاڵی کردنەوەیەو لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە کە (أن النبي ﷺ دخل الخلاء فوضعت له وضوءا. قال من وضع هذا؟ فأخبر، فقال: «اللهم فقهه في الدين») پێغەمبەر ﷺ چووە شوێنی خۆ خاڵی کردنەوەو منیش ئاوم بۆ دانا لەو شوێنەداو فەرموی کێ ئەمەی داناو هەواڵی پێدرا کە من بۆم داناو ئەویش فەرموی: ئەی خوایە زانای بکە لەدینندا.

بوونی ئاو لەو شوێنەدا شتێکی زۆر چاکەو دوورە لەوەی لە نوێژ بچێ. ئەوە بۆ ئەو کاتە بوو، کە ئەم وەسائیلی ئێستا نەبووە، بەڵام ئێستا ئەوە بە هەموو شێوەیەکی ئاسان چۆن مەبەست بێت ئاو لەو شوێنەداو لە شوێنی خۆ شۆریندا بە ئارەزوو هەیەو پێویست نیە کەس ئاو ببا بۆ ئەو شوێنە، لەبەر ئەوە نیعمەتەکانی خوا زۆرتر ئەرژێ بەسەر بەندەکانیدا.

لەم حەدیسە وەرئەگیرێ کە سوننەتە دوعای خێر بۆ هەرکەس چاکەی لەگەڵ بکرێ.

*** *** ***

## ١١ـ بَابُ لاَ تُسْتَقْبَلُ الْقِبْلَةُ بِغَائِطٍ أَوْ بَوْلٍ، إِلاَّ عِنْدَ الْبِنَاءِ: جِدَارٍ أَوْ نَحْوِهِ

١٤٤ـ حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ عَنْ عَطَاءَ بنِ يَزِيْدَ

اللَّيْثِيِّ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِذَا أَتَى الْغَائِطَ فَلاَ يَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ وَلاَ يُوَلِّهَا ظَهْرَهُ، شَرِّقُوا أَوْ غَرِّبُوا».

(باب لا تستقبل القبلة بغائط أو بول، إلا عند البناء: جدار أو نحوه) ئەمە بابی ئەوەیە کە لە کاتی خۆ خاڵی کردنەوە نە روو ئەکرێتە قیبلەو نە پشتی تێ ئەکرێ، مەگەر ئەو کەسە لە بیناو هۆدەیەکدا بێت یان لە پاڵ بەردو دارێکدا. واتە ئەمە بۆ دەشتی سارایە.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو ئەیوبی ئەنساری کە (قال: قال رسول الله ﷺ: «إذا أتى الغائط فلا يستقبل القبلة ولا يولها ظهره، شرقوا أو غربوا») هەرکەس لە ئێوە کاتێ چووە شوێنی خۆ خاڵی کردنەوە نە روو بکاتە قیبلەو نە پشتی تێ بکات، روو بکە رۆژئاواو رۆژهەڵات. ئینجا رەخنە گیراوە لە ئیمامی بوخاری کە حەدیسەکە شێوەی گشتی نیشان ئەدا چۆن لە ترجمەکەدا تایبەتی کرد بە دەشت ساراوە؟ لە وەڵامدا چەند شتێک گوتراوە یەکێ لەمانە ئەمەیە کە روو کردن یان پشت تێ کردن لە دەشت و سارادا بەدی دێت، لەپەنای دیوار یان شتێ لە رووودا پێی ئەگوترێ روو کردنە ئەو شتە نەک روو یان پشت کردن. وە یەکێ تر لەو وەڵامانە ئەمەیە حەدیسی ئیبن عمر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پشت کردنە قیبلە لە پاڵی دیوار قەیناکات، وە حەدیسی جابر لەسەر دروستی روو کردن لە بیناو پاڵی شتێکدا، کەواتە رەخنە ناگیرێ لەئیمامی بوخاری، هێندێ ئەفەرمون مطلقا دروست نی یەو هێندێ ئەفەرمون مطلقا دروستەو حەرام نی یە. لە نێوان ئەم رایانەدا کۆڕو جەماوەر بە پێی مەزهەبی شافیعی ئەوانەیە کە میانەو ناوەراستەو خوا باش ئەزانێ و دیارە لەسەر هەموو بارێ ئەبێ رێز لە قیبلە بگیرێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٣٩٤)دا دووبارە بووەتەوە.

***  ***  ***

## ١٢ـ بَابُ مَنْ تَبَرَّزَ عَلَى لَبِنَتَيْنِ

١٤٥ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ عَنْ عَمِّهِ وَاسِعِ بْنِ حَبَّانَ عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِنَّ نَاسًا يَقُولُونَ إِذَا قَعَدْتَ عَلَى حَاجَتِكَ فَلاَ تَسْتَقْبِلِ الْقِبْلَةَ وَلاَ بَيْتَ الْمَقْدِسِ. فَقَالَ عَبْدُاللهِ بْنُ عُمَرَ: لَقَدِ ارْتَقَيْتُ يَوْمًا عَلَى ظَهْرِ بَيْتٍ لَنَا، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَلَى لَبِنَتَيْنِ مُسْتَقْبِلاً

بَيْتَ الْمَقْدِسِ لِحَاجَتِهِ. وَقَالَ: لَعَلَّكَ مِنَ الَّذِيْنَ يُصَلُّونَ عَلَى أَوْرَاكِهِمْ، فَقُلْتُ لاَ أَدْرِي وَاللهِ.

وَقَالَ مَالِكٌ: يَعْنِي الَّذِي يُصَلِّي وَلاَ يَرْتَفِعُ عَنِ الأَرْضِ، يَسْجُدُ وَهُوَ لاَصِقٌ بِالأَرْضِ.

(باب من تبرز على لبنتين) ئەمە بابی ئەوەیە کەسێک خۆی خاڵی بکاتەوە بەسەر دوو تەختەوە.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن عمرەوە کە (أنه كان يقول: إن ناسا يقولون إذا قعدت على حاجتك فلا تستقبل القبلة ولا بيت المقدس) ئەفەرموێ: خەڵکانێ ئەیانگوت کاتێ کە دانیشتی بەسەر پێش ئاوتەوە نە روو بکەرەوە قیبلەو نە روو بکەرە بیت المقدس. (فقال عبدالله بن عمر: لقد ارتقيت يوما على ظهر بيت لنا، فرأيت رسول اللهﷺ على لبنتين مستقبلا بيت المقدس لحاجته) ئیبن عومەر ئەفەرموێ: رۆژێکیا چوومە سەر بانی ماڵمان بینیم کە پێغەمبەرﷺ لەسەر دوو خشت دانیشتووەو رووی لە بیت المقدسە لە کاتی خۆ خاڵی کردنەوەدا (وقال: لعلك من الذين يصلون على أوراكهم، فقلت لا أدري والله. وقال مالك: يعني الذي يصلي ولا يرتفع عن الأرض، يسجد وهو لاصق بالأرض).

پاڵفتەی ئەم حەدیسە ئەمەیە کە پێغەمبەری ئازیزﷺ جڵەوگیریی کردووە لە کاتی چوونە سە ئاو رووبکرێتە بیت المقدس لەگەڵ ئەوەدا ئیبن و عومەر -خوایان لێ رازی بێت- دەفەرموێت: رۆژێک چوومە سەر بانی ماڵێک کە بوومان دیتم پێغەمبەرﷺ لەسەر دوو خشت بوو بەرەو بیت المقدس لە کاتی خۆ خاڵی کردنەوەدا. ئینجا لە ریوایەتی سەحیحدا هاتووە کە لە پەنای شتێکدا بووە، ئینجا ئیبن و عومەر دەفەرموێ بە رواییەکە کە واسعی ناو بوو وا دەرئەکەوێ تۆ لەو کەسانەی کە لە سوژدەدا لەسەر لاتریزەکانت دادەنیشی و سکت دەنووسێنی بە خۆتەوە؟ گوتی: بە خوا نازانم. جا لەم حەدیسەدا خیلاف هەیە لە بارەی پەیوەندی ئەم پرسیارو وەڵامە کە لە بارەی شێوەی سوژدە بردنەوە هاتووە، پەیوەندی بە بابەکەوە ئەوەیە کە باسی شێوەی سەر ئاو دەست باس دەکات. لای زانایان پەیوەندییەکە روون نییە، وە ئەوەی لە سەرەنجامی لێکۆڵینەوە دەرکەوت ئەمەیە: هەرچۆنێ لە پەنای شتێکدا قەیناکات رووکردنە بیت المقدس هەروەها لە کاتی سوژدە بردنیشدا کە بەو شێوە ببرێ عەورەت دەکەوێتە نێوان سک و رانەکان و دەکەوێتە پەناوە. ئەمە بوو خولاسەی ماناو مەبەستی ئەو حەدیسەو بەهێز تر تەماشا دەکرێ لە راکانی تر.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٤٨، ١٤٩، ٣١٠٢)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٣- بَابُ خُرُوجِ النِّسَاءِ إِلَى الْبَرَازِ

١٤٦- حَدَّثَنَا يَحْيَى بنِ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ قَالَ: حَدَّثَنِي عُقَيْلٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ كُنَّ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ إِذَا تَبَرَّزْنَ إِلَى الْمَنَاصِعِ -وَهُوَ صَعِيدٌ أَفْيَحُ- فَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: احْجُبْ نِسَاءَكَ. فَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَفْعَلُ. فَخَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي عِشَاءً، وَكَانَتِ امْرَأَةً طَوِيلَةً، فَنَادَاهَا عُمَرُ: أَلاَ قَدْ عَرَفْنَاكِ يَا سَوْدَةُ. حِرْصًا عَلَى أَنْ يَنْزِلَ الْحِجَابُ. فَأَنْزَلَ اللهُ آيَةَ الْحِجَابِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٤٧، ٤٧٩٥، ٥٢٣٧، ٦٢٤٠)دا دووبارە بووەتەوە.

١٤٧- حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ قَالَ حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ عَنْ هِشَامِ بنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَدْ أُذِنَ أَنْ تَخْرُجْنَ فِي حَاجَتِكُنَّ» قَالَ هِشَامٌ: يَعْنِي الْبَرَازَ.

(باب خروج النساء إلى البراز) ئەمە بابی ئەوە کە ئافرەتان لە ماڵی خۆیاندا دەرنەچوون بۆ خۆ خاڵی کردنەوە.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لەدایکی ئیمانداران عائشەوە -خوای لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: (أن أزواج النبي ﷺ كن يخرجن بالليل إذا تبرزن إلى المناصع -وهو صعيد أفيح-) دایکانی ئیمانداران لە شەودا دەرئەچوون بۆ ئاو دەست ئەچوون بۆ شوێنێ دیاریی لە تەرەف بەقیعەوە کە فراوان بوو بۆ ئەو مەبەستە (فكان عمر يقول للنبي ﷺ: احجب نساءك. فلم يكن رسول الله ﷺ يفعل) وە عومەر عەرزی پێغەمبەری کرد ﷺ کە ژنەکانت بخەرە حیجاب با دەرنەچن لەماڵ و ئەویش نەینەکرد (فخرجت سودة بن زمعة زوج النبي ﷺ ليلة من الليالي عشاء، وكانت امرأة طويلة، فناداها عمر: ألا قد عرفناك يا سودة. حرصا على أن ينزل الحجاب. فأنزل الله آية الحجاب) ئینجا شەوێ لە شەوان لەعیشادا سودەی کچی زەمعە حەرەمی پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ ئەو مەبەستە، کە سودە ئافرەتێکی کەڵەگەت

بوو، ئینجا عومەر بانگی کرد ئەی سودە بێگومان تۆمان ناسی و مەبەستی ئەوە بوو کە حیجاب پێویست بکرێ لەسەریان، ئینجا خوا ئایەتی حیجابی نارده خوارەوە، واتە کارێکی وا بکەن کە لەش و قەبارەشیان دەرنەکەوێ و مەبەستی فاروق ئەوەبوو کە لە ماڵی خۆیاندا شوێنێ دروست بکەن بۆ ئەو پێویستی خۆیانەو لە پاشان دروست کراو ئەو ئیقتراحی ئەوە یەکێ بوو لە موافقەتەکانی -خوای لێ رازی بێت- کە لە پازدە شازدە جاردا بە پێی قسەکەی ئەو ئایەت هاتە خوارەوە.

ئینجا دێتە سەر ئەم حەدیسە کە لەم بابەدا هاتووەو ئەیهێنێ لە دایکی ئیمانداران عائشەوە -خوای لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: (قال: «قد أذن أن تخرجن في حاجتكن» قال هشام: يعني البراز) ئیزن درا کە دایکەکانی ئیمانداران کە لە ماڵ دەرچن بۆ جێ بەجێ کردنی دەست بە ئاو گەیاندن لەم حەدیسەشەوە وەرئەگیرێ کە ئافرەتان بۆیان هەیە کاروکردەوەیەک بکەن بۆ بەرژەوەندی خۆیان، وە بچووک بۆی هەیە بکۆڵێتەوە لەگەڵ گەورە کە زانی راکەی خۆی رێک و راست ترەو دروستەو رەوایە ئەولاد ئامۆژگاری دایکی خۆی بکات، هەروەها پایەو پلەی بەرزی فاروق وەرئەگیرێ -خوای لێ رازی بێت-.

*** *** ***

## ١٤ـ بَابُ التَّبَرُّزِ فِي الْبُيُوتِ

١٤٨ـ حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بنُ الْمُنْذِرِ قَالَ: حَدَّثَنا أَنَسُ بنُ عِيَاضٍ عَنْ عُبَيْدِاللهِ عَنْ مُحَمَّدِ ابْنِ يَحْيَى بنِ حَبَّانَ عَنْ وَاسِعِ بنِ حَبَّانَ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عُمَرَ قَالَ: ارْتَقَيْتُ فَوْقَ ظَهْرِ بَيْتِ حَفْصَةَ لِبَعْضِ حَاجَتِي، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقْضِي حَاجَتَهُ مُسْتَدْبِرَ الْقِبْلَةِ مُسْتَقْبِلَ الشَّامِ.

١٤٩ـ حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنا يَزِيدُ بنُ هَارُونَ قَالَ أَخْبَرَنَا يَحْيَى عَنْ مُحَمَّدِ بنِ يَحْيَى بنَ حَبَّانَ أَنَّ عَمَّهُ وَاسِعَ بنِ حَبَّانَ أَخْبَرَهُ أَنَّ عَبْدَاللهِ بنِ عُمَرَ أَخْبَرَهُ لَقَدْ ظَهَرْتُ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى ظَهْرِ بَيْتِنَا فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَاعِدًا عَلَى لَبِنَتَيْنِ مُسْتَقْبِلَ بَيْتِ الْمَقْدِسِ.

(باب التبرز في البيوت) ئەمە بابی ئەوەیە کە لە ماڵدا خۆ خاڵی کردنەوەو تارەت گرتن چاک و راستە.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن عومەرەوە کە (قال: ارتقیت فوق ظهر بیت حفصة لبعض حاجتي، فرأیت رسول اللهﷺ یقضي حاجته مستدبر القبلة مستقبل الشام) ئەفەرموێ: چوومە سەربانی حەفصە بۆ هێندێ پێویستیم لەوێدا پێغەمبەرم دی پشتی کردبووە قیبلەو بەرەو شام. ئیمامی بوخاری تا دەست نیشان بکات بەوەی دەرچوونی ئافرەتی بۆ خاڵی کردنەوە درێژەی ئەکێشاو بەڵکو لە پاش ئەوە ئەدەبخانە لە ماڵەکاندا دروست کراو پێویست نەما بە دەرچوون.

ئینجا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئیبن عومەرەوە کە (لقد ظهرت ذات یوم علی ظهر بیتنا فرأیت رسول اللهﷺ قاعدا علی لبنتین مستقبل بیت المقدس) ئەم فەرمودەی ئیبن عومەرەوە لەگەڵ فەرمودەی پێشوودا ئەگونجێ بەمەی ئەو کارو دیتنە دووبارە بوویێتەوە، وە لە مەدینەدا روو کردنە بیت المقدس ئەبێ بە پشت کردنە قیبلەو رووکردنە شام مەبەست بیت المقدسە، هێندێ جار شام ئەگوترێ و هێندێ جار بیت المقدس. ئەو ماڵە ماڵی حەزرەتی حفصە بووە، هەروەک ماڵی خۆی وایە، چونکە خوشکی بووە، لە پاشان بە میراتیش مایەوە بۆی، چونکە خوشکی باوک و دایکی بوو بۆی. بە هەر حاڵ وەک چەند جار گوتمان ئیمامی بوخاری هەر حەدیسێکی دەست کەوتبێ لە رێگەی خۆیەوە هێناویەتی ئیتر باوەک تیکراریش وابێ.

***　　***　　***

## ١٥ـ بَابُ الإِسْتِنْجَاءِ بِالْمَاءِ

١٥٠ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيْدِ هِشَامُ بنُ عَبْدِالْمَلِكِ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي مَعَاذَ -وَاسْمُهُ عَطَاءُ بنُ أَبِي مَيْمُونَةَ- قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بنَ مَالِكٍ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذَا أَخْرَجَ لِحَاجَتِهِ أَجِيءُ أَنَا وَغُلَامٌ مَعَنَا إِدَاوَةٌ مِنْ مَاءٍ. يَعْنِي يَسْتَنْجِي بِهِ.

(باب الإستنجاء بالماء) ئەمە بابی خۆ پاک کردنەوەیە لە پاش خۆ خاڵی کردنەوە بە ئاو، وە لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە (یقول: کان النبيﷺ إذا أخرج لحاجته أجئ أنا و غلام معنا إداوة من ماء. یعني یستنجي به) پێغەمبەرﷺ ئەچووە شوێنی خۆ خاڵی کردنەوەو من و غولامێک ئاومان بۆ ئەبرد لەگەڵ عەسایەکدا کە حربەی بەسەرەوە بوو پاشای حەبەشە بۆی ناردبوو، ئیمامی بوخاری ئەمە ئەکات بە دەلیل

لەسەر ئەوەی کە شۆرینی جێگەی میز دروستەو خزمەت کردن بە حورو بەندە رەوایە تا فێری تەوازع ببن.

*** *** ***

## ١٦ـ بَابُ مَنْ حَمَلَ مَعَهُ الْمَاءَ لِطُهُورِهِ

وَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: أَلَيْسَ فِيكُمْ صَاحِبُ النَّعْلَيْنِ وَالطَّهُورِ وَالْوِسَادِ.

١٥١ـ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بنُ حَرْبٍ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي مُعَاذٍ -وَهُوَ عَطَاءُ بنُ أَبِي مَيْمُونَةَ- قَالَ سَمِعْتُ أَنَسًا يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا خَرَجَ لِحَاجَتِهِ تَبِعْتُهُ أَنَا وَغُلَامٌ مِنَّا إِدَاوَةٌ مِنْ مَاءٍ.

(باب من حمل معه الماء لطهوره) ئەمە بابی کەسێکە کە ئاوی بۆ بهێنرێ بۆ دەست نوێژی.

لەم بارەیەوە (وقال أبو الدرداء: أليس فيكم صاحب النعلين و الطهور والوساد) ئەبو دەرداء کە قازی دیمەشق بوو لە خیلافەتی حەزرەتی عوسماندا -خوایان لێ رازی بێت- ئایا خاوەنی نەعلەکان و ئاوی دەست نوێژو خاوەنی سەرینەکەی پێغەمبەرتان لا نییە، واتە ئیبن مەسعود کە خزمەت چی پێغەمبەر بوو ﷺ، واتە پرسیار لەو بکەن کە شارەزا ترە. مەبەست لەم تعلیقە ئەمەیە بیکا بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئاو هێنان و هەڵگرتن بۆ دەست نوێژ شتێکی شەرعییە. ئینجا لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عطای کوری مەیمونەوە ئەویش لە ئەنەسەوە کە (قال سمعت أنسا يقول: كان رسول الله ﷺ إذا خرج لحاجته تبعته أنا و غلام منا إداوة من ماء) عەطا ئەڵێ گوێم لە ئەنەس بوو ئەیگوت: پێغەمبەر ﷺ کاتێ ئەچوو بۆ سەر ئاو دەست من و کوڕێکی گەنج لە ئێمە واتە ئەنسار شوێنی ئەکەوتین و پێمان بوو زەرفێکی پڕ لە ئاو.

*** *** ***

## ١٧ـ بَابُ حَمْلِ الْعَنَزَةِ مَعَ الْمَاءِ فِي الاسْتِنْجَاءِ

١٥٢ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ بَشَّارٍ قَالَ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ جَعْفَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَطَاءِ بنِ أَبِي مَيْمُونَةَ، سَمِعَ أَنَسَ بنَ مَالِكٍ يَقُولُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدْخُلُ الْخَلَاءَ، فَأَحْمِلُ

أَنَا وَغُلَامٌ إِدَاوَةً مِنْ مَاءٍ وَعَنَزَةٍ، يَسْتَنْجِي بِالْمَاءِ.

تَابَعَهُ النَّضْرُ وَشَاذَانُ عَنْ شُعْبَةَ.

الْعَنَزَةُ: عَصًا عَلَيْهِ زَجٌّ.

(باب حمل العنزة مع الماء في الاستنجاء) ئەمە بابی هەڵگرتنی عەسایەكی كورتە كە ئاسنێك بەسەرەكەیەوە بێت لەگەڵ ئاودا بۆ تارەت گرتن.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عطاوە كە (سمع أنس بن مالك يقول: كان رسول اللهﷺ يدخل الخلاء، فأحمل أنا وغلام إداوة من ماء و عنزة، يستنجي بالماء) كە بیستی لە ئەنەس كە ئەیفەرموو: پێغەمبەرﷺ ئەچووە شوێنی خۆ خاڵی كردنەوەو من و گەنجێك لە ئێمە زەرفێكی پڕ لە ئاو و عەنەزەیەكمان هەڵ ئەگرت كە بەو ئاوە خۆی پاك بكاتەوە. (تابعة النضر و شاذان عن شعبة) لە پاش محمدی كوڕی جعفر نضرو محمدی كوڕی شازان ئەو حەدیسەیان هێناوە. چەند جارێك گرتمان ئیمامی بوخاری هەر حەدیسێك یان ریوایەتێكی دەست كەوتبێ لە رێگەی خۆیەوە هێناویەتی بۆ زیادە دڵنایی كردن لەسەر راستی ئەو حەدیسە لەبەر ئەوە گوێی نەبووە لە هێنانێ تیكرارو دووبارە كردنەوە یان جیاوازی پێش و پاش لە نێوان وشەكانیدا، ئینجا ئەفەرموێ: (العنزة: عصا عليه زج) عەنەزە عەسایەكە سەرە رمێكی پێوەبێ.

***　***　***

## ١٨ـ بَابُ النَّهْيِ عَنِ الاسْتِنْجَاءِ بِالْيَمِينِ

١٥٣ـ حَدَّثَنَا مُعَاذُ بنُ فُضَالَةَ قَالَ حَدَّثَنَا هِشَامٌ هُوَ الدَّسْتَوَائِيُّ عَنْ يَحْيَى بنِ أَبِي كَثِيرٍ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ أَبِي قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ «إِذَا شَرِبَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ، وَإِذَا أَتَى الْخَلاَءَ فَلاَ يَمَسَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَتَمَسَّحْ بِيَمِينِهِ».

(باب النهي عن الاستنجاء باليمين) ئەمە بابی جڵەوگیرییە لە خۆ پاك كردنەوە بە دەستی راست.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو قتادەوە كە (قال: قال رسول اللهﷺ «إذا شرب أحدكم فلا يتنفس في الإناء، و إذا أتى الخلاء فلا يمس ذكره بيمينه، ولا يتمسح بيمينه»)

کاتێ هەرکەس لە ئێوە ئاوی خواردەوە فوو نەکاتە ناو ئەو شتەی کە ئاوی تیا ئەخواتەوە، وە کاتێ چووە شوێنی خۆ خاڵی کردنەوە بە دەستی راستی تارەت نەگرێ و بە دەستی راستی نەدات لە عەورەتی.

کۆڕو جەماوەر لەسەر ئەوەیە کە ئەم جڵەوگیرییەیە بۆ قەدەغە کردن نییە. واتە حەرام نییە بە دەستی راست کردنی ئەوانەی کە گوتویەتی، ئەهلی زاهیر لەسەر ئەوەن حەرامە. وە مەسەلەی فوو نەکردن زۆر پێویست و شیرینە، چونکە ئەو خوراوەیە قیزەون ئەکات بۆ خەڵکی ترو لەوانەیە بە هەناسەوە چەند میکرۆب لە دەم دەربچێ و خەڵکی تر دووچاری نەخۆشی بکات. ئەمەیە ئاداب و ئەدەبی شیرینی خواردن و خواردنەوەو خۆ پاک کردنەوەو سوپاس بۆ خوای میهرەبان کە ئەم شەریعەتەی خەڵاتی بەندەکانی کردووە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٥٤، ٥٦٣٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ١٩ـ بَابُ لاَ يُمْسِكُ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ إِذَا بَالَ

١٥٤ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنِي الأَوْزَاعِيُّ عَنْ يَحْيَى بنُ أَبِي كَثِيرٍ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ أَبِي قَتَادَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا بَالَ أَحَدُكُمْ فَلاَ يَأْخُذَنَّ ذَكَرَهُ بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَسْتَنْجِي بِيَمِينِهِ، وَلاَ يَتَنَفَّسْ فِي الإِنَاءِ».

باب لا يمسك ذكره بيمينه إذا بال

١٥٤ـ حدثنا محمد بن يوسف قال: حدثني الأوزاعي عن يحيى بن أبي كثير عن عبدالله بن أبي قتادة عن أبيه عن النبي ﷺ قال: «إذا بال أحدكم فلا يأخذن ذكره بيمينه، ولا يستنجي بيمينه، ولا يتنفس في الإناء».

با هەرکام لە ئێوە میزی کرد بە دەستی راستی زەکەری نەگرێ وە بە دەستی راستی خۆی پاک نەکاتەوە (بە ئاو یان بە بەرد)، ئینجا ئەگەر ئاوی خواردەوە با هەناسەی پیادا نەدات.

*** *** ***

## ٢٠ـ بَابُ الاسْتِنْجَاءِ بِالْحِجَارَةِ

١٥٥ـ حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْمَكِّيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ يَحْيَى بْنِ سَعِيدِ بْنِ عَمْرٍو الْمَكِّيُّ عَنْ جَدِّهِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: اتَّبَعْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَخَرَجَ لِحَاجَتِهِ، فَكَانَ لاَ يَلْتَفِتُ، فَدَنَوْتُ مِنْهُ فَقَالَ: ابْغِنِي أَحْجَارًا أَسْتَنْفِضْ بِهَا -أَوْ نَحْوَهُ- وَلاَ تَأْتِنِي بِعَظْمٍ وَلاَ رَوْثٍ. فَأَتَيْتُهُ بِأَحْجَارٍ بِطَرَفِ ثِيَابِي فَوَضَعْتُهَا إِلَى جَنْبِهِ وَأَعْرَضْتُ عَنْهُ، فَلَمَّا قَضَى أَتْبَعَهُ بِهِنَّ.

(باب الاستنجاء بالحجارة) ئەمە بابی خۆ پاک کردنەوەیە بە بەرد.

لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (قال: اتبعت النبيﷺ و خرج لحاجته، فكان لا يلتفت، فدنوت منه فقال: ابغني أحجارا أستنفض بها -أو نحوه- و لا تأتني بعظم ولا روث. فأتيته بأحجار بطرف ثيابي فوضعتها إلى جنبه و أعرضت عنه) ئەفەرموێ شوێنی پێغەمبەرﷺ کەوتم و باوی وابوو لای نەئەکردەوە بەم لاولادا، ئینجا نزیک کەوتمەوە لێیەوە، ڕۆیشت و پێویستی خۆی دەرکرد، ئینجا فەرمووی پێم: چەند بەردێکم بۆ بێنە کە خۆمیان پێ پاک بکەمەوەو ئێسکم بۆ نەهێنی و تەپاڵەو شتی پیسم بۆ نەهێنی.

جلەوگیریی بە تایبەتی لە ئێسک و تەپاڵە لەبەر ئەوەیە خۆراکی جنۆکەیە، کەواتە خۆراکی ئادەمی باشتر ئەبێ جلەوگیریی لێ بکرێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٣٨٦٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢١ـ بَابُ لاَ يُسْتَنْجَى بِرَوْثٍ

١٥٦ـ حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: لَيْسَ أَبُوعُبَيْدَةَ ذَكَرَهُ، وَلَكِنْ عَبْدُالرَّحْمَنِ بْنُ الأَسْوَدِ عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ سَمِعَ عَبْدَاللهِ يَقُولُ: أَتَى النَّبِيُّ ﷺ الْغَائِطَ فَأَمَرَنِي أَنْ آتِيَهُ بِثَلاَثَةِ أَحْجَارٍ، فَوَجَدْتُ حَجَرَيْنِ وَالْتَمَسْتُ الثَّالِثَ فَلَمْ أَجِدْهُ، فَأَخَذْتُ رَوْثَةً فَأَتَيْتُهُ بِهَا، فَأَخَذَ الْحَجَرَيْنِ وَأَلْقَى الرَّوْثَةَ وَقَالَ: هَذَا رِكْسٌ.

وَقَالَ إِبْرَاهِيمُ بْنُ يُوسُفَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ: حَدَّثَنِي عَبْدُالرَّحْمَنِ.

(باب لا يستنجي بروث) ئەمە بابی ئەوەیە کە خۆ پاک ناکرێتەوە بە تەپاڵە.

لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ کە عبدالرحمنی کوڕی ئەسوەد لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوەو ئەفەرموێ: بیستم لە عبداللەی کوڕی مسعود فەرموی: (أتى النبيﷺ الغائط فأمرني أن آتيه بثلاثة أحجار، فوجدت حجرين والتمست الثالث فلم أجده، فأخذت روثة فأتيته بها، فأخذ الحجرين و ألقى الروثة وقال: هذا ركس) پێغەمبەرﷺ لەسەر ئاو هاتە دەرەوەو ئەمری پێ کردم کە سێ بەردی بۆ بهێنم، دوو بەردم پەیدا کردو گەڕام بۆ سێیەم و دەستم نەکەوت و تەپاڵەیەکم بۆ هێنا لە جیاتی بەردی سێیەم. دوو بەردەکەی لێ گرتم و تەپاڵەکەی فڕێداو فەرمووی: ئەوە ڕەدە.

*** *** ***

٢٢ـ بَابُ الْوُضُوءِ مَرَّةً مَرَّةً

١٥٧ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفيَانُ عَنْ زَيْدِ بنِ أَسْلَمَ عَنْ عَطَاءِ بنِ يَسَارٍ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: تَوَضَّأَ النَّبِيُّﷺ مَرَّةً مَرَّةً.

(باب الوضوء مرة مرة) ئەمە بابی ئەوەیە دەست نوێژ بە یەک جارو یەک مشت ئاو ئەبێ. لەم بارەیەوە حەدیسی ئیبن و عەباس ئەهێنێ کە ئەفەرموێ: (توضأ النبيﷺ مرة مرة) پێغەمبەرﷺ دەست نوێژی گرت بە یەک جارو یەک مشت. ئەم حەدیسە پێش کەوت لە بابی شۆرینی دەم و چاو و هەردوو دەست بە یەک مشت.

*** *** ***

٢٣ـ بَابُ الْوُضُوءِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ

١٥٨ـ حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بنُ عِيسَى قَالَ: حَدَّثَنَا يُونُسُ بنُ مُحَمَّدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا فُلَيْحُ بنُ سُلَيْمَانَ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ أَبِي بَكْرِ بنِ عَمْرِو بنِ حَزْمٍ عَنْ عَبَّادِ بنِ تَمِيمٍ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ زَيْدٍ أَنَّ النَّبِيَّﷺ تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ.

(باب الوضوء مرتين مرتين) ئینجا دێتە سەر بابی دەست نوێژگرتن بە دوو دوو، وە لەم بارەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عبداللەی کوڕی زەیدەوە کە ئەفەرموێ: (أن النبيﷺ توضأ مرتين مرتين) کە پێغەمبەرﷺ دەست نوێژی گرت بە دوو جار.

*** *** ***

## ٢٤ـ بَابُ الْوضُوءِ ثَلاثًا ثَلاثًا

١٥٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدُالْعَزِيزِ بنِ عَبْدِاللهِ الأُوَيْسِيُّ قَالَ: حَدَّثَنِي إِبْرَاهِيمُ بنُ سَعْدٍ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ أَنَّ عطَاءَ بنَ يَزِيدٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ حُمْرَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى عُثْمَانَ بنَ عفَّانَ دعَا بِإِنَاءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلاثَ مِرَارٍ فَغَسَلَهُمَا ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الإِنَاءِ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثًا وَيَدَيْهِ إِلَى الْمرفَقَيْنِ ثَلاثَ مِرَارٍ، [ثُمَّ] مَسَحَ بِرَأْسِهِ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلاثَ مِرَارٍ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٦٠، ١٦٤، ١٩٣٤، ٦٤٣٣)دا دووبارە بووەتەوە.

١٦٠ـ وَعَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: قَالَ صَالِحُ بنُ كيْسَانَ قَالَ ابْنُ شِهَابٍ، وَلَكِنْ عُرْوَةَ يَحَدِّثُ عَنْ حُمْرَانَ، فَلَمَّا تَوَضَّأَ عُثْمَانُ قَالَ: أَلاَ أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا لَوْلاَ آيَةٌ مَا حَدَّثْتُكُمُوهُ؟ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ «لاَ يَتَوَضَّأُ رَجُلٌ يُحْسِنُ وُضُوءَهُ وَيُصَلِّي الصَّلاَةَ إِلاَّ غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الصَّلاَةِ حَتَّى يُصَلِّيهَا».

(باب الوضوء ثلاثا ثلاثا) لەم بابەدا ئەم حەدیسە ئەهێنێ کە (أنه رأى عثمان بن عفان دعا بإناء فأفرغ على كفيه ثلاث مرار فغسلهما ثم أدخل يمينه في الإناء فمضمض واستنشق، ثم غسل وجهه ثلاثا ويديه إلى المرفقين ثلاث مرار، [ثم] مسح برأسه ثم غسل رجليه ثلاث مرار إلى الكعبين) حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففان ئاوی هێناو کردی بە دەستیدا سێ جارو شۆردی، وە لە پاشدا بە دەستی ڕاستی ئاوی ڕادا لە دەم و لوتی و دەم و چاوی سێ جار شۆردو دەستی شۆرد تا ئانیشکی سێ جار لە پاشدا مەسحی سەری کرد لە پاشدا قاچی شۆرد تا پاژنەی سێ جار. ئینجا ئایا بۆ مەسحیش سێ سێ چاکە ئەوە شتێکی خیلافی‌یەو ئەبو داود لەم ڕیوایەتی عسمانەدا ئەوە ئەهێنێ کە مەسحەکەش سێ سێ بووە. (ثم قال: قال رسول الله ﷺ: «من توضأ نحو وضوئي هذا، ثم صلى ركعتين لا يحدث فيهما نفسه، غفر له ما تقدم من ذنبه»)

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە عسمانەوە کە (فلما توضأ عثمان قال: ألا أحدثكم

حديثا لولا آية ما حدثتكموه؟ سمعت النبي ﷺ «لا يتوضأ رجل يحسن وضوءه ويصلي الصلاة إلا غفر له ما بينه و بين الصلاة حتى يصليها» كاتێ دەستی نوێژی شۆرد فەرمووی: ئاگادارین حەدیسێکتان بۆ باس ئەکەم ئەگەر لە ترسی ئایەتێک نەبوایە بۆم باس نەئەکردن، حەدیسەکەش ئەمەیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکەس دەست نوێژێکی رێک و پێک بگرێ ئینجا نوێژێک بەجێ بهێنێ و هەتا نوێژێکی تر هەر گوناهێک بکات لەو بەینەدا خوا لێی ئەبورێ. وە ئەو ئایەتەی کە مەترسی لێ ئەکرد، ئەم ئایەتە بوو کە ئەفەرموێ: ﴿إن الذين يكتمون ما أنزلنا من البينات والهدى﴾.

*** *** ***

## ٢٥ـ بَابُ الاسْتِنْثَارِ فِي الْوُضُوءِ

ذَكَرَهُ عُثْمَانُ وَعَبْدُاللهِ بنُ زَيْدٍ وَابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

١٦١ـ حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ أَخْبَرَنَا عَبْدُاللهِ قَالَ أَخْبَرَنَا يُونُسُ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو إِدْرِيسَ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَلْيَسْتَنْثِرْ، وَمَنْ اسْتَجْمَرَ فَلْيُوتِرْ».

(باب الاستنثار في الوضوء) ئەمە بابی مش کردنە لە کاتی دەست نوێژدا. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ کە ئەبو هورەیرە ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ: (أنه قال: «من توضأ فليستنثر، ومن استجمر فليوتر») ئەفەرموێ: هەرکەس دەست نوێژ ئەگرێ با مش بکات ئیتر دەستیشی لەگەڵ بێت یان هەر بە مش کردن بۆ ئەوەی ناو لوتی پاک بکاتەوە. وە ئایا واجبە وەک رواڵەتی ئەمرەکە نیشانی ئەداو هێندێ لە زانایانی لەسەرە یان ئەمرەکە بۆ سوننەتە وەک کۆڕو جەماوەری لەسەرە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (١٦٢)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٢٦ـ بَابُ الاسْتِجْمَارِ وِتْرًا

١٦٢ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ أَبِي الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَجْعَلْ فِي أَنْفِهِ ثُمَّ لِيَنْثُرْ. وَمَنْ اسْتَجْمَرَ

فَلْيُوتِرْ. وَإِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ فَلْيَغْسِلْ يَدَهُ قَبْلَ أَنْ يُدْخِلَهَا فِي وَضُوئِهِ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ لاَ يَدْرِي أَيْنَ بَاتَتْ يَدُهُ».

(باب الاستجمار وترا) ئەمە بابی خۆ پاک کردنەوەیە بە تاک. واتە سوننەتە تاک بێت وەک بە دەقی لەم حەدیسەدا ئەیفەرموێ کە ئەبو هورەیرە ئەیهێنێ کە (أن رسول الله ﷺ قال: «إذا توضأ أحدكم فليجعل في أنفه ثم لينثر. ومن استجمر فليوتر. وإذا استيقظ أحدكم من نومه فليغسل يده قبل أن يدخلها في وضوئه، فإن أحدكم لا يدري أين باتت يده») هەرکام لە ئێوە دەست نوێژ بگرێ با ئاو بکاتە ناو لوتی و ئینجا مش بکاتەوە، هەرکەس بە بەرد خۆی پاک کردەوە با تاک بێت. کاتێ لە خەو هەستا با دەستی بشۆرێ پێش ئەوەی بیخاتە ناو ئاوی دەست نوێژەکەی، چونکە هەرکەس لە ئێوە نازانێ لە خەودا دەستی لە کوێ بووەو شەو چی بەسەر هاتووە. واتە ئیحتیمالی هەیە دەستی پیس بووبێ. ئەو دەست تێ خستنە بە پێی ئەو کاتانە بووە کە ئەم بەلوعانە نەبوون، ئەگینا ئێستا ئەو ئیحتیمالی پیس بوونە نی‌یە یان ئەگەر کەسێ دەستیشی پاک بێت لەناو دەست کێشدا بێ ئەو ئیحتیمالی پیس بوونەی نی‌یە بە هەر حاڵ پاک و تەمیزی پیشەی موسڵمانانە، کەواتە ئەگەر دەستیشی پاک بێت هەر شۆردنی چاکترە، لە بارەی دەست شۆردنەوە ئیمامی شافیعی ئەفەرموێ: موسڵمانان لەو چەرخەدا تارەتیان ئەگرت بەڵام وڵاتەکەیان گەرم بوو عەرەقیان ئەکرد لە خەودا ئیحتیمالی بووە دەستیان بکەوێ لە عەورەتیان یان لە پیزوکی لە لەشیاندا یان خوێن کێچ و ئەسپێ یان هەر شتێکی تر، کەواتە زۆر بەجێ بووە. دەستی کەسێ لە خەو هەستابێ بە پیس دانانرێ لەگەڵ ئەو هەموو ئیحتیمالەدا.

*** *** ***

## ٢٧ـ بَابُ غَسْلِ الرِّجْلَيْنِ، وَلاَ يَمْسَحُ عَلَى الْقَدَمَيْنِ

١٦٣ـ حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو عَوَانَةَ عَنْ أَبِي بِشْرٍ عَنْ يُوسُفَ بْنِ مَاهِكَ عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرٍو قَالَ: تَخَلَّفَ النَّبِيُّ ﷺ عَنَّا فِي سَفْرَةٍ سَافَرْنَاهَا، فَأَدْرَكَنَا وَقَدْ أَرْهَقَنَا الْعَصْرُ، فَجَعَلْنَا نَتَوَضَّأُ وَنَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ» مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا.

(باب غسل الرجلين، ولا يمسح على القدمين) ئەمە بابی ئەوەیە کەسێ هەردوو پێی بشۆرێ و مەسحیان نەکات. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عبداللەی کوڕی عەمرەوە کە (قال: تخلف النبي عنا في سفرة سافرناها، فأدركنا وقد أرهقنا العصر، فجعلنا نتوضأ ونمسح على أرجلنا فنادى بأعلى صوته: «ويل للأعقاب من النار» مرتين أو ثلاثا) لە سەفەرێکدا کە کردمان ئێمە پێش کەوتین و پێغەمبەرﷺ لە دوامانەوە هات، ئینجا پێمان گەشت و ماندوو بووین و پەلەی نوێژی عەسرمان بوو بە هۆی ئەوەوە دەست نوێژمان گرت و مەسحمان کرد بەسەر پێکانماندا. ئەویش بە دەنگی بەرز دووجار یان سێ جار فەرموی: سزای ئاگر بۆ ئەو پاژنانەی کە تەڕ نەکراون. (ویل) بە مانا سزای بەتینە، کەواتە فەرزە شۆرینی قاچ و پێ بە تەواوی. شیعە لە بە روالەت خوێندنەوەی ﴿و أرجلكم﴾ رایان وایە کە شۆرین فەرز نیەو هەر ئەبێ مەسح بکرێ. بەڵام راکەیان پێچەوانەی هەموو ئەو حەدیسانەیە کە هاتووە لە پێغەمبەرەوە کە شۆرین فەرزەو هەموو هاوەڵەکانی پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەوەن کە پێغەمبەرﷺ پێی موبارەکی شۆریوەو دیارە ئەو فیترکەرو مامۆستای ئوممەتەو هەر ئیعتیبار بە قسەو کردەوەی ئەو هەیە.

***     ***     ***

## ٢٨- بَابُ الْمَضْمَضَةِ فِي الْوُضُوءِ.

قَالَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ وَعَبْدُاللهِ بنُ زَيْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

١٦٤- حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ أَخْبَرَنَا شُعَيْبُ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ أَخْبَرَنِي عَطَاءُ بنُ يَزِيدَ عَنْ حُمْرَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ بنَ عَفَّانَ أَنَّهُ رَأَى عُثْمَانَ بنَ عَفَّانَ دَعَا بِوَضُوءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ مِنْ إِنَائِهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الْوَضُوءِ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثَلاَثًا، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ كُلَّ رِجْلٍ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَوَضَّأُ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا وَقَالَ: «مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ لاَ يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».

(باب المضمضة في الوضوء) ئەمە بابی ئاو وەردانە لە دەم لە کاتی دەست نوێژدا، لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن عباس و عبداللەی کوڕی زەیدەوە لە حومرانەوە کە (أنه رأى

عثمان دعا بوضوء فأفرغ على يديه من إنائه فغسلهما ثلاث مرات، ثم أدخل يمينه في الوضوء ،ثم تمضمض واستنشق واستنثر، ثم غسل وجهه ثلاثا، ويديه إلى المرفقين ثلاثا، ثم مسح برأسه، ثم غسل كل رجل ثلاثا، ثم قال: رأيت النبيﷺ يتوضأ نحو وضوئي هذا وقال «من توضأ نحو وضوئي هذ ،ثم صلى ركعتين لا يحدث فيهما نفسه ،غفر الله له ما تقدم من ذنبه»)حەزرەتی عوسمانی بینی دەست نوێژی دەگرت ئاوی كرد بە دەستیدا لە قاپەكەو شۆردی سێ جار لە پاشا دەستی راستی خستە ناو ئاوی دەست نوێژەكەو ئاوی وەردا لە دەم و لوتی و مشی كرد، لە پاش دەم و چاوی شۆرد سێ جار وە دەستی شۆرد تا ئانیشكی سێ جار لە پاشان مەسحی سەری كرد لەپاشا هەموو قاچی شۆرد سێ جار، لە پاشان فەرمووی: پێغەمبەرم بینی بەم شێوە دەست نوێژی دەگرت وەك ئەم دەست نوێژەی منە و فەرمووی: هەركەس دەست نوێژ بگرێ وەك ئەم دەست نوێژەی من و لەپاشان دوو ركات نوێژ بكات خۆی تێیدا مەشغول نەكات بە دنیاوە، خوا لە گوناهی لەمەو پێشی خۆش دەبێت.

*** *** ***

## ٢٩ـ بَابُ غَسْلِ الأَعْقَابِ

## وَكَانَ ابْنُ سِيرِينَ يَغْسِلُ مَوْضِعَ الْخَاتَمِ إِذَا تَوَضَّأَ

١٦٥ـ حَدَّثَنَا آدَمُ بنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ زِيَادٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ -وَكَانَ يَمُرُّ بِنَا وَالنَّاسُ يَتَوَضَّؤُونَ مِنَ الْمِطْهَرَةِ- قَالَ: أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ، فَإِنَّ أَبَا الْقَاسِمِ قَالَ: «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ».

(باب غسل الأعقاب) ئەمە بابی شۆرینی پاژنەیە (وكان ابن سيرين يغسل موضع الخاتم إذا توضأ) واتە ئیبن و سیرین لە دەست نوێژدا شوێنی ئەنگوستیلەی ئەشۆرد بە جولاندنی. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە محمدی كوڕی زیادەوە (قال: سمعت أبا هريرة -وكان يمر بنا والناس يتوضؤون من المطهرة- قال: أسبغوا الوضوء، فإن أبا القاسم قال: «ويل للأعقاب من النار») ئەڵێ بیستم لە ئەبو هورەیرە و تێپەڕی بە لاماندا و خەڵكی دەست نوێژیان دەگرت لە زەرفێكدا. وتی دەست نوێژەكەتان تەواو بكەن، چونكە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: سزای ئاگر بۆ ئەو پاژنانەی كە ناشۆررێن یان تەڕ نەكراون.

٣٠ـ بَابُ غَسْلِ الرِّجْلَيْنِ فِي النَّعْلَيْنِ، وَلاَ يَمْسَحُ عَلَى النَّعْلَيْنِ

١٦٦ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بْنُ يُوسُفَ قَالَ أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيُّ عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ: يَا أَبَا عَبْدِالرَّحْمَنِ، رَأَيْتُكَ تَصْنَعُ أَرْبَعًا لَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِكَ يَصْنَعُهَا. قَالَ: وَمَا هِيَ يَا ابْنَ جُرَيْجٍ؟ قَالَ: رَأَيْتُكَ لاَ تَمَسُّ مِنَ الأَرْكَانِ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ، وَرَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ، وَرَأَيْتُكَ تَصْبُغُ بِالصُّفْرَةِ، وَرَأَيْتُكَ إِذَا كُنْتَ بِمَكَّةَ أَهَلَّ النَّاسُ إِذَا رَأَوُا الْهِلاَلَ وَلَمْ تُهِلَّ أَنْتَ حَتَّى كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ. قَالَ عَبْدُاللهِ: أَمَّا الأَرْكَانُ فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَمَسُّ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ. وَأَمَّا النِّعَالُ السِّبْتِيَّةُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَلْبَسُ النَّعْلَ الَّتِي لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا. وَأَمَّا الصُّفْرَةُ فَإِنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَصْبُغُ بِهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَصْبُغَ بِهَا. وَأَمَّا الإِهْلاَلُ فَإِنِّي لَمْ أَرَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يُهِلُّ حَتَّى تَنْبَعِثَ بِهِ رَاحِلَتُهُ.

(باب غسل الرجلين في النعلين، ولا يمسح على النعلين) ئەمە بابی ئەوەیە کە هەردوو پێ ئەشۆردرێن لەناو نەعلداو مەسح ناکرێن بەسەر نەعلەکاندا. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن و عومەرەوە کە پێی گوترا لە تۆ ئەبینین چوار شت کە نەماندیوە لە هیچ کام لە هاوەڵەکانت بیکەن. (قال: وماهي يا أبن جريج؟) ئەویش فەرموی: ئەو چوار شتە چین ئەی کوڕی جورەیج؟

١) (قال: رأيتك لا تمس من الأركان إلا اليمانيين) تۆم بینی لە روکنەکانی کەعبە هەردوو روکنە یەمانیەکان کە روکی (حجر الاسودی)ش ئەگرێتەوە هەر دەست بەو دوانەدا ئەهێنی.

٢) (ورأيتك تلبس النعال السبتية) تۆم بینی نەعلی سبتی ئەپۆشی کە هینی ئەهلی نیعمەیە لە پێی ئەکەیت.

٣) (ورأيتك تصبغ بالصفرة) تۆم بینی بە رەنگی زەرد مووت رەنگ ئەکەیت.

٤) (ورأيتك إذا كنت بمكة أهل الناس إذا رأوا الهلال ولم تهل أنت حتى كان يوم التروية) تۆم بینی کاتێ لە مەککەدا خەڵک ئیحرام ئەبەستن کاتێ کە مانگی ذی الحجەیان بینی، وە تۆم بینی لە رۆژی هەشتەمدا ئیحرامت بەست.

(قال عبدالله: أما الأركان فإني لم أر رسول اللهﷺ يمس إلا اليمانيين) له وەلامدا ئيبن و عومەر فەرمووی بە ئيبن جورەيج لە بارەی چوار روكنەكەی كەعبەوە من نەم ديوە پێغەمبەرﷺ دەست بێنێ و تەحيە بكات بۆ ئەو دوو روكنە نەبێ. (وأما النعال السبتية فإني رأيت رسول اللهﷺ يلبس النعل التي ليس فيها شعر ويتوضأ فيها، فأنا أحب أن ألبسها) وە سەبارەت ئەو نەعلانەوە من پێغەمبەرم بينی ئەو جۆرە نەعلەی پۆشی و منيش پێم خۆشە بيان پۆشم.وا ديتم هەردوو پێی پيرۆزی شۆرد لەناو ئەو نەعلانەدا، منيش پێم خۆشە بەو جۆرە بكەم. ئەمە مەبەستی ئيمامی بوخارییە لەم شوێنەدا كە ئەيكات بە بەڵگە لەسەر پێويستی شۆردنی پێ. (وأما الصفرة فإني رأيت رسول اللهﷺ يصبغ بها، فأنا أحب أن أصبغ بها) سەبارەت بە رەنگ كردن بە زەرد ئەوە من پێغەمبەرم بينی ئەو رەنگەی بەكار هێناو منيش پێم خۆشە بەكاری بێنم. ئيتر رەنگ كردنی موو يان پۆشاك (وأما الهلال فإني لم أر رسول اللهﷺ يهل حتى تنبعث به راحلته) لە بارەی ئيحرامەوە من نەم ديتووە پێغەمبەرﷺ ئيحرام ببەستێ كە بە رێكی دامەزراوە بەسەر وڵاخەكەيەوە. ئاوا وەڵامی ئەو پرسيارانەی دايەوەو شافيعی و مالک و ئەحمەديش لەسەر ئەوەن.

ئەم حەديسە لە ژمارەكانی: (١٥١٤، ١٥٥٢، ١٦٠٩، ٢٨٦٥، ٥٨٥١)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٣١ـ بَابُ التَّيَمُّنِ فِي الْوُضُوءِ وَالْغُسْلِ

١٦٧ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدٌ عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّﷺ لَهُنَّ فِي غَسْلِ ابْنَتِهِ: «ابْدَأْنَ بِمَيَامِنِهَا وَمَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مِنْهَا».

ئەم حەديسە لە ژمارەكانی: (١٢٥٣، ١٢٥٤، ١٢٥٥، ١٢٥٦، ١٢٥٧، ١٢٥٨، ١٢٥٩، ١٢٦٠، ١٢٦١، ١٢٦٢، ١٢٦٣)دا دووبارە بووەتەوە.

١٦٨ـ حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَشْعَثُ بْنُ سُلَيْمٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَبِي عَنْ مَسْرُوقٍ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّﷺ يُعْجِبُهُ التَّيَمُّنُ فِي تَنَعُّلِهِ وَتَرَجُّلِهِ

وَطَهُورِهِ فِي شَأْنِهِ كُلِّهِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٢٦، ٥٣٨٠، ٥٨٥٤، ٥٩٢٦)دا دووبارە بووەتەوە.

ئینجا دێتە سەر بابی ئەوەی کە لە دەست نوێژو غوسڵدا لە راستەوە دەست پێ ئەکرێ و ئەفەرموێ: (باب التيمن في الوضوء والغسل) لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لەم أم عطیەوە کە ئافرەتێکی ئەنساری بوو مردووی ئەشۆردو خزمەتی نەخۆشی ئەکردو لە غەزای خەیبەردا بوو -خوای لێ رازی بێ- (قالت: قال النبيﷺ لهن في غسل ابنته:) فەرموی: پێغەمبەرﷺ فەرموی بە أم عطیەو ئەوانەی کە لەگەڵی بوون ((ابدأن بميامنها ومواضع الوضوء منها))لە شۆرینەکەیدا دەست پێ بکەن لە لای راست و شوێنی دەست نوێژەکەیدا (عن مسروق عن عائشة قالت: كان النبيﷺ يعجبه التيمن في تنعله وترجله و طهوره في شأنه كله) حەدیسێ ئەهێنێ لە مسروقەوەو ئەویش لە دایکی ئیمانداران عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە پێغەمبەرﷺ پێی خۆش بوو دەست کردن بە لای راست لە پۆشینی پێڵاو و داهێنانی سەرو ریش و غوسڵ و دەست نوێژی و لە هەموو کاروفرمانیدا، بێگومان مەبەست بە هەموو ئەو کارانەیە کە پیرۆزن نەک پەستەکان وەک چون بۆ ئاودەست و لە مزگەوت دەرچوون و وێنەیان. بە کورتی هەرکارێ کە لە شەرعدا دیاریی کراوە.

*** *** ***

## ٣٢ـ بَابُ الْتِمَاسِ الْوَضُوءِ إِذَاحَانَتِ الصَّلَاةُ

وَقَالَتْ عَائِشَةَ: حَضَرَتِ الصُّبْحُ فَالْتُمِسَ الْمَاءُ فَلَمْ يُوجَدْ، فَنَزَلَ التَّيَمُّمُ

١٦٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ إِسْحَاقَ بنِ عَبْدِاللهِ بنِ أَبِي طَلْحَةَ عَنْ أَنَسَ بنِ مَالِكٍ أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِﷺ وَحَانَتْ صَلَاةُ الْعَصْرِ، فَالْتَمَسَ النَّاسُ الْوَضُوءَ فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِﷺ بِوَضُوءٍ فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِﷺ فِي ذَلِكَ الإِنَاءَ يَدَهُ وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَوَضَّئُوا مِنْهُ قَالَ: فَرَأَيْتُ الْمَاءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهُ، حَتَّى تَوَضَّئُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ.

(باب التماس الوضوء إذاحانت الصلاة) ئەمە بابی ئەوەیە کاتێ نوێژ هات، واتە نزیک کەوتەوە هاتنی نوێژ هەرکەس دەست نوێژی نەبوو با هەوڵی ئاو بدات تا دەست نوێژی

پێ بگرێ. لەم بارەیەوە فەرمودەیەکی عائشە ئەهێنێ -خوای لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: (قالت عائشة: حضرت الصبح فالتمس الماء فلم يوجد، فنزل التيمم) نوێژی بەیانی هاتە پێشەوەو هەوڵی ئاو درا ئاو دەست نەکەوت، ئینجا ئایەتی تەیەموم هاتە خوارەوە. ئینجا ئیمامی بوخاری لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە -خوای لێ رازی بێت- (أنه قال: رأيت رسول اللهﷺ وحانت صلاة العصر، فالتمس الناس الوضوء فلم يجدوه، فأتي رسول اللهﷺ بوضوء فوضع رسول اللهﷺ في ذلك الإناء يده وأمر الناس أن يتوضئوا منهم قال: فرأيت الماء ينبع من تحت أصابعه، حتى توضئوا من عند آخرهم) ئەفەرموێ: بە چاوەوە بووم و پێغەمبەرم بینی لە کاتێکدا نوێژی عەسر هاتە پێشەوە خەڵکی هەوڵی ئاویان داو دەستیان نەکەوت، ئینجا ئاوێکیان بۆ پێغەمبەرﷺ هێناو دەستی پیرۆزی خستە ناو ئەو شتەی کە ئاوەکەی تێدابوو فەرمانی دا کە بێن لەو ئاوە دەست نوێژ بگرن. هەموو دەست نوێژیان گرت تا دواترین کەسیان. ئەم حەدیسە ئیمامانی حەدیس لە چەند شوێنێکی تردا هێناویانە. ئەم حەدیسە ئیمامی بوخاری بۆ بەڵگە لەسەر مەبەستی بابەکەی ئێرەو لەمەو پاش ئەیهێنێ لە بابی موعجیزەو نیشانەی پێغەمبەرێتی کە ئەو ئاوە کەمە بەشی ئەو کۆمەڵەی کردو بە چاو بینیان کە ئاو فوارەی ئەکرد لە ژێر پەنجەیەوەﷺ. هەروەها وەرئەگیرێ کە ئاو هەڵگۆزین بە دەست لە ئاوی کەمدا دروستە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٩٥، ٢٠٠، ٣٥٧٣، ٣٥٧٤، ٣٥٧٥)دا دووبارە بووەتەوە.

***　***　***

## ٣٣ـ بَابُ الْمَاءُ الَّذِي يُغْسَلُ بِهِ شَعْرَ الإِنْسَانِ

وَكَانَ عَطَاءٌ لاَ يَرَى بِهِ بَأْسًا أَنْ يُتَّخَذَ مِنْهَا الْخُيُوطُ وَالْحِبَالُ. وَسُؤْرِ الْكِلاَبِ وَمَمَرِّهَا فِي الْمَسْجِدِ. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: إِذَا وَلَغَ فِي إِنَاءٍ لَيْسَ لَهُ وَضُوءٌ غَيْرُهُ يَتَوَضَّأُ بِهِ. وَقَالَ سُفْيَانُ: هَذَا الْفِقْهُ بِعَيْنِهِ، يَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا﴾ وَهَذَا مَاءٌ. وَفِي النَّفْسِ مِنْهُ شَيْءٌ، يَتَوَضَّأُ بِهِ وَيَتَيَمَّمُ.

١٧٠ـ حَدَّثَنَا مَالِكُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ حَدَّثَنَا إِسْرَائِيلُ عَنْ عَاصِمٍ عَنِ ابْنِ سِيرِينَ

قَالَ: قُلْتُ لِعَبِيدَةَ: عِنْدَنَا مِنْ شَعْرِ النَّبِيِّ ﷺ أَصَبْنَاهُ مِنْ قِبَلِ أَنَسٍ -أَوْ مِنْ قِبَلِ أَهْلِ أَنَسٍ- فَقَالَ: لأَنْ تَكُونَ عِنْدِي شَعْرَةٌ مِنْهُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (١٧١)دا دووبارە بووەتەوە.

١٧١- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِالرَّحِيمِ قَالَ: أَخْبَرَنَا سَعِيدُ بْنُ سُلَيْمَانَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبَّادٌ عَنِ ابْنِ عَوْنٍ عَنِ ابْنِ سِيرِينَ عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمَّا حَلَقَ رَأْسَهُ كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَوَّلَ مَنْ أَخَذَ مِنْ شَعْرِهِ.

١٧٢- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بْنُ يُوسُفَ عَنْ مَالِكٍ عَنْ أَبِي الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا شَرِبَ الْكَلْبُ فِي إِنَاءِ أَحَدِكُمْ فَلْيَغْسِلْهُ سَبْعًا».

١٧٣- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ أَخْبَرَنَا عَبْدُالصَّمَدِ حَدَّثَنَا عَبْدُالرَّحْمَنِ بْنُ عَبْدِاللهِ بْنِ دِينَارٍ سَمِعْتُ أَبِي عَنْ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: «أَنَّ رَجُلاً رَأَى كَلْبًا يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَأَخَذَ الرَّجُلُ خُفَّهُ فَجَعَلَ يَغْرِفُ لَهُ بِهِ حَتَّى أَرْوَاهُ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ، فَأَدْخَلَهُ الْجَنَّةَ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٣٦٣، ٢٤٦٦، ٦٠٠٩)دا دووبارە بووەتەوە.

١٧٤- وَقَالَ أَحْمَدُ بْنُ شَبِيبٍ حَدَّثَنَا أَبِي عَنْ يُونُسَ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: حَدَّثَنِي حَمْزَةُ ابْنُ عَبْدِاللهِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كَانَتِ الْكِلاَبُ تَبُولُ وَتُقْبِلُ وَتُدْبِرُ فِي الْمَسْجِدِ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَلَمْ يَكُونُوا يَرُشُّونَ شَيْئًا مِنْ ذَلِكَ.

١٧٥- حَدَّثَنَا حَفْصُ بْنُ عُمَرَ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنِ ابْنِ أَبِي السَّفَرِ عَنِ الشَّعْبِيِّ عَنْ عَدِيِّ ابْنِ حَاتِمٍ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «إِذَا أَرْسَلْتَ كَلْبَكَ الْمُعَلَّمَ فَقَتَلَ فَكُلْ، وَإِذَا أَكَلَ فَلاَ تَأْكُلْ فَإِنَّمَا أَمْسَكَهُ عَلَى نَفْسِهِ». قُلْتُ: أُرْسِلُ كَلْبِي فَأَجِدُ مَعَهُ كَلْبًا آخَرَ. قَالَ: فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا سَمَّيْتَ عَلَى كَلْبِكَ وَلَمْ تُسَمِّ عَلَى كَلْبٍ آخَرَ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٠٥٤، ٥٤٧٥، ٥٤٧٦، ٥٤٧٧، ٥٤٨٣، ٥٤٨٤، ٥٤٨٥، ٥٤٨٦، ٥٤٨٧، ٧٣٩٧)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب الماء الذي يغسل به شعر الإنسان) ئەمە بابی ئەوەیە ئایا ئاوێ کە موی ئادەمی پێ بشۆرێ پاکە یان نە؟ (وكان عطاء لا يرى به بأسا) وە عەطا لای وایە کە پاکەو هیچ

خەتەرێکی تێدا نیە، (أن يتخذ منها الخيوط والحبال) کە لە مووی ئادەمی دەزو و حەبل دروست بکرێ. (وسؤر الكلاب وممرها في المسجد) وە بابی ئەوەیە ئایا پاش ماوەی دەمی سەگ پاکە یان نا؟، وە باسی جێ ڕێی سەگە لەناو مزگەوتدا (وقال الزهري: إذا ولغ في إناء ليس له وضوء غيره يتوضأ به) زەهەری ئەفەرموێ: ئەگەر سەگ دەمی خستە ناو زەرفێ لە کاتێکدا ئەو کەسەی کە پێویستە بە دەست نوێژ گرتن، بێجگە لەو ئاوە ئاوی تری نەبێ دەست نوێژی لێ بگرێ.واتە دروستە و هیچ ڕەخنەیەک نی‌یە لەوە (وقال سفيان: هذا الفقه بعينه) سوفیانی سەوریش ئەفەرموێ: ئەمە فەهمێکی راستە (يقول الله تعالى: ﴿فلم تجدوا ماء فتيمموا﴾ وهذا ماء) واتە چونکە خوا ئەفەرموێ: ئەگەر ئاوتان دەست نەکەوت تەیەموم بکەن، ئەو ئاوی پاشماوەی سەگە ئاوە. ئیمامی بوخاری ئەفەرموێ: (وفي النفس منه شيء، يتوضأ به ويتيمم) واتە لەبەر ئەوەی ئیختیلافی زانایان هەیە لەوەدا من ئەڵێم دەست نوێژی پێ بگرێ و تەیەمومیش بکات.

لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن سیرینەوە (قال: قلت لعبيدة: عندنا من شعر النبي ﷺ أصبناه من قبل أنس -أو من قبل أهل أنس-) ئیبن سیرین گوتی گوتم بە عبیدە لامان هەیە لەمووی پێغەمبەر کە دەستمان کەوتووە لە لایەن ئەنەسەوە یان لە لایەن ئەهلی ئەنەسەوە (فقال: لأن تكون عند شعرة منه أحب إلي من الدنيا وما فيها) ئەڵێ ئەگەر لام هەبێ لەوە تەنیا موویەک پێم خۆشترە لەدنیاو هەرچی لە دنیادایە. ئینجا ئایا لە چ بارێکەوە ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر پاکێتی موو؟ لە وەڵامدا دەڵێین: پاراستنی ئەو مووە بەفەرانەو گوتنی عبیدە کە ئەڵێ ئەو موانە خۆشەویست ترە بەلایەوە لە دنیا و هەرچی لە دنیادایە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر پاکێتی ئەو مووە، ئینجا ئەگەر ئەگوترێ: پاکێتی مووی پێغەمبەرﷺ نابێ بە بەڵگە لەسەر پاکێتی هەموو موویەک لە وەڵامدا گوتراوە: تایبەتێتی ئەم بە پاکێتی‌یەوە ئەبێ دەلیلی لەسەر بێ، ئەسڵ نەبوونی دەلیلە. ئەم وەڵامە ڕەخنەی لێ گیراوە بە شێوەیەک بەدرێژی باس کراوەو زانینی تەواو لای خوایە.

ئینجا بەم بۆنەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەرﷺ (لما حلق رأسه كان أبو طلحة أول من أخذ من شعره) کاتێ سەری موبارەکی تاشی ئەبو طلحە یەکەم کەس

بوو کە لەو موانەی وەرگرت.

لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە تبرک کردن شتێکی شەرعی و هیچ جۆرە دژایەتی و نارێکی‌یەکی نی‌یە لەگەڵ توحیددا، نەک وەک هێندێ لە نەزانان لەم چەرخەدا ئەیکەن بە هۆسەو هەرا. وە شتێکی ئاشکرایە هەموو ئیمانداری ئەبێ بزانێ هەموو پیت و فەڕێ ئەگەڕێتەوە بۆ لای خواو ئەو شتە پیرۆزانە خوا کردوونی بە هۆی فەڕو بەرەکەتە و ئەگینا هیچ شتێ لە زاتی خۆیدا هیچ نی‌یەو تاثیری نی‌یە.

هەر لەم بابەدا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ کاتێک سەگ ئاوی خواردەوە لە قاپ و زەرفی هەرکام لە ئێوە با حەوت جار بیشۆرێ، حەدیسەکە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (قال: إن رسول اللهﷺ قال: «إذا شرب الكلب في إناء أحدكم فليغسله سبعا»).

لەم فەرمودە وەرئەگیرێ کە پیسی‌یەکەی بەهێزە. ئینجا ئەمەی کە ئەفەرموێ: (في إناء أحدكم) بە پێی غالبە نەک بۆ ئەوەی ئەگەر قاپ و زەرفی خۆتان ئەبێ جیاوازەو قەیناکا.

ئینجا ئایا بێجگە لە دەمی هەر ئەندامێکی تری هەر ئەو حوکمەی هەیە؟ ئەوە شتێکە خیلافی زانایانی تێدا هەیە بە پێی مەزهەبی شافیعی‌یەکان ئەندامەکانی تریشی هەر وایە، چونکە دەم کە بەڕێزترینە گڵاوی بکات ئەندامەکانی تریش هەر گڵاوی ئەکات. ئینجا ئەگەر دەمی خستە خۆراکێکی تر کە تەڕ ئەبێ ئەوە پێویستە جێگە دەمەکەی فڕێ بدرێ و باقی تری پاکەو قاپ و زەرفەکەش پاکە مەگەر دەمی کەوتبێ لە شوێنێکی. مەبەست بە خواردنەوە ئەوەیە بە تەڕی دەمی لێ‌ی کەوتبێ کە لێسانەوەو لێکەوتنی تریش بە تەڕی هەر گڵاوی ئەکات. لەم ریوایەتەدا باسی شۆرین بە خۆڵ نی‌یە، بەڵام لە ریوایەتی تردا هاتووە: (أولاهن أو إحداهن بالتراب) لەبەر ئەوە پێویستە یەکێ لەو حەوت جارە یان یەکەمیان بە قوڕ بێت. بە گوێرەی رای هەندێ لە زانایان ئەو فەرمانە پێویست کردن نی‌یە، بەڵکو سوننەتە. خوا باش ئەزانێ.

هەر لەم بارەیەوە ئەم حەدیسەش هاتووە لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ («أن رجلا رأى كلبا يأكل الثرى من العطش) پیاوێک سەگێکی دی کە لە تینودا خۆڵی تەڕی ئەخوارد (فأخذ الرجل خفه فجعل يغرف له به حتى أرواه، فشكر الله له، فأدخله الجنة») ئینجا کابرا پێڵاوەکەی خۆی بردو ئاوی پێ هێنا بۆ سەگەکە تا تێر ئاو بوو بە هۆی ئەوەوە خوا پاداشتی دایەوەو خستی‌یە بەهەشت، واتە لەرۆژی دواییدا ئەیخاتە بەهەشت بە

هۆی ئەو کردەوەوە. ئینجا نابێ ئەم حەدیسە بکەین بە بەڵگە لەسەر گڵاو نەبوونی جێگە دەمی سەگ چونکە:

١) هەڵئەگرێ بە پێڵاوەکەی ئاوی هەڵگۆزیبێ لە بیرەکەو ئینجا کردبێتی‌یە شتێکی تر بۆ سەگەکە.

٢) لەو شەرعەدا سەگ گڵاو نەبووبێ و لەم شەرعەدا گڵاو کرابێ.

ئینجا ئیمامی بوخاری حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیبن و عومەرەوە بەم رەنگە (قال: كانت الكلاب تبول وتقبل و تدبر في المسجد في زمان رسول الله ﷺ فلم يكونوا يرشون شيئا من ذلك) ئەفەرموێ: سەگەکان هاتوچۆیان لە مزگەوتەکەی مەدینەدا دەکرد لە چەرخی پێغەمبەردا ﷺ ئینجا ئاویان نەئەپرژان بە جێگە پێکانیاندا چ جای شۆرین.

لەم فەرمودەوە وا دەرئەکەوێ کە پاشخوانی سەگ پاک بێت چونکە لەو هاتوچۆدا لیکی دەمیان ئەکەوێتە ئەو جێی هاتوچۆیە. بەڵام ئەمە نابێ بەبەڵگە چونکە لێکەوتنی لیکی دەمەکە یەقین نی‌یە، وە ئەسڵ پاکی‌یە. لەبەر ئەوە ئەم حەدیسە نابێ بە دژی دەقی ئەو حەدیسەی کە پێی داتەنێ. هەرچۆنێ نابێ بەبەڵگە لەسەر ئەوەی کە گۆشتی سەگ ئەخورێ، چونکە حەدیسی سەحیح کە پێویستی کرد حەوت جار شۆرینی پاشخوان و جێ دەمی بەڵگەی قەتعی‌یە لەسەر پیسی گۆشتەکەی و حەرامی خواردنی،ئینجا هاتوچۆ کردنی سەگ بە مزگەوتی پیرۆزدا لەو کاتانەدا لەبەر ئەوە بوو کە مزگەوتەکە لەو کاتەدا قاپی نەبووەو بە هۆی ئەوەوە چار نەئەکرا لە هاتو چۆ لەپاشان بەو جۆرەی لێ کرا.ساڵ لە پاش ساڵ و چەرخ لە پاش چەرخ الحمد لله گەیشت بەم رادەی کە ئێستا ئەبینرێ و هەموو کەس سەرسامە لێی.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە عدی کوڕی حاتەمەوە (قال:سألت النبي ﷺ) ئەڵێ: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ لە بارەی نێچیری سەگی راوی (فقال: «إذا أرسلت كلبك المعلم فقتل فكل، وإذا أكل فلا تأكل فإنما أمسكه على نفسه») ئەرموێ: کاتێ سەگە فێرکراوەکەت بەردایە نێچیرو ئەویش گرتی لە ژێر دەستیدا بوو لێی نەخوارد ئەو کاتە بیخۆو حەڵاڵە، ئەگەر لێی خوارد تۆ لێی مەخۆو مردارەو ئەو کاتە بۆ خۆی گرتووە، ئەگەر لێی نەخوارد بۆ تۆی گرتووە (قلت: أرسل كلبي فأجد معه كلبا آخر. قال:فلا تأكل، فإنما سميت على كلبك ولم تسم على كلب آخر) عدی ئەڵێ:عەرزم کرد جاری وا هەیە سەگە

فێرکراوەکەی خۆم بەردەدەمە نێچیرو ئینجا سەگێکی تر دێت بە هەردووکیانەوە ئەیگرن ئەمە حوکمی چۆنە؟ فەرموی: ئەو کاتە مەیخۆ، چونکە ناوی خوات بردووە لەسەر سەگەکەی خۆت نەک لەسەر سەگەکەی تر.

ئەم حەدیسە وا نیشان ئەدات کە ناوی خوا بردن فەرزەو مەرجە بۆ حەلاڵێتی نێچیر، بەڵام حەدیسی تر هەیە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە مەرج نی‌یەو جێگەی خیلافی زانایانەو با تەماشای کتێبەکانی تر بکرێت. پەیوەندی ئەم حەدیسە بە بابەکەوە لەم بارەوەیە کە ئەو نێچیرەی لێی خورابێ ئەبێ بە پاشخوانی سەگ.

***　　***　　***

## ٣٤- بَابُ مَنْ لَمْ يرَ الْوضُوءَ إلاَّ منَ الْمَخْرجَيْنِ منَ الْقُبُلِ وَالدُّبُرِ

وَقَوْلُ اللهِ تَعَالَى: ﴿أَوْ جَاءَ أحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الغَائطِ﴾. وَقَالَ عَطَاءٌ فِيمَنْ يَخْرُجُ مِنْ دُبُرِهِ الدُّودُ أَوْ مِنْ ذَكَرِهِ نَحْوُ الْقَمْلَةِ: يُعِيدُ الوضُوءَ. وَقَالَ جَابِرُ بنُ عَبْدِاللهِ: إذَا ضَحِكَ فِي الصَّلاَةِ أَعَادَ الصَّلاَةَ، وَلَمْ يُعِدِ الْوُضُوءَ. وَقَالَ الْحَسَنُ: إنْ أَخَذَ مِنْ شَعْرِهِ وَأَظْفَارِهِ أَوْ خَلَعَ خُفَّيْهِ فَلاَ وضُوءَ عَلَيْهِ. وَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: لاَ وضُوءَ إلاَّ مِنْ حَدَثٍ. وَيُذْكَرُ عَنْ جَابِرٍ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ فِي غَزْوَةِ ذَاتِ الرِّقَاعِ فَرُمِيَ رَجُلٌ بِسَهْمٍ فَنَزَفَهُ الدَّمُ فَرَكَعَ وَسَجَدَ وَمَضَى فِي صَلاَتِهِ. وَقَالَ الْحَسَنُ: مَازَالَ الْمُسْلِمُونَ يُصَلُّونَ فِي جِرَاحَاتِهِمْ. وَقَالَ طَاوسٌ وَمُحَمَّدُ بنُ عَلِيٍّ وَعَطَاءٌ وَأَهْلُ الْحِجَازِ: لَيْسَ فِي الدَّمِ وضُوءٌ، وَعَصَرَ ابْنُ عُمَرَ بَثْرَةً فَخَرَجَ مِنْهَا الدَّمُ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ. وَبَزَقَ ابْنُ أبِي أَوْفَى دَمًا فَمَضَى فِي صَلاَتِهِ. وَقَالَ ابْنُ عُمَرَ وَالْحَسَنُ فِيمَنْ يَحْتَجِمُ: لَيْسَ عَلَيْهِ إلاَّ غَسْلُ مَحَاجِمِهِ.

١٧٦- حَدَّثَنَا آدَمُ بنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ عَنْ سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لاَ يَزَالُ الْعَبْدُ فِي صَلاَةٍ مَاكَانَ فِي الْمَسْجِدِ يَنْتَظِرُ الصَّلاَةَ مَالَمْ يُحْدِثْ». فَقَالَ رَجُلٌ أَعْجَمِيٌّ: مَا الْحَدَثُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ الصَّوْتُ (يَعْنِي الضَّرْطَةَ).

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٤٥، ٤٤٧، ٦٤٧، ٦٤٨، ٦٥٩، ٢١١٩، ٣٢٢٩، ٤٧١٧)دا دووبارە بووەتەوە.

١٧٧- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ قَالَ حَدَّثَنَا ابْنُ عُيَيْنَةَ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ عَبَّادِ بنِ تَمِيمٍ عَنْ

عَمِّهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لاَ يَنْصَرِفْ حَتَّى يَسْمَعَ صَوْتًا أَوْ يَجِدَ رِيحًا».

١٧٨- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ قَالَ حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ مُنْذِرٍ أَبِي يَعْلَى الثَّوْرِيِّ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْحَنَفِيَّةِ قَالَ: قَالَ عَلِيٌّ كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً فَاسْتَحْيَيْتُ أَنْ أَسْأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَأَمَرْتُ الْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ فَسَأَلَهُ فَقَالَ: «فِيهِ الْوُضُوءُ». وَرَوَاهُ شُعْبَةُ عَنِ الأَعْمَشِ.

١٧٩- حَدَّثَنَا سَعْدُ بْنُ حَفْصٍ حَدَّثَنَا شَيْبَانُ عَنْ يَحْيَى عَنْ أَبِي سَلَمَةَ أَنَّ عَطَاءَ بْنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ زَيْدَ بْنَ خَالِدٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَأَلَ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قُلْتُ: أَرَأَيْتَ إِذَا جَامَعَ فَلَمْ يُمْنِ؟ قَالَ عُثْمَانُ: يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلاَةِ وَيَغْسِلُ ذَكَرَهُ. قَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ عَلِيًّا وَالزُّبَيْرَ وَطَلْحَةَ وَأُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ فَأَمَرُوهُ بِذَلِكَ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٢٩٢)دا دووبارە بووەتەوە.

١٨٠- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ قَالَ: أَخْبَرَنَا النَّضْرُ قَالَ أَخْبَرَنَا شُعْبَةُ عَنِ الْحَكَمِ عَنْ ذَكْوَانَ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَرْسَلَ إِلَى رَجُلٍ مِنَ الأَنْصَارِ فَجَاءَ وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: لَعَلَّنَا أَعْجَلْنَاكَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «إِذَا أُعْجِلْتَ -أَوْ قُحِطْتَ- فَعَلَيْكَ الْوُضُوءُ».

تَابَعَهُ وَهْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ. قَالَ أَبُو عَبْدِاللَّهِ: وَلَمْ يَقُلْ غُنْدَرٌ وَيَحْيَى عَنْ شُعْبَةَ: الْوُضُوءُ.

(باب من لم ير الوضوء إلا من المخرجين من القبل والدبر) ئەمە بابی ئەوەیە کە دەست نوێژ ناشکێ بە هەر شتێ کە لە لەش دەرچێ بێجگە لە پێش و پاشەوە دەرچێ، بەڵگەی ئەوەش ئەمەیە کە ئەفەرموێ: (وقول الله تعالى: ﴿أو جاء أحد منكم من الغائط﴾) واتە خوای گەورە هەواڵی داوە کە دەست نوێژ واجبە یان تەیەمموم ئەگەر ئاو نەبوو بە هۆی ئەوەی کە دەرچێ لەپاش و پێشەوە، وە یان پێستی پیاوو ئافرەت بکەوێ لە یەک. مەسەلەی دەست نوێژ شکان بە لێکەوتنی پێستی پیاوو ئافرەت شتێکی خیلافی‌یە، بەلای شافیعی‌یەوە ئەشکێ و بەلای ئەبو حەنیفەوەو هێندێ لە زانایانەوە ناشکێ، وە ئایەتی ﴿أو

لامستم النساء﴾ ئەبن بەسەر جیماعدا، بەلام وشەو وتەکانی قورئان بە پێی مانای زمانەوانی یەکەی دادەنرێ مەگەر بەلگەو دەلیلێ ببێ لەسەر ئەوەی کە بە پێی مانا زمانەوانیەکەی مەبەست نی یە. بە تایبەتی خوێندنەوەی ﴿لمستم﴾ هاتووە بە تواتر وە ﴿لمستم﴾ ظاهر ترە لە لێکەوتنی پێست، حەدیسی (کان یقبل بعض نسائه ثم خرج إلی الصلاة..) هەڵئەگرێ لە تایبەتی یەکانی پێغەمبەر بێت ﷺ لەبەر ئەوە ناکرێ بەبەڵگە.

مەبەست بەم لێکۆڵینەوە ئەوەیە کە ئێمەی شافعی باوەڕمان بەرای شافعی بەهێزترە. (وقال عطاء فیمن یخرج من دبره الدود أو من ذکره نحو القملة: یعید الوضوء) عەطا دەربارەی کەسێ کە لە پاشیەوە کرم دەرچێ یان لە پێشی یەوە سپێ بێتە دەرەوە دەست نوێژ بگرێتەوە. شافیعی و ئەحمەدو زۆر لە زانایان لەسەر ئەم رایەن. ئیمامی مالیک و چەند زانای تر لەسەر ئەوەن کە ئەم جۆرە شتە نادرانە دەست نوێژ ناشکێنێ. (وقال جابر بن عبدالله: إذا ضحك في الصلاة أعاد الصلاة، ولم یعد الوضوء) لە بارەی ئەو شتانەی دەست نوێژ ئەشکێنێ جابری کوڕی عبدالله ئەفەرموێ: ئەگەر یەکێ لە نوێژدا پێکەنی هەر نوێژەکەی بکاتەوە نەک دەست نوێژەکەی بگرێتەوە. واتە پێکەنین لە نوێژدا دەست نوێژ ناشکێنێ. ئیمامی حەنەفی ئەفەرموێ: ئەگەر قاقای کرد دەست نوێژەکەشی بەتاڵ ئەبێتەوە لەبەر حەدیسی ئیبن عەدی (من ضحك في الصلاة قهقهة فلیعد الوضوء والصلاة).

ئینجا ئەگەر لە پاش دەست نوێژ گرتن ئەگەر مووی قرتاند یان تاشی لەسەرو سمێڵی یان نینۆکی کرد یان مەسحی کرد بەسەر خوفداو لە پاش ئەوە خوفەکەی داکەند، لەم بارەیەوە (وقال الحسن: إن أخذ من شعره و أظفاره أو خلع خفیه فلا وضوء علیه) چونکە تازە دەست نوێژەکەی دامەزراوە، ئیتر بە نەمانی ئەوانە دەست نوێژەکەی بەتاڵ نابێتەوە، وەک هێندێ لەسەر ئەوەن بە نەمانی ئەوانە بەشێ لە جێی دەست نوێژ نامێنێ و نەمانی بەشێ ئەبێ بە هۆی هەمووی. بەڵێ بە نەزەر داکەندنی خوفەوە یان تەواو بوونی ماوەکەی پێویستە پێیش بشۆرێتەوە. (وقال أبو هریرة: لا وضوء إلا من حدث) ئەبو هورەیرە ئەفەرموێ: دەست نوێژ گرتن پێویست نی یە مەگەر بە هۆی پەیدا بوونی ئەو شتانەی کە هۆی شکاندنی دەست نوێژن.

ئینجا لە بارەی خوێنی زامەوە کە لە لەش بێتە دەرەوە دەست نوێژ ئەشکێنێ یان نا؟ لەم بارەیەوە (ویذکر عن جابر: أن النبي ﷺ کان في غزوة ذات الرقاع فرمي رجل بسهم

فنزفه الدم فركع و سجد مضى في صلاته. وقال الحسن: ما زال المسلمون يصلون في جراحاتهم) حەسەنی بەصری ئەفەرموێ: لە غەزای ذات الرقاعدا پیاوێک بە تیرێ زامدار کراو خوێن بەزۆری لێ‌ی هات ئەویش رکوع و سوجدەی بردو لەسەر نوێژەکەی رۆیشت وە حەسەن ئەفەرموێ: موسلمانان نوێژیان دەکرد. وا دەرئەکەوێ کە حسن لەسەر ئەوە بووە بە خوێن نە دەست نوێژو نە نوێژ بەتاڵ نابێتەوە (وقال طاوس ومحمد بن علي و عطاء و أهل الحجاز: ليس في الدم وضوء، وعصر ابن عمر بثرة فخرج منها الدم ولم يتوضأ. وبزق ابن أبي أوفى دما فمضى في صلاته. وقال ابن عمر والحسن فيمن يحتجم: ليس عليه إلا غسل محاجمه) لەم ئەسەرانەوە دەرکەوت کە بە خوێن دەست نوێژ ناشکێ.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (قال: قال النبي ﷺ: «لا يزال العبد في صلاة ماكان في المسجد ينتظر الصلاة مالم يحدث») فەرموی: پێغەمبەرﷺ فەرموی: موسلمان بەردەوام ئەبێت لە نوێژدا، واتە بە نوێژ بۆی حسابە تا بێنێتەوە لە مزگەوتداو چاوەڕوانی نوێژ بکات ماتوڵ دەست نوێژی نەشکێت (فقال رجل أعجمي: ما الحدث يا أبا هريرة؟ قال الصوت «يعني الضرطة») پیاوێکی غەیرە عەرەبی گوتی بە ئەبو هورەیرە: دەست نوێژ شکان بە چی پەیدا ئەبێت، ئەویش گوتی: بەمەی دەنگێکی لێ بێتەوە، کەواتە بەم حەدیسەش دەرکەوت بە دەرچوونی خوێن دەست نوێژ ناشکێت. هەروەها ئەم حەدیسەش کە ئەیهێنێ لە عبادی کوڕی تەمیمەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ کە (قال: «لا ينصرف حتى يسمع صوتا أو يجد ريحا») واتە کەسێ لە نوێژدا بێت و بکەوێتە گومان لە شکانی دەست نوێژەکەی نابێ نوێژەکەی ببڕێ هەتا دەنگێ نەبیستێ یان بۆن دێت بە لوتیدا.

ئینجا بە بۆنەی ئەم بابەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئیمامی عەلی‌یەوە کە (قال علي كنت رجلا مذاء فاستحييت أن أسأل رسول اللهﷺ فأمرت المقداد بن الأسود فسأله فقال: «فيه الوضوء») ئەفەرموێ: من پیاوێک بووم وەزیم زۆر بوو، ئینجا شەرمم ئەکرد پرسیار لە پێغەمبەرﷺ بکەم لەبەر ئەوەی حەزرەتی فاطمە حەرەمی بوو، وەک لە ریوایەتێکی تردا هاتووە. جا لەبەر ئەوە داوام لە مقدادی کوڕی ئەسوەد کرد ئەو پرسیارە بکات، ئەویش عەرزی کردو ئەویش فەرموی: دەست نوێژی لەسەرە، واتە غوسلی لەسەر نی‌یەو دەست نوێژی پێ

ئەشكێ. دیارە پیسە وەک میز، کەواتە شۆرینی ئەوێ (ورواه شعبة عن الأعمش).

ئەم حەدیسە لە کیتابی عیلمدا تێپەڕی و لەمەوپاش لە کیتابی غوسلیشدا دێت.لێرەدا هێنانی تا ببێ بە دەلیل لەسەر ئەوەی وەزی دەست نوێژی پێ ئەشکێ.

ئینجا حەدیسێ ئەهێنێ لە زەیدی کوڕی خالدەوە (أنه سأل عثمان بن عفان رضي الله عنه قلت: أرأيت إذا جامع فلم يمن؟) کە پرسیاری کردووە لە عثمان: ئەگەر کسێک جیماع بکات لەگەڵ خێزانی بەڵام ئاوی نەیەتەوە (قال عثمان: يتوضأ كما يتوضأ للصلاة و يغسل ذكره) فەرموی: دەست نوێژ بگرێ وەک دەست نوێژ گرتن بۆ نوێژ وە زەکەری بشۆرێ، چونکە بە هۆی وەزیەکەوە پیس بووە (قال عثمان: سمعته من رسول اللهﷺ: فسألت عن ذلك عليا والزبير وطلحة وأبي بن كعب رضي الله عنهم فأمروه بذلك) زەید ئەفەرموێ: پرسیارم کرد لە عەلی و زوبێرو طلحەو ئوبەی کوڕی کەعب، ئەوانیش هەر بەو جۆرەیان گوت کە عثمان فەرموی. بەڵام ئەمە نەسخ بوویەوە، بە اجماع واجبە غوسڵ بکات وەک لەمەو پاش دێت.

ئینجا لێرەدا پرسیارێک دەکرێت کە ماتوڵ نەسخ بوو بێ چۆن ئیمامی بوخاری ئەیکات بە دەلیل. لەوەڵامدا ئەڵێین: ئەوەی کە نەسخ بوویەوە پێویست نەبوونی غوسڵ نەک شکاندنی دەست نوێژو پیسی وەزیەکەیە. ئەمە هەر باقیەو هەر شکانی دەست نوێژە بە شتێکی پیس کە دەرچێ لە پێش یان پاشی مەردومەوە.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو سەعیدی خودریەوە (أن رسول اللهﷺ أرسل إلى رجل من الأنصار فجاء و رأسه يقطر، فقال النبيﷺ: لعلنا أعجلناك؟ فقال: نعم. فقال رسول اللهﷺ «إذا أعجلت -أو قحطت- فعليك الوضوء») پێغەمبەرﷺ ئەنێرێ بەدوای یەکێ لە ئەنصار ئەویش دێت لە کاتێکدا سەری تەڕەو تکە تکە ئای لێ دێ، ئینجا ئەفەرموێ پێی وا دەرئەکەوێ پەلەمان لێ کردی، واتە لێت نەگەڕاین هەتا لێ ئەبێتەوە لە غوسڵەکە ئەویش عەرزی کرد بەڵێ. ئینجا فەرموی پێی: کاتێ لێت پێش کەوتن، واتە خێزانت لە پێشتر ئاوی هاتەوە تۆ ئاوت نەهاتەوە ئەو کاتە هەر دەست نوێژت لەسەرە. ئەم حەدیسەش وا نیشان ئەدات ئەگەر پیاو چووە لای خێزانی و ئاوی نەهاتەوە غوسڵی لەسەر نیە، بەڵام ئەم حەدیسەش نەسخ بووەتەوە بە حەدیسێکی تری سەحیح کە لەمەو پاش دێت، وەک کۆڕو جەماوەرو پێشەواو زانایانی لەسەرە، بەڵام ئیمامی بوخاری هێناویەتی چونکە

حەدیسەکە ثابتە لەسەر مەرجی خۆی. (تابعه وهب قال: حدثنا شعبة. قال أبو عبدالله: ولم يقل غندر ويحيى عن شعبة: الوضوء).

***　　***　　***

## ٣٥ـ بَابُ الرَّجُلِ يُوَضِّئُ صَاحِبَهُ

١٨١ـ حَدَّثَنِي مُحَمَّدُ بنُ سَلاَمٍ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَزِيْدُ بنُ هَارُونَ عَنْ يَحْيَى عَنْ مُوسَى ابْنِ عُقْبَةَ عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ أُسَامَةَ بنِ زَيْدٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ لَمَّا أَفَاضَ مِنْ عَرَفَةَ عَدَلَ إِلَى الشِّعْبِ فَقَضَى حَاجَتَهُ. قَالَ أُسَامَةُ بنُ زَيْدٍ: فَجَعَلْتُ أَصُبُّ عَلَيْهِ وَيَتَوَضَّأُ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ أَتُصَلِّي؟ فَقَالَ: «الْمُصَلَّي أَمَامَكَ».

١٨٢ـ حَدَّثَنَا عَمْرُو بنُ عَلِيٍّ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَهَّابِ قَالَ: سَمِعْتُ يَحْيَى بنَ سَعِيْدٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي سَعْدُ بنُ إِبْرَاهِيمَ أَنَّ نَافِعَ بنَ جُبَيْرِ بنِ مُطْعِمٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ عُرْوَةَ بنَ الْمُغِيرَةِ بنِ شُعْبَةَ يُحَدِّثُ عَنِ الْمُغِيرَةِ بنِ شُعْبَةَ أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي سَفَرٍ وَأَنَّهُ ذَهَبَ لِحَاجَةٍ لَهُ وَأَنَّ مُغِيرَةَ جَعَلَ يَصُبُّ الْمَاءَ عَلَيْهِ وَهُوَ يَتَوَضَّأُ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ وَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٠٣، ٢٠٦، ٣٦٣، ٣٨٨، ٢٩١٨، ٤٤٢١، ٥٧٧٨، ٥٧٩٩)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب الرجل يوضئ صاحبه) ئەمە بابی ئەوەیە کە یەکێک ئاوی دەست نوێژی یەکتر بداو لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە ئوسامەی کوڕی زەیدەوە کە (أن رسول اللهﷺ لما أفاض من عرفة عدل إلى الشعب فقضى حاجته. قال أسامة بن زيد: فجعلت أصب عليه ويتوضأ. فقلت: يا رسول الله أتصلي؟ فقال: «المصلي أمامك») پێغەمبەرﷺ کاتێ گەڕایەوە لە عەرەفات لایدا بۆ ڕێگەیەکی شاخەکەو پێویستی خۆی دەرکرد. ئەڵێ من ئاوم ئەکرد بە دەستیداو ئەویش دەست نوێژی ئەگرت، ئینجا عەرزم کرد نوێژ دەکەیت فەرمووی: شوێنی نوێژ لەبەر دەستتدایە.

لەم حەدیسەوە دەرئەکەوێ کە ئەو ئاو بە دەستدا کردنە ڕەوایەو داوای یارمەتی بۆ ئەوە ڕەوایە بەڵام بۆ ئێمە چاک وایە نوێژکەر خۆی ئاو پەیدا بکات. مەگەر عوزرێکی هەبێ، ئەو

حەدیسەی کە ریوایەت کراوە کە فەرموویەتی ئێمە داوای یارمەتی ناکەین لە هیچ کەس بۆ دەست نوێژ ئیمامی نەوەوی لە شەرحی مهذبدا ئەفەرمووێ: بەتاڵەو ئەسڵی نی‌یە.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لەم بارەیەوە لە مغیرەی کوڕی شعبەوە کە (أنه كان مع رسول اللهﷺ في سفر و أنه ذهب لحاجة له وأن مغيرة جعل يصب الماء عليه وهو يتوضأ، فغسل وجهه ويديه ومسح على الخفين) ئەو لە خزمەت پێغەمبەردا بوو لە سەفەرێکدا و ئەو تەشریفی برد بە قەزای پێویستی خۆی و عروە ئەڵێ مغیرە ئاوی ئەکرد بە دەستیداو ئەویش دەست نوێژی ئەگرت، بەم ڕەنگە دەم و چاوو هەردوو دەستی شۆردو مەسحی سەری کردو مەسحی هەردوو خوفەکەی کرد، ئەم حەدیسە وەک حەدیسە پێشووەکە وایە بەس مەسحی لەسەر خوفەکان زیادەیە، ئەمەش حوکمێکی ترە کە مەبەستەو لەم حەدیسەدا وەرئەگیرێ.

*** *** ***

### ٣٦ـ بَابُ قِرَاءَةِ الْقُرْآنِ بَعْدَ الْحَدَثِ وَغَيْرِهِ

وَقَالَ مَنْصُورٌ عَنْ إِبْرَاهِيمَ: لاَ بَأْسَ بِالْقِرَاءَةِ فِي الْحَمَّامِ وَبِكَتْبِ الرِّسَالَةِ عَلَى غَيْرِ وَضُوءٍ. وَقَالَ حَمَّادٌ عَنْ إِبْرَاهِيمَ: إِنْ كَانَ عَلَيْهِمْ إِزَارٌ فَسَلِّمْ، وَإِلاَّ فَلاَ تُسَلِّمْ.

١٨٣ـ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنْ مَخْرَمَةَ بْنِ سُلَيْمَانَ عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ عَبْدَاللهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ بَاتَ لَيْلَةً عِنْدَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّﷺ -وَهِيَ خَالَتُهُ- فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللهِﷺ وَأَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللهِﷺ، حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ -أَوْ قَبْلَهُ بِقَلِيلٍ، أَوْ بَعْدَهُ بِقَلِيلٍ- اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللهِﷺ، فَجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ. ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الآيَاتِ الْخَوَاتِمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ فَتَوَضَّأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبَ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي وَأَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا. فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ. ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى أَتَاهُ الْمُؤَذِّنُ فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ.

(باب قراءة القرآن بعد الحدث وغيره) ئەمە بابی ڕەوادان و دروستی خوێندنی

قورئانه به بێ دەست نوێژ، هەروەها نووسینی یان مەبەست قورئان و غەیری قورئان وەک ذکر.

بەڵام دیاره که قورئان خوێندن به بێ دەست نوێژ دروست بێت غەیری ئەو باشتر دروسته

(وقال منصور عن إبراهيم: لا بأس بالقراءة في الحمام و يكتب الرسالة على غير وضوء) منصور له ئیبراهیمەوه ئەگێڕێتەوه که هیچ خراپی یەک نی یه له خوێندنی قورئان له حەمامدا، هەروەها له نوسینی نامه به بێ دەست نوێژ. واته لەگەڵ ئەوه که نامه (بسم الله)ی تێدایه. (وقال حماد عن إبراهيم: إن كان عليهم إزار فسلم، وإلا فلا تسلم) حماد له ئیبراهیمەوه ئەگێڕێتەوه که ئەگەر ئەوانەی له حەمامدان ئەگەر دەرپێیان له پێدا بوو سەلامیان لێ بکەو ئەگەر نا سەلامیان لێ مەکە.

لەم بارەیەوه ئەم حەدیسه ئەهێنێ له کورەیبەوه که ئیبن عەباس (أنه بات ليلة عند ميمونة زوج النبيﷺ -وهي خالته-) شەوێک مایەوه لای دایکی ئیماندارانی مەیمونه که پوری ئیبن عەباس بوو (فاضطجعت في عرض الوسادة) ئینجا راکشام له پانی فەرشەکەدا (واضطجع رسول اللهﷺ و أهله في طولها، فنام رسول اللهﷺ، حتى إذا انتصف الليل -أو قبله بقليل، أو بعده بقليل- استيقظ رسول اللهﷺ، فجلس يمسح النوم عن وجهه بيده .ثم قرأ العشر الآيات الخواتم من سورة آل عمران، ثم قام إلى شن معلقة فتوضأ منها فأحسن وضوءه، ثم قام يصلي. قال ابن عباس: فقمت فصنعت مثل ما صنع، ثم ذهب فقمت إلى جنبه، فوضع يده اليمنى على رأسي و أخذ بأذني اليمنى يفتلها) پێغەمبەرو ئەهلەکەی له باری درێژی فەرشەکەدا راکشان، ئینجا پێغەمبەرﷺ هەتا نیوەی شەو یان کەمێ له پێش نیوەی شەو یان کەمێ له دوای نیوەی شەو لەو کاتەدا خەبەری بوویەوەو دانیشت و دەستی هێنا بەسەر چاویدا تا خەوەکەی نەمێنێ، ئینجا ده ئایەتەکەی کۆتایی سورەتی (آل عمران)ی خوێندو ئینجا هەستا دەست نوێژی گرت له کوندەیە که هەڵواسرا بوو، دەست نوێژێکی تێرو تەواوی گرت و ئینجا هەستاو دەستی کرد به نوێژ کردن. ئیبن عەباس ئەفەرموێ: منیش هەستام بەو جۆرەی ئەو دەست نوێژم گرت و ئینجا وەستام لای چەپیەوه، دەستی راستی نایه سەرم و گوێی راستمی به پەنجه گرت. (فصلى ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم ركعتين، ثم أوتر. ثم أضطجع حتى أتاه

المؤذن فقام فصلى ركعتين خفيفتين، ثم خرج فصلى الصبح ) ئينجا به دوو دوو دوانزه ركات نوێژی کرد، ئینجا نوێژی وەتری کرد بە یەک رکات یان سێ. ئینجا راکشا هەتا بانگ بێژ بانگی داو هەستا دوو رکاتی خەفیفی کردو ئینجا لە حوجرەکەی دەرچوو بۆ مزگەوت و نوێژی بەیانی کرد لەگەڵ یارەکانی.

لە بارەی پەیوەندی ئەم حەدیسە بە بابەکەوە گوتراوە کەراکشان لەگەڵ خێزاندا هۆی دەست لێ کەوتنەو دەست نوێژ شکان. ئەم وەڵامە جێگەی لێکۆڵینەوەیە. بە هەرحاڵ ئیمامی بوخاری هەر حەدیسێکی دەست کەوتبێ بە پێی مەرجەکەی خۆی هێناویەتی.

لەم حەدیسەوە چەند شتێک وەرئەگیرێ:

١) گرنگی شەو نوێژ.

٢) شەو نوێژ دوو دووە.

٣) خوێندنی دە ئایەتەکەی ئاخیری (آل عمران) سوننەتە کاتی خەبەر بوونەوەو هەڵسان لە خەو.

٤)خوێندنی قورئان بە بێ دەست نوێژ شەرعییە.

*** *** ***

## ٣٧ـ بَابُ مَنْ لَمْ يَتَوَضَّأْ إِلاَّ مِنَ الْغَشْيِ الْمُثْقِلِ

١٨٤ـ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنْ هِشَامِ بنِ عُرْوَةَ عَنِ امْرَأَتِهِ فَاطِمَةَ عَنْ جَدَّتِهَا أَسْمَاءَ بِنْتَ أَبِي بَكْرٍ أَنَّهَا قَالَتْ: أَتَيْتُ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ خَسَفَتِ الشَّمْسُ، فَإِذَا النَّاسُ قِيَامٌ يُصَلُّونَ، وَإِذَا هِيَ قَائِمَةٌ تُصَلِّي فَقُلْتُ: مَا لِلنَّاسِ؟ فَأَشَارَتْ بِيَدِهَا نَحْوَ السَّمَاءِ وَقَالَتْ: سُبْحَانَ اللهِ. فَقُلْتُ آيَةٌ؟ فَأَشَارَتْ أَيْ نَعَمْ. فَقُمْتُ حَتَّى تَجَلاَّنِي الْغَشْيُ، وَجَعَلْتُ أَصُبُّ فَوْقَ رَأْسِي مَاءً. فَلَمَّا انْصَرَفَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَمِدَ اللهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْ شَيْءٍ كُنْتُ لَمْ أَرَهُ إِلاَّ قَدْ رَأَيْتُهُ فِي مَقَامِي هَذَا حَتَّى الْجَنَّةَ وَالنَّارَ، وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّكُمْ تُفْتَنُونَ فِي الْقُبُورِ مِثْلَ -أَوْ قَرِيبًا مِنْ- فِتْنَةِ الدَّجَّالِ (لاَ أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ) يُؤْتَى أَحَدُكُمْ فَيُقَالُ: مَا عِلْمُكَ بِهَذَا الرَّجُلِ؟ فَأَمَّا الْمُؤْمِنُ (أَوِ الْمُوقِنُ، لاَ أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ) فَيَقُولُ: هُوَ مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللهِ، جَاءَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَالْهُدَى، فَأَجَبْنَا وَآمَنَّا وَاتَّبَعْنَا.

فَيُقَالُ: نَمْ صَالِحًا، فَقَدْ عَلِمْنَا إِنْ كُنْتَ لَمُؤْمِنًا. أَمَّا الْمُنَافِقُ (أَوِ الْمُرْتَابُ، لاَ أَدْرِي أَيَّ ذَلِكَ قَالَتْ أَسْمَاءُ) يَقُولُ لاَ أَدْرِي سَمِعْتُ النَّاسَ يَقُولُونَ شَيْئًا فَقُلْتُهُ.

(باب من لم يتوضأ إلا من الغشي المثقل) ئەمە بابی ئەوەیە کە دەست نوێژ ناشکێ بە خەوی تەواو نەبێ. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەسمای کچی ئەبوبەکرەوە -خوایان لێ رازی بێت- (أنها قالت: أتيت عائشة زوج النبيﷺ حين خسفت الشمس، فإذا الناس قيام يصلون، و إذا هي قائمة تصلي فقلت: ما للناس؟ فأشارت بيدها نحو السماء وقالت: سبحان الله. فقلت آية؟ فأشارت أي نعم. فقمت حتى تجلاني الغشي، وجعلت أصب فوق رأسي ماء. فلما انصرف رسول اللهﷺ حمد الله وأثنى عليه ثم قال: «ما من شئ كنت لم أره إلا قد رأيته في مقامي هذا حتى الجنة والنار، ولقد أوحى إلي انكم تفتنون في القبور مثل -أو قريبا من- فتنة الدجال (لا أدري أي ذلك قالت أسماء) يؤتى أحدكم فيقال: ما علمك بهذا الرجل؟ فأما المؤمن (أو الموقن، لا أدري أي ذلك قالت أسماء) فيقول: هو محمد رسول الله، جاءنا بالبينات والهدى، فأجبنا و آمنا واتبعنا. فيقال: نم صالحا، فقد علمنا إن كنت لمؤمنا. أما المنافق (أو المرتاب، لا أدري أي ذلك قالت أسماء) يقول لا أدري سمعت الناس يقولون شيئا فقلته) ئەم حەدیسە چەند شتی گرنگی تێدایە کە هەریەکی چەند حوکمێکی لێ وەر دەگیرێ: یەکێ لەوانە مەبەستی بابەکەیە کە دەست نوێژ ناشکێ بە خەوی تەواو نەبێ. ئەسما ، ئەفەرموێ: چووم بۆ لای عائشەی خوشکم لە کاتێکدا خۆر گیرابوو دیتم خەڵکی وەستاون نوێژ دەکەن وە عائشە وەستاوە نوێژ دەکات منیش گوتم چی‌یە خەڵکی ئاوا خەریکن. ئەویش بە دەستی ئیشارەتی کرد بۆ ئاسمان و گوتی (سبحان الله) ئینجا گوتم ئیشانەیەک رووی داوە، گوتی بەڵێ. ئینجا منیش هەستام دەستم کرد بە نوێژ کردن هەتا بێ هۆشی داگیری کردم لەبەر زۆر ماندوو بوون، ئینجا ئاوم کرد بەسەرمدا تا هۆشم بێتەوە، ئینجا کاتێ پێغەمبەرﷺ لێ بوویەوە لە نوێژ سوپاس و سەنای خوای کردو ئینجا فەرموی: هیچ شتێ نی‌یە کە ئەم دیبێ لەمەوپێش مەگەر دیتم لەم شوێنی خۆمەدا تەنانەت بەهەشت و دۆزەخ. وە وەحیم بۆ کرا کە ئێوە تاقی ئەکرێنەوە لە گۆڕەکانتاندا بە وێنەی تاقی کردنەوەتان بە دەجال. هەرکام لە ئێوە ئەهێنرێ و پێی ئەگوترێ چی دەزانی لە بارەی ئەم

پیاوەوە؟ ئەوەی کە باوەڕدار بووە ئەڵێ ئەوە محمدەو پێغەمبەری خوایەو هات بۆ لامان بە موعجیزەی زۆرو بە ڕێنموونی و ڕێگە نیشاندان ئێمەش باوەڕمان پێ هێناو شوێنی کەوتین، ئینجا بەو ئیمانداره ئەگوترێ بە خۆشی بخەوەو ئێمە دەمانزانی تۆ ئیمانداری. ئەوەی بێ باوەڕو ناپاک یان گوماندار بووبێ ئەڵێ: نازانم خەڵکی شتێکیان ئەگوت منیش دەمگوت.

پەیوەندی ئەم حەدیسە بە بابەکەوە کردەوەکەی ئەسمانە. لە بابی عیلمدا هەندێ لە باسەکانی ئەم حەدیسە پێشکەوت و لەمەوپاش لە کیتابی نوێژی خۆرگیراندا هێندێ تر دێت.

*** *** ***

## ٣٨- بَابُ مَسْحِ الرَّأْسِ كُلِّهِ

لِقَوْلِ اللّٰهِ تَعَالَى: ﴿وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ﴾ (المائدة:٦) وَقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: الْمَرْأَةُ بِمَنْزِلَةِ الرَّجُلِ تَمْسَحُ عَلَى رَأْسِهَا

وَسُئِلَ مَالِكٌ: أَيُجْزِئُ أَنْ يَمْسَحَ بَعْضَ الرَّأْسِ؟ فَاحْتَجَّ بِحَدِيثِ عَبْدِاللّٰهِ بنِ زَيْدٍ.

١٨٥- حَدَّثَنَا عَبْدُاللّٰهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ عَمْرِو بنِ يَحْيَى الْمَازِنِيِّ عَنْ أَبِيهِ أَنَّ رَجُلاً قَالَ: لِعَبْدِاللّٰهِ بنِ زَيْدٍ -وَهُوَ جَدُّ عَمْرِو بنِ يَحْيَى- أَتَسْتَطِيعُ أَنْ تُرِيَنِي كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ عَبْدُاللّٰهِ بنُ زَيْدٍ: نَعَمْ. فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاثًا، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثًا، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ: بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ حَتَّى ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ.

(باب مسح الرأس كله) ئەمە بابی مەسح کردنی هەموو سەرە لە دەست نوێژ گرتندا.

(لقول الله تعالى: ﴿وامسحوا برءوسكم﴾ (المائدة:٦)) وا دەرئەکەوێ ئیمامی بوخاری لای وایە (ب) زیادەیەو ئەو کاتە ئایەتەکە وا ئەگەیەنێ مەسحی هەموو سەرتان بکەن، وەک ئیمامی مالیک لەسەر ئەوەیە. بەڵام حەدیسی زۆر هەیە وا ئەگەیەنێ مەسحی هەموو سەر پێویست نییە، بەڵکو هەر ئەندازەیە بەسە وەک ئیمامی شافیعی لەسەر ئەوەیەو وشەی مسح موطلەقە وئەصل وایە (ب) زیاد نەبێ و کەواتە ئەویش بەڵگەیە لەسەر ئەوە هەر ئەندازەیەک بەسە. (وقال ابن مسيب: المرأة بمنزلة الرجل تمسح على رأسها)

ئیبنولموسەییەب ئەفەرموێ: ئافرەتیش وەک پیاو ئەبێ مەسحی هەموو سەری بکات (وسئل مالك: أيجزي أن يمسح بعض الرأس؟ فاحتج بحديث عبدالله بن زيد) پرسیار کرا لە ئیمامی مالیک ئایامەسحی هەندێ لەسەر بەسە. ئەویش ئەم حەدیسی عبداللەی کوڕی زەیدەی کرد بە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەبێ هەموو سەر مەسح بکرێ (أن رجلا قال: لعبدالله بن زيد -وهو جد عمرو بن يحيى- أتستطيع أن تريني كيف كان رسول الله ﷺ يتوضأ؟ فقال عبدالله بن زيد: نعم) پیاوێک پرسیاری کرد لە عبدالله ئایا دەتوانی نیشانم بدەیت کە پێغەمبەر ﷺ چۆن دەست نوێژی ئەگرت؟ ئەویش گوتی: بەڵێ. (فدعا بماء فأفرغ على يديه فغسل مرتين، ثم مضمض واستنثر ثلاثا، ثم غسل وجهه ثلاثا، ثم غسل يديه مرتين مرتين إلى المرفقين، ثم مسح رأسه بيديه فأقبل بهما وأدبر: بدأ بمقدم برأسه حتى ذهب بهما إلى قفاه، ثم ردهما إلى المكان الذي بدأ منه، ثم غسل رجليه).

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٨٦، ١٩١، ١٩٢، ١٩٧، ١٩٩)دا دووبارە بووەتەوە.

***　***　***

## ٣٩ـ بَابُ غَسْلِ الرِّجْلَيْنِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ

١٨٦ـ حَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ عَنْ عَمْرٍو عَنْ أَبِيهِ قَالَ: شَهِدْتُ عَمْرَو بْنَ أَبِي حَسَنٍ سَأَلَ عَبْدَاللهِ بْنَ زَيْدٍ عَنْ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ فَتَوَضَّأَ لَهُمْ وُضُوءَ النَّبِيِّ ﷺ: فَأَكْفَأَ عَلَى يَدِهِ مِنَ التَّوْرِ فَغَسَلَ يَدَيْهِ ثَلاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي التَّوْرِ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاثَ غَرَفَاتٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثًا ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَمَسَحَ رَأْسَهُ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ مَرَّةً وَاحِدَةً، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ.

(باب غسل الرجلين إلى الكعبين) لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە عەمری کوڕی أبو الحسن کە (سأل عبدالله بن زيد عن وضوء النبي ﷺ) کە پرسیاری کرد لە زەید لەبارەی دەست نوێژ گرتنی پێغەمبەرەوە ﷺ (فدعا بتور من ماء فتوضأ لهم وضوء النبي ﷺ: فأكفأ

على يده من التور فغسل يديه ثلاثا ،ثم أدخل يده في التور فمضمض واستنشق واستنثر ثلاث غرفات ،ثم أدخل يده فغسل وجهه ثلاثا ثم غسل يديه مرتين إلى المرفقين ثم أدخل يده فمسح رأسه فأقبل بهما و أدبر مرة واحدة، ثم غسل رجليه إلى الكعبين) لەم حەدیسە وەرنەگیرێ پێویست نی‌یە هەموو ئەندامەکانی دەست نوێژ سێ جار بن، بەڵکو مەسحی سەر یەک جار بەسە ئەگەرچی لە حەدیسی ترەوە وەردەگیرێ کە باشترە هەموو ئەندامەکانی دەست نوێژ لە شۆرین و مەسحدا سێ جار سێ جار بن، کەواتە ئەو حەدیسانە کە وا نەگەیەنن وەک ئەم حەدیسی نێرە ئەوە بۆ ئەوەیە کە ئەمیش دروستە.

***　　***　　***

## ٤٠- بَابُ اسْتِعْمَالِ فَضْلِ وَضُوءِ النَّاسِ

## وَأَمَرَ جَرِيرُ بنُ عَبْدِاللهِ أَهْلَهُ أَنْ يَتَوَضَّئُوا بِفَضْلِ سِوَاكِهِ

١٨٧- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ حَدَّثَنَا الْحَكَمُ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا جُحَيْفَةَ يَقُولُ: خَرَجَ عَلَيْنَا رَسُول اللهِﷺ بِالْهَاجِرَةِ فَأُتِيَ بِوَضُوءٍ فَتَوَضَّأَ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَأْخُذُونَ مِنْ فَضْلِ وَضُوئِهِ فَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ فَصَلَّى النَّبِيُّﷺ الظُّهْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَالْعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ، وَبَيْنَ يَدَيْهِ عَنَزَةٌ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٧٦، ٤٩٥، ٤٩٩، ٥٠١، ٦٣٣، ٦٣٤، ٣٥٥٣، ٣٥٦٦، ٥٧٨٦، ٥٨٥٩)دا دووبارە بووەتەوە.

١٨٨- وَقَالَ أَبُو مُوسَى: دَعَا النَّبِيُّﷺ بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ فِيهِ، وَمَجَّ فِيهِ، ثُمَّ قَالَ لَهُمَا: «اشْرَبَا مِنْهُ، وَأَفْرِغَا عَلَى وُجُوهِكُمَا وَنُحُورِكُمَا».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٩٦، ٤٣٢٨)دا دووبارە بووەتەوە.

١٨٩- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بنُ عَبْدِاللهِ قَالَ حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بنُ إِبْرَاهِيمَ بنِ سَعْدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبِي عَنْ صَالِحٍ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي مَحْمُودُ بنُ الرَّبِيعِ قَالَ: وَهُوَ الَّذِي مَجَّ رَسُولُ اللهِﷺ فِي وَجْهِهِ وَهُوَ غُلَامٌ مِنْ بِئْرِهِمْ. وَقَالَ عُرْوَةُ عَنِ الْمِسْوَرِ وَغَيْرِهِ يُصَدِّقُ كُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا صَاحِبَهُ، وَإِذَا تَوَضَّأَ النَّبِيُّﷺ كَادُوا يَقْتَتِلُونَ عَلَى وَضُوئِهِ.

(باب استعمال فضل وضوء الناس) ئەمە بابی ئەوەیە کە بەکارهێنانی ئاوی ماییتەوە

له دەست نوێژ دروستە دەست نوێژی پێ بگیرێ، زۆربەی ئیمامەکان لەسەر ئەمەن. شافیعی لە قولی قەدیمیداو هێندێ لە ئیمامان لەسەر ئەوەن کە ئەو ئاوە پاکەو پاکەوە کەر نی‌یە. وا دەرئەکەوێ ئەو نزاعە لەمەدایە ئاوێ بەکار بهێنرێ لە فەرزدا، بەم رەنگە ئاو بکرێ بە دەم و چاودا عەینی ئەوە بەکار بهێنرێ لە فەرزدا نەک ئەمەی کە لە حەدیسەکەدایە کە ئەمەتە بە مشت ئاو هەڵگۆزێ لە زەرفێک و لە پاشان ئەوەی ماوەتەوە لە زەرفەکەدا دەست نوێژی پێ بگرێ، ئەمە نابێ جێگای خیلاف بێت و بە بێ خیلاف دروستە (وأمر جرير بن عبدالله أهله أن يتوضئوا بفضل سواكه) جەریر فەرمانی دا بە ماڵ و خێزانی کە دەست نوێژ بگرن بەو ئاوەی کە سیواکی پێ کردووە، واتە سیواکەکەی کردووەتە ناو ئەو زەرفەی کە ئاوی تێدا بووە. جا فەرمانی داوە دەست نوێژ بگرن لەو ئاوە.

ئینجا لێرەدا رەخنە گیراوە لە ئیمامی بوخاری لەوەی کە ئەم کاری جەریرە پەیوەندی نی‌یە بە بابەکەوە. وە بە دوو وەڵام دراوەتەوە وەک لە (فتح الباری)دا هاتووە با سەرنج بدرێ، چونکە بە پێی تێگەیشتنی من هەردوو لاوازە.

ئینجا ئەم حەدیسە لەرێگەی خۆیەوە ئەهێنێ لە ئەبو جوحەیفەوە کە (يقول: خرج علينا رسول اللهﷺ بالهاجرة فأتي بوضوء فتوضأ، فجعل الناس يأخذون من فضل وضوئه فيتمسحون به) پێغەمبەرﷺ جارێک لە شیددەتی گەرمادا هاتە ناومان ئینجا ئاویان بۆ هێناو دەست نوێژی پێ گرت، خەڵکی ئەوەی مابوویەوە لە دەست نوێژەکەی هێنایان مەسحی سەرو چاو و ملی خۆیانیان پێ کرد (فصلى النبيﷺ الظهر ركعتين، والعصر ركعتين، وبين يديه عنزة) قەسرو جەمعی کردو عەنزەی کرد بە سیترە، چونکە لە دەشت و سەحرادا بووە.

ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی قەسرو جەمع لە سەفەردا سوننەتە، هەروەها دانانی سیترەیش، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە تەبەرک کردن شتێکی شەرعی‌یە.

ئینجا ئەم تەعلیقەش ئەهێنێ لە ئەبو موسای ئەشعەری‌یەوە ئەفەرموێ: (وقال أبو موسى: دعا النبيﷺ بقدح فيه ماء فغسل يديه ووجهه فيه، ومج فيه، ثم قال لهما: اشربا منه، وأفرغا على وجوهكما ونحوركما) پێغەمبەرﷺ داوای پیاڵەیەکی کرد کە ئاوی تێدا بوو، ئینجا دەست و دەم و چاوی تێدا شۆردو ئاوی دەمی خۆی تێ کردو ئینجا فەرمووی بە ئەبو موساو بیلال لێی بخۆنەوەو بیکەن بەسەر دەم و چاوو گەردن و ملیاندا. ئەم

ئەسەرەش دڵنیایی دا لەسەر راستی تەبەڕک کردن.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە محمودی کوڕی رەبیعەوە کە ئەوە بوو پێغەمبەرﷺ ئاوی دەمی موبارەکی کرد بەسەرو چاویداو ئەو ئاوە لە ئاوی بیری خانەوادەی محمود بوو (وقال عروة عن المسور وغيره يصدق كل واحد منهما صاحبه، و إذا توضأ النبيﷺ كادوا يقتتلون على وضوئه) کاتێ پێغەمبەرﷺ دەست نوێژی بگرتایە خەڵکی پەلاماریان ئەدا ئاوی دەست نوێژەکەی بە جۆرێ نزیک بوو ببێتە شەڕیان لەسەر ئەوەکە بۆ تەبەڕک پێ کردنی.

***　　***　　***

## بَابٌ

١٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُالرَّحْمَنِ بنِ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا حَاتِمُ بنُ إِسْمَاعِيلَ عَنِ الْجَعْدِ قَالَ: سَمِعْتُ السَّائِبَ بنَ يَزِيدَ يَقُولُ: ذَهَبَتْ بِي خَالَتِي إِلَى النَّبِيِّﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ ابْنَ أُخْتِي وَقِعٌ، فَمَسَحَ رَأْسِي وَدَعَا لِي بِالْبَرَكَةِ. ثُمَّ تَوَضَّأَ فَشَرِبْتُ مِنْ وَضُوئِهِ، ثُمَّ قُمْتُ خَلْفَ ظَهْرِهِ فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ مِثْلَ زِرِّ الْحَجَلَةِ.

(باب) لەم بابەدا حەدیسێ ئەهێنێ لە جەعدەوە کە (قال: سمعت السائب بن يزيد يقول: ذهبت بي خالتي إلى النبيﷺ فقالت: يا رسول الله إن ابن أختي وقع، فمسح رأسي و دعا لي بالبركة. ثم توضأ فشربت من وضوئه) ئەڵێ پورم بردمی بۆ لای پێغەمبەرﷺ عەرزی کرد ئەم خوشکەزامە دووچاری ئێشێک بووە، ئەویش دەستی هێنا بەسەرمداو دۆعای بۆ کردم، ئینجا دەست نوێژی گرت و منیش لە ئاوی دەست نوێژەکەیم خواردەوە، ئەو ئاوەی کە لە دەمی موبارەکی ئەچۆڕا.

ئەو وتەیە مەبەستە لێرەدا کە بەڵگەیە لەسەر ئەوە ئاوی بەکارهێنراوە لە دەست نوێژدا (ثم قمت خلف ظهره فنظرت إلى خاتم النبوة بين كتفيه مثل زر الحجلة) ئینجا هەستام لە پشتی‌یەوە سەرنجی مۆرێکم دا لە نێوان هەردوو شانیدا بە شێوەیەک وەک بەوە تەفسیر کراوەتەوە هێندێ تەفسیریان کردووەتەوە بە وێنەی خانوویەکی رازاوە بە ئەسبابی جۆر بە جۆری زینەت.

پەیوەندی ئەم حەدیسە لەم بارەیەوە ئاشکرایە کە ئاوی دەست نوێژەکەی خواردووەتەوە.

بە وێنەی زۆر لە حەدیسەکانی تر پەیوەندی‌یان هەیە بە چەند بابێکی ترەوەو بەڵگەن بۆیان.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٥٤٠، ٣٥٤١، ٥٦٧٠، ٦٣٥٢)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٤١ـ بَابُ مَنْ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ غَرْفَةٍ وَاحِدَةٍ

١٩١ـ حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا خَالِدُ بنُ عَبْدِاللهِ قَالَ حَدَّثَنَا عَمْرو بنُ يَحْيى عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ زَيْدٍ أَنَّهُ أَفْرَغَ مِنَ الإِنَاءِ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ غَسَلَ أَوْ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ مِنْ كَفَّةٍ وَاحِدَةٍ فَفَعَلَ ذَلِكَ ثَلاثًا، فَغَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ مَا أَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا وُضُوءُ رَسُولِ اللهِ ﷺ.

(باب من مضمض واستنشق من غرفة واحدة) ئەمە بابی ئەوەیە بە یەک لاله وێچ ئاو لە دم لوت رادان سوننەت و شەرعی‌یە، لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عبداللەی کوڕی زەیدی ئەنساری‌یەوە (أنه أفرغ من الإناء على يديه فغسلهما، ثم غسل أو مضمض واستنشق من كفة واحدة ففعل ذلك ثلاثا، فغسل يديه إلى المرفقين مرتين مرتين، ومسح برأسه ما أقبل و أدبر، وغسل رجليه إلى الكعبين، ثم قال: هكذا وضوء رسول الله ﷺ) ئەم ئەسەرەیشی هێنا بۆ بەهێزکردنی ئەوەی کە لە حەدیسەکەدا هات، ئەم حەدیس و ئەسەرە دژی جۆرەکانی تری دەست نوێژ گرتنەکانی پێغەمبەری خۆشەویست نی‌یە، چونکە ناڵێت دەست نوێژگرتنی ئەو هەر بەم جۆرە بووە، بەڵکو ئەمان ئاگایە لەم شێوەیە هەیە کە دیتویانە. وەک لە بابی دواییدا ئەم جۆرە ئەهێنێ.

*** *** ***

## ٤٢ـ بَابُ مَسْحِ الرَّأْسِ مَرَّةً

١٩٢ـ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بنُ حَرْبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بنُ يَحْيَى عَنْ أَبِيهِ قَالَ: شَهِدْتُ عَمْرُو بنَ أَبِي حَسَنٍ سَأَلَ عَبْدَاللهِ بنَ زَيْدٍ عَنْ وُضُوءِ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ فَتَوَضَّأَ لَهُمْ، فَكَفَأَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلاثًا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاثًا بِثَلاثِ غَرَفَاتٍ مِنْ مَاءٍ ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثًا،

ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَغَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ فَأَقْبَلَ بِيَدِهِ وَأَدْبَرَ بِهِمَا ،ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ.

وَحَدَّثَنَا مُوسَى قَالَ: حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ قَالَ: مَسَحَ رَأْسَهُ مَرَّةً.

(باب مسح الرأس مرة) ئەمە بابی ئەوەیە کە مەسحی سەر یەک جار بکرێ وە لەم بارەیەوە وتنەی حەدیسی پێشوو ئەهێنێ لە زەیدی کوڕی عبداللەی ئەنصاری و ئەمەی تێدایە لە ریوایەتی وەهیبدا (قال مسح رأسه مرة) یەک جار مەسحی سەری کرد.

حەدیسەکانی سەحیحی بوخاری و موسلیم باسی ژمارەی مەسحیان تێدا نییەو زۆربەی زانایانیش لەسەر ئەوەن. بەڵێ لە حەدیسی ئیمامی عوسماندا هەیە کە مەسحی سێ بارە کردووەتەوەو بۆ نەهێشتنی دژایەتی نێوان حەدیسەکان چاک وایە بڵێین هەموو جۆرەکانی بووەو هەموو شەرعین.

*** *** ***

## ٤٣- بَابُ وُضُوءِ الرَّجُلِ مَعَ امْرَأَتِه

## وَفَضْلِ وَضُوءِ الْمَرْأَةِ وَتَوَضَّأَ عُمَرُ بِالْحَمِيمِ، وَمِنْ بَيْتِ نَصْرَانِيَّةٍ

١٩٣- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ نَافِعٍ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الرِّجَالُ وَالنِّسَاءُ يَتَوَضَّؤُونَ فِي زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ جَمِيعًا.

(باب وضوء الرجل مع امرأته) ئەمە بابی دەست نوێژ گرتنی پیاوە لەگەڵ ژنەکەیدا (وفضل وضوء المرأة) وە بابی ئەو ئاوەیە کە لە زەرفەکەدا مابێتەوە لە پاش لێ بوونەوەی ئافرەتەکە (وتوضأ عمر بالحميم، ومن بيت نصرانية) بابی ئەوەیشە کە عمری فاروق دەست نوێژی گرتووە بە ئاوی گەرم و دەست نوێژی گرتووە لە ئاوی ماڵی ئافرەتێکی نەسرانی. ئەمانەش حوکمی شەرعیان لێ وەرئەگیرێ، بەڵام پەیوەندیان بە بابەکەوە نییە مەگەر بە شێوەیەکی گشتی کە باسی دەست نوێژ گرتنە بە ئاو وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عومەرەوە -خوا لێیان رازی بێت- کە ئەفەرموێ: (كان الرجال والنساء يتوضؤون في زمان رسول الله ﷺ جميعا) پیاوان و ئافرەتان لە چەرخی پێغەمبەردا ﷺ دەست نوێژیان ئەگرت پێکەوە، بێگومان یان ئەبێ مەبەست پیاوو ئافرەتانی مەحرەم بێت یان ئەمە پێش

هاتنه خوارەوە ئایەتی حیجابە. بەڵام لەبەر ئەوەی شێوەکان گشتی نیشان ئەدا هەر مەبەست پیاو و ئافرەتانی مەحرەمە.

***        ***        ***

## ٤٤ـ بَابُ صَبِّ النَّبِيِّ ﷺ وَضُوءَهُ عَلَى الْمُغْمَى عَلَيْهِ

١٩٤ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِراً يَقُولُ: جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي وَأَنَا مَرِيضٌ لاَ أَعْقِلُ فَتَوَضَّأَ وَصَبَّ عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ، فَعَقَلْتُ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لِمَنِ الْمِيرَاثُ، إِنَّمَا يَرِثُنِي كَلاَلَةٌ؟ فَنَزَلَتْ آيَةُ الْفَرَائِضِ.

(باب صب النبي ﷺ وضوءه على المغمى عليه) ئەمە بابی ئەوەیە کە ئاوی دەست نوێژی پێغەمبەر ﷺ کرا بەسەر بێ هۆشێکدا، لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە جابری کوڕی عبداللەوە کە (یقول: جاء رسول اللە ﷺ یعودني وأنا مریض لا أعقل فتوضأ وصب علي من وضوئه، فعقلت. فقلت: یا رسول اللە لمن المیراث، إنما یرثني کلالة؟ فنزلت آیة الفرائض) لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە تەبەڕک کردن شتێکی شەرعی‌یەو ئەبێ بە هۆی شیفا تا ئەو رادەی جابر هاتەوە هۆش ئەو پرسیارە شەرعی‌یەی کرد. هەندێ کەس باوەڕیان بە تەبەڕک کردن نی‌یە تا ئەو رادەیەی بە شیرکی دائەنێن، بەڵام ئەوە هەڵەیەکی گەورەیەو حەدیسی سەحیحی زۆری پێ هاتووە. بەڵام خەریکم بڵێم ئەوەی ئەوانە ئەڵێن ناهەقیان نی‌یە، چونکە زۆر زۆر لە ئەفامان ئەو تەبەڕک پێ کراوە ئەکەن بە مونەسرو کارەکە لەو دەناسن، دیار ئەوەش جۆرێکە لە شیرک. کەواتە ئەو کەسەی تەبەڕک ئەکات ئەبێ بزانێ و ئیمانی تەواوی هەبێ کە تەئسیرو کارکردن هەر بە دەست خوایەو ئەم جۆرە شتانە لە شەرعدا پێیان ئەگوترێ ئەسبابی عادی، واتە عادەتی خوا وا هاتووە کە لە کاتی بەکارهێنانی ئەو ئەسبابانەدا ئەگەر خوا مەیلی بێ ئەو کارانە فەراهەم ئەهێنێ، ئەگەر مەیلی نەبوو ئەوە هیچ. بۆ نموونە ئاگر هۆی سووتانەو تیغ هۆی بڕینە، بەڵام ئەگەر خوا مەیلی نەبوو نە ئاگر و نە تیغ کار ناکەن وەک ئاگر و تیغەکەی حەزرەتی ئیبراهیم، وە هەروەها هەرچی ئەسبابەکانی تریش.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٥٧٧، ٥٦٥١، ٥٦٦٤، ٥٦٧٦، ٦٧٢٣، ٦٧٤٣،

٧٣٠٩)دا دووباره بووه‌ته‌وه.

*** *** ***

## ٤٥ـ بَابُ الْغُسْلِ وَالْوُضُوءِ فِي الْمِخْضَبِ وَالْقَدَحِ وَالْخَشَبِ وَالْحِجَارَةِ

١٩٥ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مُنِيرٍ سَمِعَ عَبْدَاللهِ بنَ بَكْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: حَضَرَتِ الصَّلاَةُ، فَقَامَ مَنْ كَانَ قَرِيبَ الدَّارِ إِلَى أَهْلِهِ، وَبَقِيَ قَوْمٌ، فَأُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِمِخْضَبٍ مِنْ حِجَارَةٍ فِيهِ مَاءٌ، فَصَغُرَ الْمِخْضَبُ أَنْ يَبْسُطَ فِيهِ كَفَّهُ، فَتَوَضَّأَ الْقَوْمُ كُلُّهُمْ. قُلْنَا: كَمْ كُنْتُمْ؟ قَالَ: ثَمَانِينَ وَ زِيَادَةً.

١٩٦ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ الْعَلاَءِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ عَنْ بُرَيْدٍ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِي مُوسَى أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَعَا بِقَدَحٍ فِيهِ مَاءٌ فَغَسَلَ يَدَيْهِ وَوَجْهَهُ فِيهِ وَمَجَّ فِيهِ.

١٩٧ـ حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بنُ يُونُسَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالعَزِيزِ بنُ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ حَدَّثَنَا عَمْرُو ابنُ يَحْيَى عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ زَيْدٍ قَالَ: أَتَى رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَأَخْرَجْنَا لَهُ مَاءً فِي تَوْرٍ مِنْ صُفْرٍ، فَتَوَضَّأَ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاَثًا، وَيَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، وَمَسَحَ بِرَأْسِهِ فَأَقْبَلَ وَأَدْبَرَ، وَغَسَلَ رِجْلَيْهِ.

١٩٨ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ أَخْبَرَنِي عُبَيْدُاللهِ بنُ عَبْدِاللهِ بنِ عُتْبَةَ أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ: لَمَّا ثَقُلَ النَّبِيُّ ﷺ وَاشْتَدَّ بِهِ وَجَعُهُ اسْتَأْذَنَ أَزْوَاجَهُ فِي أَنْ يُمَرَّضَ فِي بَيْتِي، فَأَذِنَّ لَهُ. فَخَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَ رَجُلَيْنِ تَخُطُّ رِجْلاَهُ فِي الأَرْضِ: بَيْنَ عَبَّاسٍ وَرَجُلٍ آخَرَ -قَالَ عُبَيْدُاللهِ: فَأَخْبَرْتُ عَبْدَاللهِ بنَ عَبَّاسٍ فَقَالَ: أَتَدْرِي مَنِ الرَّجُلُ الآخَرُ؟ قُلْتُ: لاَ. قَالَ: هُوَ عَلِيٌّ- وَكَانَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا تُحَدِّثُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: بَعْدَ مَا دَخَلَ بَيْتَهُ وَاشْتَدَّ وَجَعُهُ: «هَرِيقُوا عَلَيَّ مِنْ سَبْعِ قِرَبٍ لَمْ تُحْلَلْ أَوْكِيَتُهُنَّ، لَعَلِّي أَعْهَدُ إِلَى النَّاسِ». وَأُجْلِسَ فِي مِخْضَبٍ لِحَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ طَفِقْنَا نَصُبُّ عَلَيْهِ تِلْكَ حَتَّى طَفِقَ يُشِيرُ إِلَيْنَا أَنْ قَدْ فَعَلْتُنَّ. ثُمَّ خَرَجَ إِلَى النَّاسِ.

ئه‌م حه‌دیسه‌ له‌ ژماره‌كانی: (٦٤٤، ٦٦٥، ٦٧٩، ٦٨٣، ٦٨٧، ٧١٢، ٧١٣، ٧١٦، ٢٥٨٨، ٣٠٩٩، ٣٣٨٤، ٤٤٤٢، ٤٤٤٥، ٥٧٤١، ٧٣٠٣)دا دووباره بووه‌ته‌وه.

(باب الغسل والوضوء في المخضب) ئەمە بابی خۆ شۆرین و دەست نوێژ گرتنە لە تەشت و کاسەو تەشپی کە ئامادە ئەکرێن بۆ ئەوە، هەروەها شتی تر وەک ئەفەرموێ: (والقدح والخشب والحجارة) لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە کە (قال:حضرت الصلاة) ئەڵێ نوێژ هاتە پێشەوە، واتە نوێژی عەسر وەک زانایان فەرمویانە (فقام من كان قريب الدار إلى أهله) ئینجا ئەو کەسەی کەماڵی نزیک بوو ڕۆشت بۆ ماڵی خۆی بۆ دەست نوێژ گرتن (وبقي قوم) وە کۆمەڵێک مانەوە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ (فأتي رسول الله ﷺ بمخضب من حجارة فيه ماء، فصغر المخضب أن يبسط فيه كفه، فتوضأ القوم كلهم. قلنا: كم كنتم؟ قال: ثمانين و زيادة) ئینجا زەرفێکیان بۆ هێنا کە بچووک تر بوو لەوەی دەستی تێ بخا، ئینجا هەموو دەست نوێژیان گرت لەو ئاوە کەمە ئێمەش گوتمان چەند کەس بوون، ئەویش گوتی هەشتاو زیاتر.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە کە (أن النبي ﷺ دعا بقدح فيه ماء فغسل يديه ووجهه فيه ومج فيه) پێغەمبەر ﷺ داوای زەرفێکی کرد کە ئاوی تێدا بوو، ئینجا هەردوو دەستی و دەم چاوی تێ شۆردو ئاوی دەمی موبارەکی تێ کرد.

ئەمە هیچ ناگەیەنێ لە دەست نوێژ گرتن بەو ئاوە،بەڵام بە قەرینەی حەدیسە پێشووەکاندا دەست نوێژی گرتووە. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە عبداللەی کوڕی زەیدی ئەنساریەوە کە (قال: أتى رسول الله ﷺ، فأخرجنا له ماء في تور من صفر، فتوضأ، فغسل وجهه ثلاثا، ويديه ثلاثا، ويديه مرتين مرتين، ومسح برأسه فأقبل وأدبر، وغسل رجليه) وێنەی ئەم حەدیسە دوو جاری تر تێپەڕی کردو جیاوازی لە دوو سێ وتەدا هەیە، کەواتە فائیدەکەی زیادە بەهێز کردنی ئەو جۆرە دەست نوێژ گرتنەیە کە لەم حەدیسانەدا هاتووە، لەم حەدیسەدا وتەی (من صفر) مصریە، کە لەوانی تردا نەبووە.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیماندارانەوە عائشە -خوای لێ ڕازی بێت- ئەفەرموێ: (لما ثقل النبي ﷺ واشتد به وجعه استأذن أزواجه في أن يمرض في بيتي، فأذن له. فخرج النبي ﷺ بين رجلين تخط رجلاه في الأرض: بين عباس و رجل آخر -قال عبيدالله: فأخبرت عبدالله بن عباس فقال: أتدري من الرجل الآخر؟ قلت: لا. قال: هو

علي- وكانت عائشة رضي الله عنها تحدث أن النبيﷺ قال: بعد ما دخل بيته و اشتده وجعه: «هريقوا علي من سبع قرب لم تحلل أوكسيتهن، لعلي أعهد إلى الناس». وأجلس في مخضب لحفصة زوج النبيﷺ ثم طفقا نصب عليه تلك حتى طفق يشير إلينا أن قد فعلتن. ثم خرج إلى الناس) كاتێ كە پێغەمبەرﷺ نەخۆشییەكەی بەتین بوو ئیزنی خواست لە حەرەمەكانی كە خزمەتی بكرێ لەو نەخۆشییەدا لە ماڵی منداو ئەوانیش ئیزنیان دا، ئینجا پێغەمبەرﷺ كە لە ماڵی میمونەدا بوو دەرچوو بێت بۆ ماڵی من، دەرچوو لە نێوان دوو پیاودا پێكانی ئەخشان بە زەویدا لە نێوان عەباسی مامی و پیاوێكی تر.

ئینجا لێرەدا عبیدالله كە ئەم حەدیسەی ریوایەت كرد ئەڵێ ئەم قسەم گێرایەوە بۆ عبداللەی كوڕی عباس، ئەویش فەرمووی ئەزانی ئەو پیاوەی ترە كێ بوو، گوتم نەخێر ئەویش فەرمووی: ئەو پیاوەی ترە علی كوڕی ئەبو طالب بوو. ئیتر دایكی ئیمانداران ئەفەرموێ لە پاش ئەوەی هاتە ماڵەكەی ئێمە نەخۆشییەكەی بەتین بوو، فەرمووی: ئاو بكەن بەسەرمدا لە حەوت كونە كە دەرگاو بنەكەیان نەكرابێتەوە لەبەر ئەوەی زۆر پاك و خاوێن بێت، یان لەبەر ئەوەی حەوت بەرەكەتێكی تایبەتی هەیە، زۆر بەكار هێنراوە لە زمانی شەرعدا، داوای ئەوەی كرد بۆ ئەوەی لەشی پیرۆزی سووك ببێ بە بێ زەحمەت بتوانێ فەرمایش بكات بۆ دانیشتوانی مزگەوت بەڵكو وەسیەت بكات بۆیان، ئاوەكە كرا بەسەری پیرۆزیدا لەناو تەشتێكدا كە هینی دایكی ئیمانداران حفصە بوو.

ئینجا ئەفەرموێ: ئێمەش دەستمان كرد بەوە كە فەرمانی پێدا، هەتا دەست نیشانی كرد بەوەی ئەوەی پێویست بوو ئێوە بەجێتان هێنا، واتە بەسە، ئینجا تەشریفی هەڵساو چووە مزگەوت نوێژی كردو وەسیەت و مۆچیاری كردن.

ئەم حەدیسە پەیوەندی روونە بە حەدیسەكانی پێشووەوە وە وەرئەگیرێ كە ریعایەت كردنی نۆبە، واتە تەقسیم پێویستە. لەمەولا لە بابی غەزادا چەند قسەو باسێك هەیە لە بارەی ئەم حەدیسەوە با لەوێ چاوەڕوان بین.

*** *** ***

## ٤٦- بَابُ الْوُضُوءِ مِنَ التَّوْرِ

١٩٩- حَدَّثَنَا خَالِدُ بنُ مَخْلَدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بنُ يَحْيَى عن

أبيه قَالَ: كَانَ عَمِّي يُكْثِرُ مِنَ الْوُضُوءِ، قَالَ لِعَبْدِاللهِ بنِ زَيْدٍ: أَخْبِرْنِي كَيْفَ رَأَيْتَ النبيَّ ﷺ يَتَوَضَّأُ؟ فَدَعَا بِتَوْرٍ مِنْ مَاءٍ فَكَفَأَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثَلَاثَ مِرَارٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فِي التَّوْرِ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ مِنْ غَرْفَةٍ وَاحِدَةٍ، ثُمَّ أَدْخَلَ يَدَهُ فَاغْتَرَفَ بِهَا فَغَسَلَ وَجْهَهُ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ أَخَذَ بِيَدِهِ مَاءً فَمَسَحَ رَأْسَهُ فَأَدْبَرَ بِهِ وَأَقْبَلَ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ فَقَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَتَوَضَّأُ.

٢٠٠- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ ثَابِتٍ عَنْ أَنَسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَعَا بِإِنَاءٍ مِنْ مَاءٍ، فَأُتِيَ بِقَدَحٍ رَحْرَاحٍ فِيهِ شَيْءٌ مِنْ مَاءٍ، فَوَضَعَ أَصَابِعَهُ فِيهِ، قَالَ أَنَسٌ: فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَى الْمَاءِ يَنْبُعُ مِنْ بَيْنِ أَصَابِعِهِ. قَالَ أَنَسٌ فَحَزَرْتُ مَنْ تَوَضَّأَ مَا بَيْنَ السَّبْعِينَ إِلَى الثَّمَانِينَ.

(باب الوضوء من التور) ئینجا ئەم ئەسەرە لە عمری کوڕیەوە ئەویش لە باوکیەوە (قال: كان عمي يكثر من الوضوء، قال لعبدالله بن زيد: أخبرني كيف رأيت النبي ﷺ يتوضأ؟ فدعا بتور من ماء فكفأ على يديه فغسلهما ثلاث مرار، ثم أدخل يده في التور فمضمض واستنثر ثلاث مرات من غرفة واحدة، ثم أدخل يده فاغترف بها فغسل وجهه ثلاث مرات، ثم غسل يديه إلى المرفقين مرتين مرتين، ثم أخذ بيده ماء فمسح رأسة فأدبر و أقبل، ثم غسل رجليه فقال: هكذا رأيت النبي ﷺ يتوضأ) ئەمە یەکێکە لەو پێنج شێوەی دەست نوێژ گرتنە کە تێپەڕیان کرد.

ئینجا حەدیسێ ئەهێنێ لە ئەنەسەوە کە (أن النبي ﷺ دعا بإناء من ماء، فأتي بقدح رحراح فيه شئ من ماء، فوضع أصابعه فيه، قال أنس: فجعلت أنظر إلى الماء ينبع من بين أصابعه. قال: أنس فحرزت من توضأ ما بين السبعين إلي الثمانين) لە ڕیوایەتێکی تردا ١٥٠ کەس لە ڕیوایەتێکی تردا نزیکی ١٠٠ کەس. ئەوانە چەند ڕووداوێکی جیاوازن لە چەند کات و شوێنی جیاوازداو هەرکام موعجیزەیەکن لە موعجیزەکانی ﷺ.

*** *** ***

## ٤٧- بَابُ الْوُضُوءِ بِالْمُدِّ

٢٠١- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا مِسْعَرٌ قَالَ حَدَّثَنِي ابْنُ جَبْرٍ قَالَ سَمِعْتُ أَنَسًا

يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَغْسِلُ -أَوْ كَانَ يَغْتَسِلُ- بِالصَّاعِ إِلَى خَمْسَةِ أَمْدَادٍ، وَيَتَوَضَّأُ بِالْمُدِّ.

(باب الوضوء بالمد) ئینجا لەم بابەدا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لەم بارەیەوە لە ئیبن و جوبەیرەوە کە (قال سمعت أنسا يقول: كان النبي ﷺ يغسل -أو كان يغتسل- بالصاع إلى خمسة أمداد، ويتوضأ بالمد) ئەڵێ بیستم لە ئەنەس کە ئەیفەرموو پێغەمبەر ﷺ غوسڵی ئەکرد بە صاعێک کە چوار مشتە تا پێنج وە دەست نوێژی ئەگرت بە مشتێ کەواتە سوننەتە ناوی غوسڵ کەمتر نەبێ لە چوار مشت و ناوی دەست نوێژ لە مشتێ.

ئەمە دەقی حەدیسی سەحیحی بوخاری‌یەو دەقی زانایانی ئیسلامیشە. بەڵام بەداخەوە ئێمە بە دە مشت دەست نوێژمان بۆ ناگیرێ چ جای غوسڵ!

ئینجا وشەی (أو كان يغتسل) لەگەڵ (يغسل) هەر یەک مەبەستەو راوی حەدیسەکە دوو دڵ بووە لە نێوان ئەو دوو وتەیەدا.

*** *** ***

## ٤٨- بَابُ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفَّيْنِ

٢٠٢- حَدَّثَنَا أَصْبَغُ بْنُ الْفَرَجِ الْمِصْرِيُّ عَنِ ابْنِ وَهْبٍ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرٌو حَدَّثَنِي أَبُو النَّضْرِ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ مَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ، وَأَنَّ عَبْدَاللهِ بْنَ عُمَرَ سَأَلَ عُمَرَ عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: نَعَمْ، إِذَا حَدَّثَكَ شَيْئًا سَعْدٌ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فَلاَ تَسْأَلْ عَنْهُ غَيْرَهُ.

وَقَالَ مُوسَى بْنُ عُقْبَةَ: أَخْبَرَنِي أَبُو النَّضْرِ أَنَّ أَبَا سَلَمَةَ أَخْبَرَهُ أَنَّ سَعْدًا... فَقَالَ عُمَرُ لِعَبْدِاللهِ نَحْوَهُ.

٢٠٣- حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ خَالِدٍ الْحَرَّانِيُّ قَالَ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ عَنْ سَعْدِ ابْنِ إِبْرَاهِيمَ عَنْ نَافِعِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الْمُغِيرَةِ عَنْ أَبِيهِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ خَرَجَ لِحَاجَتِهِ فَاتَّبَعَهُ الْمُغِيرَةُ بِإِدَاوَةٍ فِيهَا مَاءٌ فَصَبَّ عَلَيْهِ حِينَ فَرَغَ مِنْ حَاجَتِهِ، فَتَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ.

٢٠٤- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا شَيْبَانُ عَنْ يَحْيَى عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ جَعْفَرِ بْنِ عَمْرِو ابْنِ أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى الْخُفَّيْنِ.

وَتَابَعَهُ حَرْبُ بنُ شَدَّادٍ وَأَبَانُ عَنْ يَحيى.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٢٠٥)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٠٥ـ حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُاللهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا الأَوْزَاعِيُّ عَنْ يَحْيَى عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ جَعْفَرَ بنِ عَمْرٍو عَنْ أَبِيهِ قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى عِمَامَتِهِ وَخُفَّيْهِ. وَتَابَعَهُ مَعْمَرٌ عَنْ يَحْيَى عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ عَمْرٍو قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ.

(باب المسح على الخفين) ئەمە باب و باسی ئەوەیە مەسح کردن بەسەر خوفەکاندا شەرعی‌یەو پێویست نی‌یە بە شۆرین و لەم بارەیەوە لە عبداللەی کوری عومەرەوەو ئەویش لە سەعدی کوری ئەبو وەقاصەوەو ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە (أنه مسح على الخفين) بەو مەرجانەی کە زانایان باسیان کردووە (وأن عبدالله بن عمر سأل عمر عن ذلك فقال: نعم، إذا حدثك شيئا سعد عن النبي ﷺ فلا تسأل عنه غيره) ئینجا ئیبن و عومەر پرسیاری کردووە لە عمر -خوا لێیان رازی بێت- لە وەلامدا فەرمووی: بەڵێ پێغەمبەر ﷺ مەسحی کردووە بەسەر خوفداو، پێغەمبەرم ﷺ بینی کە مەسحی سەرومێزەرەکەی کردووە، ئەمەش کاتێ سعد باسی شتێکی بۆ کردی لە لایەن پێغەمبەرەوە، ئیتر پرسیار لە کەسی تر مەکە. واتە بێگومان راستە.

حەدیس و ئەسەر زۆرە لە بارەی ئەوەی مەسح کردن شتێکی شەرعی و سوننەتە، ئەوە ئەوانە کە بە لایانەوە دروست نی‌یە خەواریج و شیعەن، لەم شوێنەدا ئەوەتا ئەفەرموێ: (وقال موسى بن عقبة: أخبرني أبو النضر أن أبا سلمة أخبره أن سعدا... فقال عمر لعبدالله نحوه).

ئەم حەدیسەش ئیمام ئەیهێنێ لە عورووەی کوری موغەیرەوە (عن أبيه المغيرة بن شعبة عن رسول الله ﷺ أنه خرج لحاجته فأتبعه المغيرة بإداوة فيها ماء فصب عليه حين فرغ من حاجته، فتوضأ ومسح على الخفين) وە موسای کوری عوقبە ئەڵێ نضر هەواڵی پێدام کە ئەبو سلمە هەواڵی پێداوە بەوەی پێغەمبەر ﷺ مەسحی کردووە. ئینجا عومەریش فەرموویەتی بە عبداللەی کوری خۆی وێنەی ئەوەی ئەبو سلمە گێراویەتەوە.

ئینجا ئیمامی بوخاری ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە موغەیرەوە کە پێغەمبەر ﷺ جارێ

تەشریفی چوو بۆ دەست گەیاندن بە ئاو و ئەمیش شوێنی کەوت بە ئەندازێ ئاو و ئاوەکەی کرد بە دەستی داو دەست نوێژی گرت تا گەیشتە پێ‌ی لەوێدا مەسحی کرد بەسەر خوفەکانیدا.

ئینجا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئیبن و ئومەیەی ضەمریەوە کە دیویەتی پێغەمبەرﷺ مەسحی کردووە بەسەر خوفەکانیدا، هەروەها جعفریش لە عمرەوە کە دیویەتی پێغەمبەرﷺ مەسحی کردووە بەسەر مێزەرەکەیدا لە پاش مەسحی پێش سەری وە مەسحی کردووە بەسەر خوفەکانیشیدا. هەروەها مەعمەریش لە عەمرەوە ئەو هەواڵە ئەهێنێ. ئیمامی بوخاری بەو فەرمودانە دڵنیایی کرد لەبەر ئەوەی مسح شتێکی شەرعی‌یە، کەواتە بە هیچ جۆر گوێ ناگیرێ بۆ ئەوانەی کە مسح ڕەوا نادەن وەک خەوارج و شیعە.

٢٠٤ـ حدثنا أبو نعيم قال: حدثنا شيبان عن يحيى عن أبي سلمة عن جعفر بن عمرو ابن أمية الضمري أن أباه أخبره أنه رأى النبيﷺ يمسح على الخفين.

وتابعه حرب بن شداد وأبان عن يحيى.

٢٠٥ـ حدثنا عبدان قال: أخبرنا عبدالله قال: أخبرنا الأوزاعي عن يحيى عن أبي سلمة عن جعفر بن عمرو عن أبيه قال: رأيت النبيﷺ يمسح على عمامته وخفيه. وتابعه معمر عن يحيى عن أبي سلمة عن عمرو قال: رأيت النبيﷺ.

***　***　***

## ٤٩ـ بَابُ إِذَا أَدْخَلَ رِجْلَيْهِ وَهُمَا طَاهِرَتَانِ

٢٠٦ـ حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ عَنْ عَامِرٍ عَنْ عُرْوَةَ بنِ الْمُغِيرَةِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّﷺ فِي سَفَرٍ. فَأَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ فَقَالَ: «دَعْهُمَا، فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ» فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا.

(باب إذا أدخل رجليه وهما طاهرتان) ئەمە بابی ئەوەیە کاتێ دەست نوێژ گر هەر دوو پێی کردە ناو خوفەکانی‌یەوە لە کاتێکدا پاک بن واتە غوسڵ و بێ دەست نوێژی‌یان پێوە نەبێ. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە موغیرەوە کە ئەفەرموێ: (كنت مع النبيﷺ في سفر. فأهويت لأنزع خفيه فقال: «دعهما، فإني أدخلتهما طاهرتين» فمسح عليهما) ئەفەرموێ لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەردا بووم‌ﷺ ، ئینجا دانەویمەوە لە کاتێ دەست

نوێژ گرتنیدا بۆ ئەوەی خولەفانی داکەنم، فەرمووی: لێیان گەڕێ ودایان مەکەنە، چونکە بەپاکی پێم تێخستوون، ئینجا مەسحی بەسەردا کردن.

*** *** ***

## ٥٠- بَابُ مَنْ لَمْ يَتَوَضَّأْ مِنْ لَحْمِ الشَّاةِ وَالسَّوِيقِ

## وَأَكَلَ أَبُوبَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ فَلَمْ يَتَوَضَّئُوا

٢٠٧- حَدَّثَنَا عَبْدُاللَّهِ بْنُ يُوسُفَ أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَكَلَ كَتِفَ شَاةٍ ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٥٤٠٤، ٥٤٠٥)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٠٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ بُكَيْرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ عُقَيْلٍ عَنْ ابْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي جَعْفَرُ بْنُ عَمْرِو بْنِ أُمَيَّةَ أَنَّ أَبَاهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ رَأَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَحْتَزُّ مِنْ كَتِفِ شَاةٍ، فَدُعِيَ إِلَى الصَّلَاةِ فَأَلْقَى السِّكِّينَ فَصَلَّى، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٦٧٥، ٢٩٢٣، ٥٤٠٨، ٥٤٢٢، ٥٤٦٢)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب من لم يتوضأ من لحم الشاة والسويق) ئەمە باسی ئەوەیە کە بە خواردنی گۆشتی مالات و سایلەو ناردەوا دەست نوێژ ناشکێ.

ئینجا دەست نیشان ئەکات بۆ بەڵگە لەسەر ئەو نەشکانە بەڵگە ئەهێنێتەوە بە کردەوەی سێ لە خولەفای راشیدین و ئەفەرموێ: (وأكل أبوبكر وعمر وعثمان رضي الله عنهم فلم يتوضئوا) ئینجا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە ئیبن و عەباسەوە کە (أن رسول اللهﷺ أكل كتف شاة ثم صلي ولم يتوضأ) وە لەبەر ئەوەی چەند ریوایەتێک هەیە بەڵگەن لەسەر شکان، ئیمامان دوویەرەکین لەوەدا، بەڵام زۆربەی لەسەر نەشکانن وەک ئەم حەدیسە کە عەمری کوڕی ئومەییە ئەیهێنێ کە (أخبره أنه رأى رسول اللهﷺ يحتز من كتف شاة، فدعي إلى الصلاة فألقى السكين فصلي، ولم يتوضأ) هەواڵی پێداوەو دیویەتی پێغەمبەر لە شانی مەڕێکی ئەخواردو ئینجا بانگ کرا بۆ نوێژو ئەو کێردەکەی فڕێداو ئینجا هەستاو نوێژی کردو دەست نوێژی نەگرت.

## ٥١ـ بَابُ مَنْ مَضْمَضَ مِنَ السَّوِيقِ وَلَمْ يَتَوَضَّأْ

٢٠٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللَّهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ يَحْيَى بنِ سَعِيدٍ عَنْ بُشَيْرِ ابْنِ يَسَارٍ مَوْلَى بَنِي حَارِثَةَ أَنَّ سُوَيْدَ بنَ النُّعْمَانِ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ خَرَجَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَامَ خَيْبَرَ حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالصَّهْبَاءِ -وَهِيَ أَدْنَى خَيْبَرَ- فَصَلَّى الْعَصْرَ ثُمَّ دَعَا بِالأَزْوَادِ فَلَمْ يُؤْتَ إِلاَّ بِالسَّوِيقِ، فَأَمَرَ بِهِ فَثُرِّيَ، فَأَكَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَكَلْنَا، ثُمَّ قَامَ إِلَى الْمَغْرِبِ فَمَضْمَضَ وَمَضْمَضْنَا ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢١٥، ٢٩٨١، ٤١٧٥، ٤١٩٥، ٥٣٨٤، ٥٣٩٠، ٥٤٥٤، ٥٤٥٥)دا دووبارە بووەتەوە.

٢١٠ـ حَدَّثَنَا أَصْبَغُ قَالَ: أَخْبَرَنَا ابْنُ وَهْبٍ قَالَ: أَخْبَرَنِي عَمْرٌو عَنْ بُكَيْرٍ عَنْ كُرَيْبٍ عَنْ مَيْمُونَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَكَلَ عِنْدَهَا كَتِفًا، ثُمَّ صَلَّى وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

(باب من مضمض من السويق ولم يتوضأ) ئەمە بابی ئەوەیە کە کەسێک ناو ڕادا لە دەمی لەبەر ئەوەی ناردەوای خواردبێ و ئیتر دەست نوێژ نەگرێ و لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە سویدی کوڕی نعمانەوە کە لە سالی خەیبەردا لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ (حتى إذا كانوا بالصهباء -وهي أدنى خيبر- فصلى العصر ثم دعا بالأزواد فلم يؤت إلا بالسويق، فأمر به فثري) ئینجا لەویدا نوێژی عەسری کردو پاشان داوای خواردنی کرد، وە بێجگە لە کولێرەی وشک نەبوو، ئینجا لەبەر ئەوەی ڕەق بوو بووە تەڕ کرا بە ناو (فأكل رسول الله ﷺ وأكلنا، ثم قام إلى المغرب فمضمض ومضمضنا ثم صلى ولم يتوضأ) ئینجا پێغەمبەر ﷺ خواردی و ئێمەش خواردمان، پاشان هەستا بۆ نوێژی مەغریب و دەمی موبارەکی شۆردو ئێمەش دەمان شۆردو دەست نوێژی نەگرت، هۆی ئەو دەم شتنە ئەوەیە خۆراکەکە لەناو دەم و داندا نەمێنێتەوە بە هۆی ئەوەوە لە نوێژەکەدا خەریک نەبێ پێیەوەو لە نوێژیشدا ئەبێ دڵ هەر خەریک بێ بە نوێژەکەوە، ئەم حەدیسە دەلیلە لەسەر ئەوە دەم شۆردن لەپاش خواردن سونەتە.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران میمونەوە -خوای لێ ڕازی بێت- کە (أن النبي ﷺ أكل عندها كتفا، ثم صلى و لم يتوضأ) پێغەمبەر ﷺ لە گۆشتی شانی مەڕێکی خواردو ئینجا نوێژی کردو دەست نوێژی نەگرت.

ئەم حەدیسە پەیوەندی نی‌یە بە بابەکەوە لەبەر ئەوە هەندێ فەرمویانە ئەم حەدیسە بە هەڵە نووسراوە! وە لە نوسخەی دەست خەتی ئیمامدا لە بابی پێشوودا نووسراوەو باسی دەم شۆرینی تێدا نی‌یە.

*** *** ***

٥٢ـ بَابُ هَلْ يُمَضْمِضُ مِنَ اللَّبَنِ

٢١١ـ حَدَّثَنَا يَحْيَى بنُ بُكَيْرٍ وَقُتَيْبَةُ قَالاَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ عُقَيْلٍ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِاللهِ بنِ عَبْدِاللهِ بنِ عُتْبَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ شَرِبَ لَبَنًا فَمَضْمَضَ وَقَالَ: «إِنَّ لَهُ دَسَمًا».

تَابَعَهُ يُونُسُ وَصَالِحُ بنُ كَيْسَانَ عَنِ الزُّهْرِيِّ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٥٦٠٩)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

٥٣ـ بَابُ الْوُضُوءِ مِنَ النَّوْمِ وَمَنْ لَمْ يَرَ مِنَ النَّعْسَةِ وَالنَّعْسَتَيْنِ أَوِ الْخَفْقَةِ وُضُوءًا

٢١٢ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ هِشَامٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ يُصَلِّي فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ نَاعِسٌ لاَ يَدْرِي لَعَلَّهُ يَسْتَغْفِرُ فَيَسُبُّ نَفْسَهُ».

٢١٣ـ حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَارِثِ حَدَّثَنَا أَيُّوبُ عَنْ أَبِي قِلاَبَةَ عَنْ أَنَسٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ فِي الصَّلاَةِ فَلْيَنَمْ حَتَّى يَعْلَمَ مَا يَقْرَأُ».

(باب الوضوء من النوم) ئەمە بابی ئەوەیە کە دەست نوێژ گرتن پێویستە لەسەر کەسێک کە خەوتبێ، ئیتر خەوی کەم یان زۆر (ومن لم یر من النعسة والنعستین أو الخفقة وضوءا) وە بابی ئەوەیە دەست نوێژ گرتن پێویست نی‌یە لەبەر خەوەنیچکەیەک یا سەرە لەقەیەک. بەڵام ئەگەر بوو بە دوو ئیتر ئەوە خەوی تەواوەو ئەبێ دەست نوێژ بگیرێ بۆی و لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیماندارانەوە عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە (أن رسول الله ﷺ قال: «إذا نعس أحدكم وهو يصلي فليرقد حتى يذهب عنه النوم، فإن أحدكم إذا صلى وهو ناعس لا يدري لعله يستغفر فيسب نفسه») هەرکاتێ یەکێ لە ئێوە

ئەگەر نوێژی کردو لە کاتێکدا وەنەوزی ئەبرد با بخەوێ و بە دەم خەوەنیچکەوە نوێژ نەکات، چونکە لەو کاتەدا هۆشی نی یەو لەوانەی داوای لێ خۆش بوون بکات و لە باتی ئەوە قسە بە خۆی بلێ و نزای شەڕ لە خۆی بکات.

وا دەرئەکەوێ مەبەست ئەوە نی یە نوێژەکەی ببڕێ، بەڵکو سەلام بداتەوەو بخەوێ. تا خەوەکەی ئەڕواو ئینجا هەڵسێ بۆ نوێژ کردن، بەلام بە مەرجێ بە هۆی خەوەکەیەوە نوێژی فەرز نەڕوا. ئەگەر خەوەکەی زۆردار بوو وە بۆی چار نەکراو دەسەلاتی خۆی تێدا نەبوو ئەوە قەیناکات، بەلام ئەگەر قسوری خۆی تێدا بوو وەک ئێستا باوە خەڵکی لەبەر تەلەفزیۆن دائەنیشن تا درەنگ و خەبەریان نابێتەوە ئەوە تاوانبار ئەبن.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ کە فەرمویەتی: («إذا نعس أحدكم في الصلاة فلينم حتى يعلم ما يقرأ») لەگەڵ حەدیسی پێشوودا یەک مەبەستە، بەلام ئەمەش ئەهێنێ بۆ بەهێزکردنی حەدیسەکە.

***          ***          ***

## ٥٤- بَابُ الْوُضُوءِ مِنْ غَيْرِ حَدَثٍ

٢١٤- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ يُوسُفَ قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ عَمْرِو بنِ عَامِرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أنَسًا. ح

قَالَ: وَحَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ سُفْيَانَ قَالَ حَدَّثَنِي عَمْرُو بنُ عَامِرٍ عَنْ أنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّﷺ يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ. قُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ؟ قَالَ: يُجْزِئُ أحَدَنَا الْوُضُوءُ مَالَمْ يُحْدِثْ.

٢١٥- حَدَّثَنَا خَالِدُ بنُ مَخْلَدٍ قَالَ: حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ قَالَ حَدَّثَنِي يَحْيَى بنُ سَعِيدٍ قَالَ أخْبَرَنِي بُشَيْرُ بنُ يَسَارٍ قَالَ: أخْبَرَنِي سُوَيْدُ بنُ النُّعْمَانِ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِﷺ عَامَ خَيْبَرَ حَتَّى إذَا كُنَّا بِالصَّهْبَاءِ صَلَّى لَنَا رَسُولُ اللهِﷺ الْعَصْرَ، فَلَمَّا صَلَّى دَعَا بِالأطْعِمَةِ فَلَمْ يُؤْتَ إلاَّ بِالسَّوِيقِ، فَأكَلْنَا وَشَرِبْنَا ،ثُمَّ قَامَ النَّبِيُّﷺ إلَى الْمَغْرِبِ فَمَضْمَضَ ثُمَّ صَلَّى لَنَا الْمَغْرِبَ، وَلَمْ يَتَوَضَّأْ.

(باب الوضوء من غير حدث) ئەمە بابی حوکمی دەست نوێژ گرتنە بە بێ ئەوەی

دەست نوێژەکەی شکابێ. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە عەمری کوڕی عامرەوە کە ئەفەرموێ: (سمعت أنسا. ح) ئیمامی بوخاری ئەفەرموێ: عەمری کوڕی عامر گوتی لە ئەنەسەوە (كان النبيﷺ يتوضأ عند كل صلاة) پێغەمبەرﷺ عادەتی وا بوو لە کاتی هەموو نوێژێکدا دەست نوێژی ئەگرت. واتە نوێژە فەرزەکان، ئەمە ئەگەر واجب بووبێ نەسخ بووەتەوە بە پێی حەدیسی تر کە سەحیحەو هاتووە کە جاری وا بووە دەست نوێژی گرتووە، یان ئەمە بە سوننەتی ئەوەی کردووە.

عەمری کوڕی عامر ئەفەرموێ: گوتم لە ئەنەس بوو (قلت: كيف كنتم تصنعون؟) ئایا ئێوە لە کاتی خۆیدا چۆنتان ئەکرد؟ (قال: يجزئ أحدنا الوضوء مالم يحدث) ئەنەس گوتی: یەک دەست نوێژ بەس بوو بۆ هەرکامان تا دەست نوێژ نەشکایە.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە سوەیدی کوڕی نوعمانەوە کە (قال: خرجنا مع رسول اللهﷺ عام خيبر حتى إذا كنا بالصهباء صلى لنا رسول اللهﷺ العصر، فلما صلى دعا بالأطعمة فلم يؤت إلا بالسويق، فأكلنا وشربنا،ثم قام النبيﷺ إلى المغرب فمضمض ثم صلى لنا المغرب، ولم يتوضأ) ئینجا یەک خستنی ئەم حەدیسە لەگەڵ حەدیسی پێشوودا بەمە ئەبێ کە بڵێین کردەوەی یەکەم چاکترەو لەبەر ئەوە زۆربە بەو شێوە بووە وە کردەوەی ئەم حەدیسە بۆ ڕوون کردنەوەی جەوازو دروستی یە.

*** *** ***

## ٥٥ـ بَابُ مِنَ الْكَبَائِرِ أَنْ لاَ يَسْتَتِرَ مِنْ بَوْلِهِ

٢١٦ـ حَدَّثَنَا عُثْمَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ مُجَاهِدٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّﷺ بِحَائِطٍ مِنْ حِيطَانِ الْمَدِينَةِ -أَوْ مَكَّةَ- فَسَمِعَ صَوْتَ إِنْسَانَيْنِ يُعَذَّبَانِ فِي قُبُورِهِمَا فَقَالَ النَّبِيُّﷺ: «يُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ -ثُمَّ قَالَ- بَلَى، كَانَ أَحَدُهُمَا لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ، وَكَانَ الآخَرُ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ» ثُمَّ دَعَا بِجَرِيدَةٍ فَكَسَرَهَا كِسْرَتَيْنِ، فَوَضَعَ عَلَى كُلِّ قَبْرٍ مِنْهُمَا كِسْرَةً، فَقِيلَ لَهُ: يَا رَسُولَ اللهِ لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: «لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفَّفَ عَنْهُمَا مَا لَمْ تَيْبَسَا» أَوْ «إِلَى أَنْ يَيْبَسَا».

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە کە ئەفەرموێ: (باب من الكبائر أن لا يستتر من بوله) ئەمە

بابێکە لە گـوناهە گەورەکـانە کـەسێـک خـۆی دانەپۆشێ لە کـاتی دەست بە ئاو گـەیاندندا. بێگومان بە دەقی ئایەت و حەدیس گوناه گەورەو بچووکی هەیە.

هێندێ ئەفـەرمـون: گـەورەکـان ئەو حـەوتەن کـە بەناوبانگن، هێندێ تر ئەفـەرمـون گەورەکـان ئەوانەن کە شـەرع حەددی لەسـەر داناون، هێندێ تر ئەفەرموون هەر گـوناهێ وا بگەیەنێ و وا نیشان بدات کە خاوەنەکەی کەم موبالاتە بە دین. هێندێ تر ئەفەرمون گەورەو بچووکی شتێکی نیسبی‌یە، بەم رەنگە هەر گوناهێ بە نەزەر گەورەترو پێشترەوە بچووکەو بە نەزەر بچووک ترەوە لە خۆی گەورەیە جا ئەم خۆ دانەپۆشینە لەسەر ئەم دوو رای دوایی‌یە بەری گەورە ئەکەوێ.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە -خوایان لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: (مر النبي ﷺ بحـائط من حـيطان المدينة -أو مكة- فـسـمع صـوت إنسـانين يعـذبان في قبورهمـا فقال النبي ﷺ : «يعذبان، وما يعذبان في كبير -ثم قال- بلى، كان أحدهمـا لا يستتر من بوله، وكـان الآخر يمشي بالنميمة» ثم دعا بجريدة فكسـرها كسـرتين، فوضع على كل قـبر منهمـا كسـرة، فقيل له: يا رسول الله لم فعلت هذا؟ قـال: «لعله يخفف عنهما ما لم تيبسـا» أو «إلى أن ييبسـا») پێغەمبەر ﷺ تێپەری بە باخێکی مەدینەداو گوێی لە دەنگی دوو ئادەمی بوو عەزاب ئەدران لە گۆڕەکانیاندا. ئینجا فەرمووی ئەو دووانە عەزاب ئەدرێن وە عەزاب نادرێن لە گوناهی گەورەدا، ئینجا فەرمووی با عـەزاب ئەدرێن لە گوناهی گەورەدا. یەکێکیـان باوی وا بوو خـۆی دانەئەپۆشی لە کـاتێ ئەچووە سـەر ئاو دەست، ئەوی تریان فـیتنەیی و دوو زمـانی ئەکردو نێوان خەڵکی تێک ئەدا، ئینجا داوای پەلکە دارێکی تەڕی کـرت و کـردی بە دوو پارچەوەو هەر پارچەیەکی دانا یان دای چەقـان لەسـەر گۆڕەکانیان.ئینجا عەرزیان کرد بۆچی وات کرد، فەرمووی بەڵکو سزاکەیان لەسەر سووک بکرێ تا ئەو دوو پەلکە وشک ئەبن.

لە بارەی گەورەیی ئەو دوو گـوناهە هەندێ دواین کە بەری گـوناهی گـەورە بکەون. وە لێرەدا ئەمە ئەڵێین وتەی (كان) وا ئەگەیەنێ ئەو گـوناهە بووە بە باویان و پیشـەیان پێوە گرتبوو، هەر گوناهێ ئەگەر بچووکیش بێت هەر کاتێ دەوامی لەسەر بکرێ ئەبێ بە گەورە، کـەواتە بێگومـان ئەو دوو گـوناهە بەو شێـوەیە گـەورەیە، بێگومـان ئیـتر مەبەست بە وتەی

(أستتر) خۆ دانەپۆشینیان بێ یان خۆ پاک [illegible]
کراوەتەوە بە هەردوو ماناکە.

ئینجا گرێیەک هەیە کە چۆن لە پێشەوە فەرمووی گەورە نین و لە پاشان فەرمووە، گەورەن. رەنگە لە پێشەوە فەرمووی بە پێی بۆچوونی خەڵکی کە گوناهی ئاوا بە بچووک سەیر ئەکرێ بە پێی بۆچوونی ئەوەی فەرموو ئینجا وەحی بۆ کرا کە گەورەن، خوا باشتر ئەزانێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢١٨، ١٣٦١، ١٣٧٨، ٦٠٥٢، ٦٠٥٥)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٥٦ـ بَابُ مَا جَاءَ فِي غَسْلِ الْبَوْلِ

وَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ لِصَاحِبِ الْقَبْرِ: كَانَ لاَ يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ. وَلَمْ يَذْكُرْ سِوَى بَوْلِ النَّاسِ.

٢١٧ـ حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ بنُ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: حَدَّثَنِي رَوْحُ ابْنُ الْقَاسِمِ قَالَ: حَدَّثَنِي عَطَاءُ بنُ أَبِي مَيْمُونَةَ عَنْ أَنَسِ بنِ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا تَبَرَّزَ لِحَاجَتِهِ أَتَيْتُهُ بِمَاءٍ فَيَغْسِلُ بِهِ.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابەو ئەفەرموێ: (باب ما جاء في غسل البول) ئەمە بابێکە لە بارەی حوکمی شۆرینی میزەوە واتە میزی ئادەمی وەک دەرئەکەوێ کە ئەفەرموێ: (وقال النبي ﷺ لصاحب القبر: كان لا يستتر من بوله. ولم يذكر سوى بول الناس) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی دەبارەی خاوەن گۆڕەکە خۆی دانەئەشاردەوە لە میزەکەی خۆی، واتە خۆی کە ئادەمی یەو بێجگە لە میزی ئادەمی باس نەکرد. کەواتە ئەبێ مەبەست لە ریوایەتەکەی کە ئەفەرموێ: (لا يستتر من البول) هەر میزی ئادەمی بێت کەواتە ئەم بابەو ئەم حەدیسە بێ دەنگن لە میزی گیان لەبەرانی ترو حوکمی میزی ئەوان لێرە وەرناگیرێ.

ئینجا لە بارەی میزی ئادەمی یەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە (قال: كان النبي ﷺ إذا تبرز لحاجته أتيته بماء فيغسل به) ئەفەرموێ کاتێ پێغەمبەر ﷺ

تەشریفی بچووایە بۆ خۆ خاڵی کردنەوە من ئاوم بۆ ئەهێناو خۆی پێ ئەشۆردەوە، ئەمە ناکرێ بە بەڵگە لەسەر ئەوەی حوکمی خۆپاک کردنەوە بە شتی تر ناکرێ، وەک بەردو شتی تر کە خۆی پێ پاک ئەکرێتەوە.

*** *** ***

## ٥٦ـ بَابٌ

٢١٨ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ حَازِمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ عَنْ مُجَاهِدٍ عَنْ طَاوُسٍ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِقَبْرَيْنِ فَقَالَ: «إِنَّهُمَا لَيُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ، أَمَّا أَحَدُهُمَا لاَ يَسْتَتِرُ مِنَ الْبَوْلِ، وَأَمَّا الآخَرُ فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ، ثُمَّ أَخَذَ جَرِيدَةً رَطْبَةً فَشَقَّهَا نِصْفَيْنِ، فَغَرَزَ فِي كُلِّ قَبْرٍ وَاحِدَةً.

قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِ لِمَ فَعَلْتَ هَذَا؟ قَالَ: «لَعَلَّهُ يُخَفَّفُ عَنْهُمَا مَا لَمْ يَيْبَسَا».

لێرەدا ئەم بابە ئەهێنێ بە بێ عینوان و ئەم حەدیسەی تێدا ئەهێنێ کە هەندێ جیاوازی هەیە لە راوییەکانداو عەینی حەدیسی پێشووە لە مەتنەکەیدا، بەوە دەرئەکەوێ کە ئەم حەدیسە بەهێزەو ئەم ئەهێنێ لە ئیبن عەباسەوە -خوا لێیان رازی بێت- لەبەرئەوەی مەتنی هەردوو وەک یەک وایە بە پێویستم نەزانی مەتنەکە دووبارە بکەمەوە.

*** *** ***

## ٥٧ـ بَابُ تَرْكِ النَّبِيِّ ﷺ وَالنَّاسِ الأَعْرَابِيَّ حَتَّى فَرَغَ مِنْ بَوْلِهِ فِي الْمَسْجِدِ

٢١٩ـ حَدَّثَنَا مُوسَى بنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا هَمَّامٌ أَخْبَرَنَا إِسْحَاقُ عَنْ أَنَسِ بنِ مَالِكٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى أَعْرَابِيًّا يَبُولُ فِي الْمَسْجِدِ فَقَالَ: دَعُوهُ. حَتَّى إِذَا فَرَغَ دَعَا بِمَاءٍ فَصَبَّهُ عَلَيْهِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٢١، ٦٠٢٥)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٥٨ـ بَابُ صَبِّ الْمَاءِ عَلَى الْبَوْلِ فِي الْمَسْجِدِ

٢٢٠ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ: قَالَ: أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ عَنِ الزُّهْرِيِّ قَالَ: أَخْبَرَنِي عُبَيْدُاللهِ بنُ عَبْدِاللهِ بنِ عُتْبَةَ بنِ مَسْعُودٍ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: قَامَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي الْمَسْجِدِ، فَتَنَاوَلَهُ

النَّاسُ، فَقَالَ لَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ : «دَعُوهُ، وَهَرِيقُوا عَلَى بَوْلِهِ سَجْلاً مِنْ مَاءٍ -أَوْ ذَنُوبًا مِنْ مَاءٍ- فَإِنَّمَا بُعِثْتُمْ مُيَسِّرِينَ، وَلَمْ تُبْعَثُوا مُعَسِّرِينَ».

حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بنُ سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بنَ مَالِكٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب صب الماء على البول في المسجد) ئەمە بابی ئاو کردنە بەسەر میزدا کە لە مزگەوتدا کرابێ. وە لەم بارەیەوە یەحیای کوڕی سەعید حەدیسێ ئەهێنێ (قال: سمعت أنس بن مالك قال: جاء أعرابي فبال في طائفة المسجد فزجره الناس فنهاهم النبي ﷺ فلما قضى بوله أمر النبي ﷺ بذنوب من ماء فأهريق عليه). ئەم حەدیسە هەر ئەو حەدیسەیە کە لە پێش ئەمەوە هات و یەک مەبەستێ و هەر یەک کەس ئەو کارەی کرد بەڵام حەدیسی پێشوو لە ئەبو هورەیرەوە هات و ئەمە لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە.

ئیمامی بوخاری هەردووی هێنا لەبەر ئەوە هەر حەدیسێکی دەست کەوتبێ بەپێی مەرجەکەی خۆی هێناویەتی.

ئینجا ئەم هاوەڵانە -خوایان لێ ڕازی بێت- لەناو ئەو کۆمەڵەدا بوون کە ئەو کارەیان دیتوە. بەڵام هەرکام ڕووداوەکەیان بۆ کەسێکی تر ڕیوایەت کردووە، کەواتە گێڕانەوەی لە دوو ڕێگەوە بەڵگەیە لەسەر ڕاستی ڕووداوەکە. وە لەم حەدیسانەوە چەند شتێک وەرئەگرین:

چەسپانی کردن بۆ فەرمان بە چاکەو جڵەوگیریی لە خراپە، پاراستنی مزگەوت لە شتی پیس، وە شتی پیس بە شۆرین پاک ئەبێتەوە نەک بە وشک بوونەوەو هەواو خۆر وەک هێندێ لەسەر ئەوەن، جڵەوگیریی کردنی پێغەمبەر ﷺ لەبەر مەسڵەحەتێکی ئاشکرایە کە نەرمی بەکاربهێنرێ لەگەڵ نەفامانداا بۆ ڕاکێشانی بۆ ڕێگەی ڕاست وە لە پاش بەجێ هێنانی ئەو مەسڵەحەتە واز ئەهێنرێ لە کارە بەدەکە، بەڵکو چارەسەر بکرێ، ئەوە بوو فەرمانی دا بەوەی دۆڵچەیە ئاو بکرێ بە شوێنی میزەکەدا تا پیسی‌یەکە نەمێنێ.

دیارە لەو کاتەدا ناو مزگەوتەکە لم بووەو ئاوەکەی هەڵمژیوە، کەواتە ئەگەر وەک ئێستا چیمەنتۆ بێ ئەبێ ئاوی پێدا بکرێ تا لە مزگەوتەکەوە دەرئەکرێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٦١٢٨)دا دووبارە بووەتەوە.

## ٥٩ـ بَابُ يُهَرِيقُ الْمَاءَ عَلَى الْبَوْلِ

٢٢١ـ وَحَدَّثَنَا خَالِدٌ. قَالَ: وَحَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ عَنْ يَحْيَى بن سَعِيدٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بنَ مَالِكٍ قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ فَبَالَ فِي طَائِفَةِ الْمَسْجِدِ، فَزَجَرَهُ بَعْضُ النَّاسِ، فَنَهَاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ. فَلَمَّا قَضَى بَوْلَهُ أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِذَنُوبٍ مِنْ مَاءٍ فَأُهْرِيقَ عَلَيْهِ.

ئەم حەدیسە لە بابی پێشوودا شەرح کرا.

***　　***　　***

## ٥٩ـ بَابُ بَوْلِ الصِّبْيَانِ

٢٢٢ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ هِشَامِ بنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِصَبِيٍّ فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَأَتْبَعَهُ إِيَّاهُ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٥٤٦٨، ٦٠٠٢، ٦٠٥٥)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٢٣ـ حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِاللهِ ابْنِ عَبْدِاللهِ بنِ عُتْبَةَ عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ أَنَّهَا أَتَتْ بِابْنٍ لَهَا صَغِيرٍ لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَجْلَسَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي حِجْرِهِ، فَبَالَ عَلَى ثَوْبِهِ، فَدَعَا بِمَاءٍ فَنَضَحَهُ وَلَمْ يَغْسِلْهُ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٥٦٩٣)دا دووبارە بووەتەوە.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابەو ئەفەرموێ: (باب بول الصبيان) ئەمە بابی حوکمی میزی منداڵانە، وە لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران عائشە -خوای لێ رازی بێت- ئەفەرموێ: (أنها قالت: أتي رسول الله ﷺ بصبي فبال على ثوبه، فدعا بماء فأتبعه إياه) کوڕێکی منداڵیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و میزی کرد بە لیباسەکەیداو ئەویش داوای ئاوی کردو کردی بە شوێنەکەیدا.

ئینجا پێویست نییە جاری بوونی ئاو بەسەر شوێنەکەدا، بەڵکو لێپرژاندن بەسە وەک لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە ئوم قەیس ئەیهێنێ کە (أنها أتت بابن لها صغير لم يأكل

الطعام إلى رسول اللهﷺ فأجلسه رسول اللهﷺ في حجره، فبال على ثوبه، فدعا بماء فنضحه ولم يغسله) کوڕێکی بچووکی خۆی هێنایە خزمەت پێغەمبەرﷺ خواردنی نەئەخوارد ئەویش خستی‌یە کۆشی خۆی و ئەو منداڵە شیرە خۆر بوو، ئینجا منداڵەکە میزی کرد بە کۆشی پیرۆزیداو ئەویش داوای ئاوی کردو لێی پرژاندو نەیشۆری.

ئینجا لە هەردوو ریوایەتەکەدا هەر کوڕ هەیەو کچی تێدا نی‌یە، جا لەوەوە وا دەرئەکەوێ کە کچ شۆرینی ئەوێ و لێ پرژاندن بەس نی‌یە، وە گومان ئەبرێ کە میزی کچ غەلیز ترە وەک باقی پیسی تر لەسەر ئەسڵەکە کە لابردنی پیسی ئەبێ بە جاری بوونی ئاو بێ.

زانایان ئەفەرمون ئەوە کە تەحنیکی پێ دەکرێ و شتێکە پێویستە بۆ منداڵ وەک خەیار چەمەر ئەویش قەیناکات و بە خواردنی باری ناگۆڕێ و هەر پرژاندنی ئاو بەسە، ئینجا با بزانرێ کە سێ را هەیە لەم مەسەلەدا:

١) ئەمە کە گوتمان.

٢) کوڕ و کچ هەردوو لێ پرژاندنی بەسە.

٣) هەردوو شۆرینی ئەوێ ئەمە لاوازەو بێ بەڵگەیە.

ئینجا لەسەر هەر بار ئەمە وەرئەگیرێ کە لوتف و نەرم و نیانی دەربارەی منداڵان کارێکی خێرە وە بردنی بۆ خزمەتی خواناسان بۆ ناونان و تحنیک کردن و دوعای خێر شتێکی پیرۆزە.

***　　***　　***

## ٦٠ـ بَابُ الْبَوْلِ قَائِماً وَقَاعِداً

٢٢٤ـ حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: أَتَى النَّبِيُّﷺ سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قَائِماً، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ، فَجِئْتُهُ بِمَاءٍ فَتَوَضَّأَ.

(باب البول قائما وقاعدا) ئەمە بابی ئەوەیە کە بە پێوەو بە دانیشتنەوە میز ئەکرێ و نارەوایی تێدا نی‌یە، وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە حذیفەوە کە (قال: أتى النبيﷺ سباطة قوم فبال قائما، ثم دعا بماء، فجئته بماء فتوضأ) ئەڵێ پێغەمبەرﷺ هاتە زبڵ و جێگەی خەوش و خاڵی جەماعەتێک و بە پێوە میزی کردو ئینجا داوای ئاوی کردوو

منیش بۆم هێناو ئەویش دەست نوێژی گرت.

بێگومان بە پێوە میزکردن کاتێک مەترسی نەکرێ لە گەڕانەوەی پرژی و لە نوێژ نەچوون، وە کاتێ زیان نەگەیەنێ بە کەس و بە ماڵی هیچ کەس یان کاتێ بە پێوە رەحەت تر بێت، لەو کاتانەدا کارێکی ناڕەوا نییە. ئەمەی کە لەناو خەڵکیدا بە کارێکی بەد دائەنرێ ئەوە لەبەر ئەوەیە میز بە پێوە کردن کاری نوێژ نەکەرانەو بە وێنەی کەرو گا هەڵئەمیزن بە دەرو دەشتدا، زۆرتر لاسایی بێگانەکان ئەکرێتەوە، دیارە بەو شێوە کارێکی پیس و بەدەو بێزراوە لای موسڵمانان.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٢٥، ٢٢٦، ٢٤٧١)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٦١- بَابُ الْبَوْلِ عِنْدَ صَاحِبِهِ، وَالتَّسَتُّرِ بِالْحَائِطِ

**٢٢٥- حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بنُ أَبِي شَيْبَةَ قَالَ حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: رَأَيْتُنِي أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ نَتَمَاشَى، فَأَتَى سُبَاطَةَ قَوْمٍ خَلْفَ حَائِطٍ، فَقَامَ كَمَا يَقُومُ أَحَدُكُمْ فَبَالَ، فَانْتَبَذْتُ مِنْهُ، فَأَشَارَ إِلَيَّ فَجِئْتُهُ، فَقُمْتُ عِنْدَ عَقِبِهِ حَتَّى فَرَغَ.**

(باب البول عند صاحبه، والتستر بالحائط) ئەمە بابی ئەوەیە میز کردن لە نزیکی هاوەڵی یەوە دروستە، هەروەها میز کردن لە پەنای پەرژین و دیواردا، جا لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە حذیفەوە کە (قال: رأیتني أنا والنبي ﷺ نتماشی، فأتی سباطة قوم خلف حائط، فقام کما یقوم أحدکم فبال، فانتبذت منه، فأشار إلي فجئته، فقمت عند عقبه حتی فرغ) واتە لە بیرمە من و پێغەمبەر ﷺ ئەگەڕاین، ئینجا گەیشتە جێگای زبڵ و خەوش خاڵی هەندێ ماڵ لە پشتی پەرژین و دیوارێک، ئینجا وەستا بە پێوە وەک وەستانی هەرکام لە ئێوە، واتە وەستانی ئاسایی ئینجا بە پێوە میز بکات، منیش لێی دوور کەوتمەوەو ئەویش دەست نیشانی بۆ کردم بە نزیک بوونەوەم منیش هاتم وەستام لە پشتی یەوە هەتا لێ بوویەوە.

ئەم حەدیسە لە مەبەستدا هەر یەکە لەگەڵ حەدیسی پێشوو کە ئەویش لە حذیفەوە هات، بەڵام جیاوازە لە عینوان و هێندێ شێوەدا، کەواتە تیکرار نییە، ئەگەرچی هەر حەدیسێ گەیشتبێ بە ئیمامی بوخاری هەر هێناویەتی بۆ زیادە بەهێزکردنی حەدیسەکەی تر

ماتوێ عەینی یەک نەبێ لە هەموو بارو رووبەکەوە. -خوای لێ رازی بێت- لە هاوەڵەکان و ئەو کەسانەی کە ریوایەتی حەدیسەکانیان کرد کە چۆن زۆر بە گرنگی حەدیسەکانیان پاراست و رایان گەیاندن.

ئینجا قسەیەک ماوە لێرەدا چاک وایە باسی بکەم: بێگومان باوی پێغەمبەر وابووە لە کاتی بەجێ هێنانی خۆ خاڵی کردنەوە دوور کەوتووەتەوەو لەم کاتەدا کە حذیفە ئەیگێرێتەوە بۆچ وای نەکرد لە وەڵامدا گوتراوە کە ئەو هەمیشە خەریک بووە بە کاروباری فروستادەیی یەکەی و راگەیاندن، لەبەر ئەوە لەو کاتەدا پێویستی بووە بە قەزای پێویستی یەکەی وە تەفرە خستنی ئەوەش زیانی هەیە بۆ تەندروستی و میزیش ئەرکێکی وای نی یە زوو جێ بە جێ دەبێت. پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە سروشت ئادەمی بووەو بە پێی ئەوە رەفتاری کردووە لە خەو و خواردن و بەجێ هێنانی پیویستی یەکانی، کەواتە ئەگەر ئەو شێوەی بەکار هێنابێ هەر لەبەر ئەوە ئەو شێوە جێ بە جێ کردنە دروستەو بێ شەرعی نی یە.

ئەگەر هەر لەبەر ئەوەش بووبێ شتێکی تر سوود بەخشە. وە بە هەر جۆر لە کاتی قەزای حاجەتدا پێویستە عەورەت شاردنەوە بە هەر جۆر دەست بدات.

*** *** ***

## ٦٢ـ بَابُ الْبَوْلِ عِنْدَ سُبَاطَةِ قَوْمٍ

٢٢٦ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ عَرْعَرَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ أَبِي وَائِلٍ قَالَ: كَانَ أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ يُشَدِّدُ فِي الْبَوْلِ وَيَقُولُ: إِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَ إِذَا أَصَابَ ثَوْبَ أَحَدِهِمْ قَرَضَهُ فَقَالَ حُذَيْفَةُ: لَيْتَهُ أَمْسَكَ، أَتَى رَسُولُ اللهِ ﷺ سُبَاطَةَ قَوْمٍ فَبَالَ قَائِمًا.

(باب البول عند سباطة قوم) لە پاش ئەوەی لە بابەکانی پێشوودا چەند حەدیسی هێنایەوە لەسەر ئەوەی کە بە پێوە میزی کردووە، ئینجا هێندێ لەزانایان زۆر دژی ئەوە بوون کە شتی وا رووی دابێ و ئەگەر شتی وا بووبێ نسخ کراوەتەوە. وە بەڵگەیان فەرمودەی دایکی ئیمانداران عائشەیە -خوای لێ رازی بێت- کە فەرموویەتی: هەرگیز بە پێوە میزی نەکردووە لەوەتەی قورئانی نازڵ بووەتە سەر، وە فەرموویەتی هەرکەس ئەو قسەی کردبێ باوەری پێ مەکەن. وە یەکێ لەوانە کە توندو تیژیی بەکار ئەهێنێ لە باوەر کردن بە شتی وا ئەبو موسای ئەشعەری یە، چونکە ئەفەرموێ: میزکردن بە پێوە ئەبێ بە هۆی پیس بوونی ئەو

کەسەو پیس بوون زۆر سەخت بوو لەزەمانی ئیسرائیلی‌یەکاندا تا ئەو رادەی کەسێک جل و بەرگی پیس بووبێ بڕیویانەو شۆردن چارەسەر نەبووە. جا ئەبو موسا ئەوەندە توندو تیژیی بەکارهێناوە تا رادەیەک حذیفە فەرمووی: کاشکێ بێ دەنگ ببوایە، چونکە خۆی ئاگادار بووە لەوە، وە فەرمووی: پێغەمبەرﷺ هاتە مەزبەلەی جەماعەتێک و بە پێوە میزی کرد. کەواتە دایکی ئیمانداران یان هەرکەسێکی تر ئەوەی گوتبێ ئەوە بە پێی زانینی خۆی بووە. وە ئێمە کە ئەڵێین شتی وا بووە لە کاتێکی تایبەتیدا بووە وەک باسمان کرد، ئینجا دەقی حەدیسە ئەهێنین (عن أبي وائل قال: كان أبو موسى الأشعري يشدد في البول ويقول: إن بني إسرائيل كان إذا أصاب ثوب أحدهم قرضه فقال حذيفة: ليته أمسك، أتى رسول اللهﷺ سباطة قوم فبال قائما).

*** *** ***

## ٦٣- بَابُ غَسْلِ الدَّمِ

٢٢٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ هِشَامٍ قَالَ حَدَّثَنِي فَاطِمَةُ عَنْ أَسْمَاءَ قَالَتْ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ النَّبِيَّﷺ فَقَالَتْ: أَرَأَيْتَ إِحْدَانَا تَحِيضُ فِي الثَّوْبِ كَيْفَ تَصْنَعُ؟ قَالَ: «تَحُتُّهُ ثُمَّ تَقْرُصُهُ بِالْمَاءِ وَتَنْضَحُهُ وَتُصَلِّي فِيهِ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٣٠٧)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٢٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو مُعَاوِيَةَ حَدَّثَنَا هِشَامُ بنُ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ ابْنَةُ أَبِي حُبَيْشٍ إِلَى النَّبِيِّﷺ فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أُسْتَحَاضُ فَلاَ أَطْهُرُ، أَفَأَدَعُ الصَّلاَةَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: «لاَ. إِنَّمَا ذَلِكَ عِرْقٌ، وَلَيْسَ بِحَيْضٍ، فَإِذَا أَقْبَلَتْ حَيْضَتُكِ فَدَعِي الصَّلاَةَ، وَإِذَا أَدْبَرَتْ فَاغْسِلِي عَنْكِ الدَّمَ ثُمَّ صَلِّي» قَالَ: وَقَالَ أَبِي: «ثُمَّ تَوَضَّئِي لِكُلِّ صَلاَةٍ حَتَّى يَجِيءَ ذَلِكَ الْوَقْتُ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٠٦، ٣٢٠، ٣٢٥، ٣٣١)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب غسل الدم) ئەمە بابی شۆرینی خوێنەو چۆنیەتی شۆرینەکەی وە لەم بارەیەوە لە ئەسمائەوە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت: جاءت امرأة النبيﷺ فقالت: أرأيت إحدانا تحيض في الثوب كيف تصنع؟ قال: «تحته ثم تقرصه بالماء و تنضحه وتصلي فيه»)

فەرمووی ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ عەرزی کرد هەوالم بدەری ئەگەر یەکێک خوێنی حەیزی بکەوێ لە جل و بەرگی ئایا چی بکات؟ فەرمووی: خوێنەکە بپروێنێ و ئینجا بیکرێنێ بە نینۆک ئینجا پۆشاکەکە بشۆرێ بە ئاو و نوێژی پێوە بکات.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت: جاءت فاطمة ابنة أبي حبيش إلى النبيﷺ فقالت يا رسول الله، إني امرأة أستحاض فلا أطهر، أفأدع الصلاة؟ فقال رسول اللهﷺ: «لا. إنما ذلك عرق، وليس بحيض، فإذا أقبلت حيضتك فدعي الصلاة، وإذا أدبرت فاغسلي عنك الدم ثم صلي» قال: وقال أبي: «ثم توضئي لكل صلاة حتى يجيء ذلك الوقت») ئەفەرموێ فاطمەی کچی ئەبوحبیش هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ عەرزی کرد من ئافرەتێم هەمیشە وام لە حەیزدا ئایا واز بێنم لە نوێژ، ئەویش فەرمووی نەخێر ئەوە حەیز نی یە، بەڵکو ئەوە خوێنی دەمارەو حەیز نی یە، ئینجا کاتێ کاتی حەیز هات بە پێی باوی لەوەو پێش واز بێنەو نوێژ مەکەو کاتێ ماوەکەت تەواو بوو خۆت بشۆرەو نوێژ بکە. ئینجا باوکم کە (ئیبن الزبیر) ئەبو حوبەیش ئەمەی پێ گوتم بۆ هەموو نوێژێک دەست نوێژ بگرە هەتا کاتی حەیزت دێت.

***　***　***

## ٦٤ـ بَابُ غَسْلِ الْمَنِيِّ وَفَرْكِهِ، وَغَسْلِ مَا يُصِيبُ مِنَ الْمَرْأَةِ

٢٢٩ـ حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ. أَخْبَرَنَا عَبْدُاللهِ قَالَ أَخْبَرَنَا عَمْرُو بْنُ مَيْمُونٍ الْجَزَرِيُّ عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: «كُنْتُ أَغْسِلُ الْجَنَابَةَ مِنْ ثَوْبِ النَّبِيِّﷺ، فَيَخْرُجُ إِلَى الصَّلاَةِ وَإِنَّ بُقَعَ الْمَاءِ فِي ثَوْبِهِ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٣٠، ٢٣١، ٢٣٢)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٣٠ـ حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا يَزِيدُ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرٌو عَنْ سُلَيْمَانَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ ح. وَحَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ مَيْمُونٍ عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ يَسَارٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنِ الْمَنِيِّ يُصِيبُ الثَّوْبَ فَقَالَتْ: «كُنْتُ أَغْسِلُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِﷺ فَيَخْرُجُ إِلَى الصَّلاَةِ وَأَثَرُ الْغَسْلِ فِي ثَوْبِهِ بُقَعُ الْمَاءِ».

(باب غسل المني وفركه، وغسل ما يصيب من المرأة) ئەمە بابی ئەوەیە کە ناوی

شەهوەت بە لیباسەوە هەبوو بە ئاخون بکرێتەوێ و پێویست نیە شۆرین، وە پێویستە شۆرینی ئەوەی کە کەوتووە لە ئافرەتەکەوە، لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت: «کنت أغسل الجنابة من ثوب النبيﷺ، فیخرج إلي الصلاة و إن بقع الماء في ثوبه») ئەفەرموێ من ئاوی شەهوەتم ئەشۆرد لە جل و بەرگی پێغەمبەرﷺ ئینجا ئەڕۆشت بۆ نوێژ لە کاتێکدا پەڵە پەڵەی ئاو لە لیباسەکەیدا دیار بوو.

ئەم حەدیسە کراندنەکەی نەهێنا، بەڵکو لە بابەکەدا دەست نیشانی بۆ کرد. حەدیسی کراندنەکەی لێرەدا نەهێنا، چونکە لە دایکمانەوە ئەو حەدیسەش هاتووە وەک لەمەو پاش پێی ئەگەین. ئینجا هیچ دژایەتی‌یەک نی‌یە لە نێوان ئەو دوو حەدیسەدا، چونکە یەک ئەخرێن بەمەی شۆرینەکە بۆ پاک و خاوێن کردنە نەک واجب بێت. لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە دروستە پرسیار کردن لە شتێ کە شەرمی لێ دەکرێ. هەروەها خزمەت کردنی ئافرەت بۆ مێردی.

ئینجا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە دایکمان عائشەوە -خوای لێ رازی بێت- کە پرسیاری لێ کرا لە ئاوی شەهوەت کە بە جل و بەرگەوە بێت لە وەڵامدا فەرمووی: («کنت أغسله من ثوب رسول اللهﷺ فیخرج إلى الصلاة وأثر الغسل في ثوبه بقع الماء») من ئەوەم ئەشۆرد لە پۆشاکی پێغەمبەرﷺ لە کاتێکدا ئاساری غوسڵەکە مابووەوە پێوەی بە چەند پەڵەیەک لە ئاو. ئینجا سلیمانی کوڕی یەسار خۆی ئەگێڕێتەوە لە دایکی ئیماندارانەوە ئەو هەواڵە ئەدات و بەمەش ئەو مەسەلەیە بەهێزتر دەکات.

***　　***　　***

## ٦٥ـ بَابُ إِذَا غَسَلَ الْجَنَابَةَ أَوْ غَيْرَهَا فَلَمْ يَذْهَبْ أَثَرُهُ

٢٣١ـ حَدَّثَنَا مُوسَى بنُ إِسْمَاعِيلَ الْمِنْقَرِيُّ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَاحِد قَالَ: حَدَّثَنَا عَمْرُو ابنُ مَيْمُونَ قَالَ: سَمِعْتُ سُلَيْمَانَ بنَ يَسَارٍ فِي الثَّوْبِ تُصِيبُهُ الْجَنَابَةُ قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ: «كُنْتُ أَغْسِلُهُ مِنْ ثَوْبِ رَسُولِ اللهِﷺ ثُمَّ يَخْرُجُ إِلَى الصَّلاَةِ وَأَثَرُ الْغَسْلِ فِيهِ بُقَعُ الْمَاءِ».

٢٣٢ـ حَدَّثَنَا عَمْرُو بنُ خَالِدٍ قَالَ حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ قَالَ حَدَّثَنَا عَمْرُو بنُ مَيْمُونِ بنِ مِهْرَانَ

عَنْ سُلَيْمَانَ بنِ يَسَارٍ عَنْ عَائِشَةَ أنَّهَا كَانَتْ تَغْسِلُ الْمَنِيَّ مِنْ ثَوْبِ النَّبِيِّ ﷺ ثُمَّ أَرَاهُ فِيهِ بُقْعَةً أَوْ بُقَعًا.

ئەم حەدیسانە لە بابی پێشوودا شەرح کران.

***     ***     ***

## ٦٦ـ بَابُ أَبْوَالِ الإِبِلِ وَالدَّوَابِّ وَالْغَنَمِ وَمَرَابِضِهَا

وَصَلَّى أَبُو مُوسَى فِي دَارِ الْبَرِيدِ وَالسِّرْقِينِ، وَالْبَرِّيَّةُ إِلَى جَنْبِهِ فَقَالَ: هَا هُنَا وَثَمَّ سَوَاءٌ

٢٣٣ـ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بنُ حَرْبٍ قَالَ حَدَّثَنَا حَمَّادُ بنُ زَيْدٍ عَنْ أَيُّوبَ عَنْ أَبِي قِلَابَةَ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: قَدِمَ أُنَاسٌ مِنْ عُكْلٍ -أَوْ عُرَيْنَةَ فَاجْتَوَوُا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَهُمُ النَّبِيُّ ﷺ بِلِقَاحٍ وَأَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَانْطَلَقُوا. فَلَمَّا صَحُّوا قَتَلُوا رَاعِيَ النَّبِيِّ ﷺ، وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ. فَجَاءَ الْخَبَرُ فِي أَوَّلِ النَّهَارِ، فَبَعَثَ فِي آثَارِهِمْ. فَلَمَّا ارْتَفَعَ النَّهَارُ جِيءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ فَقَطَعَ أَيْدِيَهُمْ وَأَرْجُلَهُمْ وَسُمِّرَتْ أَعْيُنُهُمْ وَأُلْقُوا فِي الْحَرَّةِ يَسْتَسْقُونَ فَلَا يُسْقَوْنَ.

قَالَ أَبُو قِلَابَةَ: فَهَؤُلَاءِ سَرَقُوا، وَقَتَلُوا، وَكَفَرُوا بَعْدَ إِيمَانِهِمْ، وَحَارَبُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٥٠١، ٣٠١٨، ٤١٨٢، ٤١٩٣، ٤٦١٠، ٥٦٨٥، ٥٦٨٦، ٥٧٢٧، ٦٨٠٢، ٦٨٠٣، ٦٨٠٤، ٦٨٠٥، ٦٨٩٩)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٣٤ـ حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: أَخْبَرَنَا أَبُو التَّيَّاحِ يَزِيدُ بنُ حُمَيْدٍ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي -قَبْلَ أَنْ يُبْنَى الْمَسْجِدُ- فِي مَرَابِضِ الْغَنَمِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٢٨، ٤٢٩، ١٨٦٨، ٢١٠٦، ٢٧٧١، ٢٧٧٤، ٢٧٧٩، ٣٩٣٢)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب أبوال الإبل والدواب والغنم ومرابضها) ئەمە بابێکە کە باسی حوکمی میزی حوشترو وڵاخ و مەڕو بزن و پەچەکانیان دەکات و ئەفەرموێ: (وصلى أبو موسى في دار البريد والسرقين، والبرية إلى جنبه فقال: ها هنا وثم سواء) ئەم ئەسەرە ئەهێنێ ئەبو موسای ئەشعەری لە (دار البريد)دا نوێژی بۆ کردین لە کاتێکدا سەنێرگەو دەشت لە پاڵیدا بوو وە فەرمووی ئێرەو ئەوێ یەکسانە. واتە لە هەرکام نوێژ بکەین دروستە، کەواتە میزو

سەنێری ئەو گیانلەبەرانە پاکە. (دار البريد) ناوە بۆ شوێنێ لە کوفە کە هەر فەرمانێ بهاتایە لە خەلیفەوە نێرراوەکان ئەهاتنە ئەو شوێنە کە ولاخیان لێ بوو لەوێدا ئەیان بەستەوە. بە کورتی ئەبو موسا لەو شوێنە ناپوختەدا نوێژی بۆ ئەکردین لە کاتێکدا شوێنی پاک دەست ئەکەوت و ئەو ئەیفەرموو ئێرەو ئەو شوێنە پاکانە یەکسانەو نوێژیان تێدا دروستە.

ئینجا لە پاش ئەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە (قال: قدم أناس من عكل -أو عرينة فاجتووا المدينة، فأمرهم النبيﷺ بلقاح وأن يشربوا من أبوالها وألبانها، فانطلقوا. فلما صحوا قتلوا راعي النبيﷺ، واستاقوا النعم. فجاء الخبر في أول النهار، فبعث في آثارهم. فلما ارتفع النهار جئ بهم، فأمر فقطع أيديهم و أرجلهم وسمرت أعينهم وألقوا في الحرة يستسقون فلا يسقون) چەند کەسێک لە تیرەی عکل یان عرینە راوییەکە دوو دڵە ئایا کامیانی گوت هاتن بۆ مەدینەو موسڵمان بوون و بەیعەتیان داو مانەوەیان لە مەدینە پێ ناخۆش بوو ئاو و هەوای مەدینەیان پێ ناخۆش بوو گوتیان ئێمە گەلەدارین فێری شیرو ماست و دۆین، لەبەر ئەوە پێغەمبەرﷺ ئەمری کرد کە بیانبەنە ناو حوشتری بیت المال لای شوانی گەلەکەو فەرمانی دا کە لە شیرو میزی ئەو حەیوانانە بخۆن کە دەرمانی ئەخۆشییەکەیان بوو، ئینجا کاتی خۆش بوونەوە و تەندروستییان پەیدا بوو شوانەکەی پێغەمبەریانﷺ کوشت و تالانییەکەیان برد، بەیانی زوو ئەو هەواڵە هات و ئەویش ناردی بە دوایانداو و گرتنیان و هێنانیانەوەو پێغەمبەرﷺ فەرمانی دا کە دەست و قاچیان برین و چاویان هەڵکۆڵین و تورِ درانە شوێنێ لە مەدینە کە ناویانگە بە حەررە کە بەردە وردەی تێدا یەو نزیک بوو لەو شوێنەی کە تاوانەکەیان تێدا کردبوو، هاواریان دەکرد بۆ ئاو و ئاویان پێ نەئەدان. (قال أبو قلابة: فهؤلاء سرقوا، وقتلوا، وكفروا بعد إيمانهم، وحاربوا الله ورسوله) ئەبو قلابە ئەفەرموێ: ئەوانە دزی و جەردەییان کردو پیاویان کوشت و هەڵگەرانەوە لە ئاینێ و جەنگیان کرد لەگەڵ خواو پێغەمبەرﷺ، واتە ئەو تۆڵە سەختە لەبەر ئەو هەموو تاوانە گەورانەیە. لەم حەدیسەدا چەند شتێک وەرئەگیرێ و بۆ ئەم بابە مەبەست خواردنەوەی میزی ئەو حوشترانەیە کە ئایا میزی حوشتر پاکە یان پاک نییەو بۆ تەداوی دروستە خواردنەوەی بەو حەدیسەو هەموو گۆشت خوراوەکانی تریش بە قیاس جا لەبەر ئەوە زانایانی ئیسلام ئیختیلافیان هەیە لەوەدا وەک لە کتێبەکانی فیقهدا نووسراوە.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنن لە ئەنەسەوە کە (قال. قال النبي ﷺ یصلي قبل ان یبني المسجد- في مرابض الغنم) ئەفەرمووێ پێغەمبەرﷺ نوێژی ئەکرد لە پەچەی مەڕو بزندا پێش ئەوەی مزگەوت بینا بکات و لە حەدیسی سەحیحدا هاتووە لە دایکی ئیماندارانەوە عائشەوە کە پێغەمبەرﷺ پێش ئەوەی مزگەوت بینا بکات فەرمانی دا کە لە ماڵەکانیاندا بینای مزگەوت بکەن و فەرمانی دا کە پاک و خاوێنییان بکەن، کەواتە نوێژکردنی لە پەچەی مەڕو بزندا ئەبێ لە پاش ئەوەی پاک و خاوێنیان کردبێ، بەم جۆرە دژایەتی رووئادات لە نێوان حەدیسەکاندا

***   ***   ***

٦٧ـ بَابُ مَا يَقَعُ مِنَ النَّجَاسَاتِ فِي السَّمْنِ وَالْمَاءِ

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: لاَ بَأْسَ بِالْمَاءِ مَا لَمْ يُغَيِّرْهُ طَعْمٌ أَوْ رِيحٌ أَوْ لَوْنٌ.

وَقَالَ حَمَّادٌ: لاَ بَأْسَ بِرِيشِ الْمَيْتَةِ.

وَقَالَ الزُّهْرِيُّ فِي عِظَامِ الْمَوْتَى -نَحْوَ الْفِيلِ وَغَيْرِهِ- أَدْرَكْتُ نَاسًا مِنْ سَلَفِ الْعُلَمَاءِ يَمْتَشِطُونَ بِهَا وَيَدَّهِنُونَ فِيهَا وَلاَ يَرَوْنَ بِهِ بَأْسًا.

وَقَالَ ابْنُ سِيرِينَ وَإِبْرَاهِيمُ: وَلاَ بَأْسَ بِتِجَارَةِ الْعَاجِ.

٢٣٥ـ حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ قَالَ: حَدَّثَنِي مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِاللهِ بنِ عَبْدِاللهِ ابْنِ عُتْبَةَ بنِ مَسْعُودٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ سَقَطَتْ فِي سَمْنٍ، فَقَالَ: «أَلْقُوهَا وَمَا حَوْلَهَا فَاطْرَحُوهُ، وَكُلُوا سَمْنَكُمْ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٣٦ ، ٥٥٣٨ ، ٥٥٣٩ ، ٥٥٤٠)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٣٦ـ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بنُ عَبْدِاللهِ قَالَ: حَدَّثَنَا مَعْنٌ قَالَ حَدَّثَنَا مَالِكٌ عَنِ ابْنِ شِهَابٍ عَنْ عُبَيْدِاللهِ بنِ عَبْدِاللهِ بنِ عُتْبَةَ بنِ مَسْعُودٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنْ فَأْرَةٍ سَقَطَتْ فِي سَمْنٍ، فَقَالَ: «خُذُوهَا وَمَا حَوْلَهَا فَاطْرَحُوهُ». قَالَ مَعْنٌ: حَدَّثَنَا مَالِكٌ مَا لاَ أُحْصِيهِ يَقُولُ: عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ.

٢٣٧ـ حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بنُ مُحَمَّدٍ قَالَ أَخْبَرَنَا عَبْدُاللهِ قَالَ أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ عَنْ هَمَّامِ بنِ

مَنَبِّهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ كَلْمٍ يُكْلَمُهُ الْمُسْلِمُ فِي سَبِيلِ اللهِ تَكُونُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَهَيْئَتِهَا إِذْ طُعِنَتْ تَفَجَّرُ دَمًا: اللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ، وَالْعَرْفُ عَرْفُ الْمِسْكِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەكانی: (٢٨٠٣، ٥٥٣٣)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب ما يقع من النجاسات في السمن والماء) ئەمە بابی ئەوەیە ئەگەر شتی پیس كەوتە ناو رۆن یان ئاو حوكمی ئەوە چۆنە؟ وە لەم بارەیەوە ئەم ئەسەرە ئەهێنێ لە زوهرییەوە كە ئەفەرموێ: (لا بأس بالماء ما لم يغيره طعم أو ريح أو لون) لە بارەی ئاوەوە هیچ زیانێك نییە ئەگەر تام و بۆن یان رەنگی نەگۆڕێ. (وقال حماد: لا بأس بريش الميتة) وە حماد ئەڵێ پەڕو موی مردارەوە بوو زیانی نییەو بەوە پیس نابێ. (وقال الزهري في عظام الموتى -نحو الفيل وغيره- أدركت ناسا من سلف العلماء يمتشطون بها ويدهنون فيها ولا يرون به بأسا. وقال ابن سيرين وإبراهيم: ولا بأس بتجارة العاج) وە زوهری دەربارەی ئێسكی مردارەوە بووی وێنەی فیل و غەیری فیل ئەفەرموێ: چەند كەسێكم لە سەلەفی عولەما دیوە بەو ئێسكانە شانەیان دەكردو وە لەناو ئەو ئێسكانەدا رۆنیان دائەنا بۆ چەوركردنی موی سەریان، وە ئیبن سیرین و ئیبراهیم هیچ ناڕەواییان نەئەبینی لە كڕین و فرۆشتنی عاجدا كە ئێسكی فیلە.

لە پاش ئەم ئەسەرانە ئینجا دێتە سەر ئەم حەدیسە لە دایكی ئیمانداران مەیمونەوە -خوای لێ رازی بێت-(أن رسول الله ﷺ سئل عن فارة سقطت في سمن، فقال: «ألقوها وما حولها فاطرحوه، وكلوا سمنكم») كە پرسیار كرا لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی مشكێ بكەوێتە ناو رۆنەوە ئەویش فەرموی مشكەكەو دەورویەری تورِ دەن، ئیتر رۆنەكەتان بخۆن. وە مەبەست بە رۆنی بەستووە نەك رۆنی تەڕ وەك لە ریوایەتی پێشووەوە هاتووە. وە ریوایەتی ئەبو هورەیرە كە ئەفەرموێ: (سئل رسول الله ﷺ عنال فأرة تقع في السمن فقال: إذا كان جامدا فألقوها وما حولهاو إن كان مائعا فلا تقربوها) جا لەبەر ئەوەی جمهور بە پێی ئەم حەدیسەن و هێندێ لەسەر ئەوەن كە وشك و تەڕ یەكسانە.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموی: («كل كلم يكلمه المسلم في سبيل الله تكون يوم القيامة كهيئتها إذ طعنت تفجر دما: اللون لون

الدم، والعرف عرف المسك) هەر زامێ کە بکرێ لە هەر موسڵمانێ لە ڕێی خوادا لە ڕۆژی قیامەتدا پەیدا ئەبێتەوە بەو شێوەی خۆیە کە بوویەتی لەو کاتەدا کە زامەکەی لێ کراوەو خوێنەکەی هەڵئەقوڵێ و ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنەو بۆنەکەی بۆنی میسکە. ئەو خوێنە پەیدا ئەبێتەوە تا ببێ بە شایەت لەسەر موسڵمانەکەو بە دژی زاڵمەکە وە بۆنەکەش بۆنی میسکە تا بچێ بە لوتی ئەهلی حەشردا بۆ دەرخستنی فضل و بەهرەی ئەو زامدارە موسڵمانە. ئینجا لێرەدا ڕەخنە گیراوە لە ئیمامی بوخاری بەمەی ئەم حەدیسە نابێتە بەڵگە لەسەر پاکی و پیسی خوێن، کەواتە پەیوەندی نییە بە بابەکەوە. لە وەڵامدا گوتراوە ئیمام ئەم حەدیسەی هێناوە بەبەڵگە لەسەر ئەوەی هەر شتێکی پاک پیس نابێ تەنها بە لێکەوتنی شتی پیس ماتوڵێ تام و بۆن و ڕەنگی نەگۆڕێ، وە ئەو گۆڕانە کار ئەکات تا ئەو ڕادەی سیفەتی پاکێتی ناهێڵێ و ئەیگێڕێ بە پیس. هەرچۆنێ گۆڕانی خوێنی شەهیدەکە خوێنەکە ئەکات بە شتێکی ترو خۆشەویست و سوپاس کراو. بە ڕاستی بۆچوون و فەهمێکی نایابە.

*** *** ***

## ٦٨ـ بَابُ الْبَوْلِ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ

٢٣٨ـ حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ قَالَ أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ قَالَ أَخْبَرَنَا أَبُو الزِّنَادِ أَنَّ عَبْدَالرَّحْمَنِ بنَ هُرْمُزَ الأَعْرَجَ حَدَّثَهُ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: «نَحْنُ الآخِرُونَ السَّابِقُونَ».

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٨٧٦، ٨٩٦، ٢٩٥٦، ٣٤٨٦، ٦٦٢٤، ٦٨٨٧، ٧٠٣٦، ٧٤٩٥)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٣٩ـ وَبِإِسْنَادِهِ قَالَ: «لاَ يَبُولَنَّ أَحَدُكُمْ فِي الْمَاءِ الدَّائِمِ الَّذِي لاَ يَجْرِي ثُمَّ يَغْتَسِلُ فِيهِ».

(باب البول في الماء الدائم) ئەمە بابی ئاوی وەستاوە. ئینجا لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (أنه سمع رسول اللهﷺ يقول: «نحن الآخرون السابقون») کە بیستی لە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئێمە دواکەوتووە پێشکەوتووەکانین. واتە پاش هەموو ئومەتان هاتووین و لە ئەجرو پاداشتدا پێشکەوتوانی هەموو ئومەتەکانین، لەبەر ئەوەی جێگرو نوێنەری هەموو ئومەتەکانین و زۆرترین لە هەمووان و تەواوکەری هەموو ئایین و

شەریعەتەکانین. ئەم فەرمودەیە لەم شوێنەدا هیچ پەیوەندییەکی بە بابەکەوە نییە لەبەرئەوە ڕەخنە گیراوە لە ئیمامی بوخاری بەمەی پەیوەندی نییە، لە وەڵامدا چەند قسەیەک گوتراوە باشترینیان ئەمەیە کە ئەبو هورەیرە ئەم وتەیەی بیستبێ لە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ حەدیسەکەی ئێرەدا بە یەکە سەنەد لەبەر ئەوە هەردووک پێکەوە ئەهێنێ، وە ئیمامی بوخاریش هەر شتێکی پێ گەیشتبێ ئەیگێڕێتەوە وەک لە پاش ئەو وتەیە ئەفەرموێ: (وبإسناده قال: «لا يبولن أحدكم في الماء الدائم الذي لا يجري ثم يغتسل فيه») با هیچ کەس لە ئێوە میز نەکاتە ئاوێکی هەمیشەیی کە وەستاو بێت و ئینجا خۆی بشوات تێیدا. واتە میزکردنە ئاوی وەستاو شتێکی ناجۆرەو لەوانەیە لە پاشان پێویستی ببێ پێی بۆ غوسڵ، ئەو کاتە ئەگەر ئەو ئاوە کەمتر بێت لە قولەتێن بەو میزە پیس ئەبێت و ئیتر دروست نییە بەکارهێنانی وە ئەگەر قولەتێنیش بێت قیزەون ئەبێت لەوانەیە ببێ بە هۆی نەخۆشی. کاری ئیسلام هەر خێرەو با لە هەموو شتێکدا گوێڕایەڵی بکرێ.

*** *** ***

### ٦٩ـ بَابُ إِذَا أُلْقِيَ عَلَى ظَهْرِ الْمُصَلِّي قَذَرٌ أَوْ جِيفَةٌ لَمْ تَفْسُدْ عَلَيْهِ صَلاَتُهُ

وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا رَأَى فِي ثَوْبِهِ دَمًا وَهُوَ يُصَلِّي وَضَعَهُ وَمَضَى فِي صَلاَتِهِ.

وَقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ وَالشَّعْبِيُّ: إِذَا صَلَّى وَفِي ثَوْبِهِ دَمٌ أَوْ جَنَابَةٌ أَوْ لِغَيْرِ الْقِبْلَةِ أَوْ تَيَمَّمَ فَصَلَّى ثُمَّ أَدْرَكَ الْمَاءَ فِي وَقْتِهِ لاَ يُعِيدُ.

٢٤٠ـ حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ أَخْبَرَنِي أَبِي عَنْ شُعْبَةَ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ عَنْ عَمْرِو بنِ مَيْمُونَ عَنْ عَبْدِاللهِ قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللهِﷺ ح. قَالَ وَحَدَّثَنِي أَحْمَدُ بنُ عُثْمَانَ قَالَ حَدَّثَنَا شُرَيْحُ بنُ مَسْلَمَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بنُ يُوسُفَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: حَدَّثَنِي عَمْرُو بنُ مَيْمُونَ أَنَّ عَبْدَاللهِ بنَ مَسْعُودٍ حَدَّثَهُ أَنَّ النَّبِيَّﷺ كَانَ يُصَلِّي عِنْدَ الْبَيْتِ وَأَبُو جَهْلٍ وَأَصْحَابٌ لَهُ جُلُوسٌ إِذْ قَالَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ أَيُّكُمْ يَجِيءُ بِسَلَى جَزُورِ بَنِي فُلاَنٍ فَيَضَعُهُ عَلَى ظَهْرِ مُحَمَّدٍ إِذَا سَجَدَ فَانْبَعَثَ أَشْقَى الْقَوْمِ فَجَاءَ بِهِ، فَنَظَرَ حَتَّى إِذَا سَجَدَ النَّبِيُّﷺ وَضَعَهُ عَلَى ظَهْرِهِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ وَأَنَا أَنْظُرُ لاَ أُغْنِي شَيْئًا، لَوْ كَانَتْ لِي مَنَعَةٌ قَالَ: فَجَعَلُوا يَضْحَكُونَ وَيُحِيلُ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ، وَرَسُولُ اللهِﷺ سَاجِدٌ لاَ يَرْفَعُ رَأْسَهُ، حَتَّى جَاءَتْهُ فَاطِمَةُ

فَطَرَحَتْ عَنْ ظَهْرِهِ، فَرَفَعَ رَأْسَهُ ثُمَّ قَالَ: «اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِقُرَيْشٍ» ثَلاَثَ مَرَّاتٍﷺ فشق عليه إِذَا دَعَا عَلَيْهِمْﷺ قَالَ: وَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّ الدَّعْوَةَ فِي ذَلِكَ الْبَلَدِ مُسْتَجَابَةٌ ثُمَّ سَمَّى: «اللَّهُمَّ عَلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ، وَعَلَيْكَ بِعُتْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ، وَشَيْبَةَ بْنِ رَبِيعَةَ وَالْوَلِيدِ بْنِ عُتْبَةَ، وَأُمَيَّةَ بْنِ خَلَفٍ، وَعُقْبَةَ بْنِ أَبِي مُعَيْطٍ» وَعَدَّ السَّابِعَ فَلَمْ نَحْفَظْهُ قَالَ: فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، لَقَدْ رَأَيْتُ الَّذِينَ عَدَّ رَسُولُ اللَّهِﷺ صَرْعَى فِي الْقَلِيبِ، قَلِيبِ بَدْرٍ.

(باب إذا ألقي على ظهر المصلي قذر أو جيفة لم تفسد عليه صلاته) ئەمە بابێکە لە بارەی ئەوەوە ئەگەر شتێکی پیس یان مردارەوە بوویەک بخرێتە سەر پشتی کەسێک کە نوێژ بکات نوێژەکەی بەتاڵ ناکاتەوە، ئینجا ئەم ئەسەرانە دێنێ ئەفەرموێ: (وكان ابن عمر إذا رأى في ثوبه دما وهو يصلي وضعه ومضى في صلاته) ئیبن و عمر -خوا لێیان رازی بێت- ئەگەر خوێنێکی بدیتایە لە کاتێکدا لە نوێژدا بوو ئەو لیباسەی لائەبردو لەسەر نوێژەکەی ئەڕۆیشت و نەیئەبڕی. وە نافع ئەگێڕێتەوە لێیەوە ئەگەر لە نوێژدا پیسییەکی بدیتایە و بکوڵجایە لیباسەکەی فڕێ ئەداو نوێژەکەی تەواو ئەکرد. وە ئەگەر ئەکوڵجایە لە نوێژەکەی دەرئەچوو ئەیشۆردو ئەگەڕایەوەو نوێژەکەی تەواو ئەکرد لەوێوە کە دەرئەچوو. وە حەدیسی سەحیح قۆڵگیرە بۆ ئەم رایە وەک مشهورە کە جارێ نوێژ ئەکرا بە نەعلەکانەوە پێغەمبەرﷺ لە نوێژدا نەعلەکانی داکەندو نوێژەکەی تەواوکرد وە هاوەڵەکانیش لە نوێژەکەیاندا نەعلەکانیان داکەند کە لە نوێژ بوونەوە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: من جوبرەئیل هەواڵی پێدام کە نەعلەکانم پیسی پێوەیە بۆیە دام کەند ئێوە بۆچی داتان کەند. وە لەم بارەیەوە زانایان رای جیاوازیان هەیە هێندێ ئەم رایە پەسەند ئەکەن و شافیعی ئەحمەد ئەفەرمون نوێژەکەی بکاتەوە و مالک تا کاتی نوێژ مابێ و ئەگەر پاش کات پێی زانی قەزای ناکاتەوە. ئەم مەسەلەیە لە کتابی (الصلاة)دا دێت، با لەوێ سەرنج بدرێ.

ئینجا دێتە سەر ئەم دوو ئەسەرە (وقال ابن المسيب والشعبي: إذا صلى وفي ثوبه دم أو جنابة أو لغير القبلة أو تيمم فصلى ثم أدرك الماء في وقته لا يعيد) ئەم دوو ئیمامە ئەفەرمون ئەگەر نوێژی کرد وە بە پۆشاکەکەیەوە خوێن هەبوو یا ئاوی شەهوەت یان بەرەو قیبلە نوێژی نەکردبێ یان بە تەیەموم نوێژی کردبێ و ئینجا ئاوی دەست کەوێ و هێشتا نوێژ مابێ

دووبارەی نەکاتەوە دروستە. ئینجا بە پێی ئاساری زۆر لە پێشەوایان لە مەسەلەی ئەو خوێنەدا کە پێی نەزانیبێ لە نوێژەکەدا وە مەسەلەی شەهوەتەکە لای کەسێکە کە بە لایەوە پیسە وە لە مەسەی قیبلەکەدا بە مەرجێکە بە ئیجتیهاد رووی کردبێتە ئەو شوێنە وە لە بارەی تەیەمومەکەوە بە مەرجێ ئاوی دەست نەکەوتبێ لە کاتی نوێژەکەدا. وە لە بارەی هەڵە لە قیبلەدا حەنەفی و مالیک و ئەحمەدو شافیعی لە قولی قدیمیدا ئیعادەی نەکاتەوەو رای زۆربەش لەسەر ئەوەیە.

ئینجا دێتە سەر حەدیسی بابەکە ئەیهێنێ لە عبداللەوە (بینا رسول اللهﷺ ساجد) لە ریوایەتی تردا لە عومەری کوڕی میمونەوە کە (أن عبدالله بن مسعود حدثه أن النبيﷺ كان يصلي عند البيت وأبو جهل وأصحاب له جلوس إذ قال بعضهم لبعض أيكم يجئ بسلى جزور بني فلان فيضعه على ظهر محمد إذا سجد فانبعث أشقى القوم فجاء به، فنظر حتى إذا سجد النبيﷺ وضعه على ظهره بين كتفيه وأنا أنظر لا أغني شيئا، لو كانت لي منعة قال: فجعلوا يضحكون ويحيل بعضهم على بعض، ورسول اللهﷺ ساجد لا يرفع رأسه، حتى جاءته فاطمة فطرحت عن ظهره، فرفع رأسه ثم قال: «اللهم عليك بقريش» ثلاث مراتﷺ فشق عليه إذا دعا عليهمﷺ قال: وكانوا يرون أن الدعوة في ذلك البلد مستجابة ثم سمى: «اللهم عليك بأبي جهل، وعليك بعتبة بن ربيعة، وشيبة بن ربيعة، والوليد بن عتبة، وأمية بن خلف، وعقبة بن أبي معيط» وعد السابع فلم نحفظه قال: فوالذي نفسي بيده، لقد رأيت الذين عد رسول اللهﷺ صرعى في القليب، قليب بدر)

عبدالله ئەفەرموێ: جارێ پێغەمبەرﷺ نوێژی ئەکرد لای کەعبەداو ئەبو جەهل و چەند کەسێک لە هاوەڵانی لەوێدا دانیشتبوون، ئینجا هێندێکیان گوتیان بە هێندێکیان کامتان دەچن لە سروانی حوشترەکانی فلان کەس ئەهێنێ و کاتێ محمد ئەچێتە بە سوژدەدا بیخەنە سەر پشتی و بەینی هەردوو شانی، عبدالله ئەڵێ: من بە چاوەوە بووم و هیچم پێ نەئەکرا ناخ دەسەڵاتم ببوایە. ئینجا دەستیان کرد بە قاقای پێکەنین و ئەکەوتن بە مل یەکداو پێغەمبەریش سەری بەرز نەئەکردەوە تا فاطمەی کچی هات و شتەکەی فڕێدا ئینجا سەری بەرز کردەوەو سێ جار نزای شەڕی لە قورەیش بە گشتی و بە تایبەتیش لە ئەبو جەهل و و عوتبەی کوڕی رەبیعەو شەیبەی رەبیعەو وەلید کوڕی عوتبەو ئومەیەی کوڕی خەلەف و

عوقبەی کوڕی ئەو موعیط و حەوتەمیشی ناویرد، بەلام عبدالله ناوەکەی لە بیرچوو ئەویش عمارەی کوڕی وەلید بوو. ئینجا عبدالله ئەفەرموێ: سوێند بە کەسێ گیانی منی بە دەستە ئەوانەم بینی لە غەزای بەدردا خرانە ناو بیرەکەی بەدر. ئەفەرموێ: کاتێ پێغەمبەرﷺ نزاکەی لێ کردن هەموو تێک چوون و ترسیان لێ نیشت، چونکە ئەیانزانی دوعاکەی گیرا ئەبێ،چونکە لای بیت بوو کە ڕێزی بوو لای ئەوانیش، ئەوان ئەیانزانی پێغەمبەر ڕاستەو بە عیناد ئیمانیان نەئەهێنا. مەبەست لە حەدیسەکە لێرەدا ئەمەیە کە بەڵگەیە لەسەر مەبەست و عینوانی بابەکە. وە دەرئەکەوێ شەجاعەتی حەزرەتی فاطمە کە پەلاماری داو نرخی بۆ ئەو زاڵمانە دانەنا. هەروەها دەرئەکەوێ نزای شەڕ لە زاڵمان ڕەوایە بە شێوەی گشتی و بە تایبەتی بۆ ئێمە چاک نییە بەلام بۆ پێغەمبەرﷺ ڕەوایە کە بۆی دەرکەوتووە ئەوانە باوەڕ ناهێنن.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٥٢٠، ٢٩٣٤، ٣١٨٥، ٣٨٥٤، ٣٩٦٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٧٠ـ بَابُ الْبُزَاقِ وَالْمُخَاطِ وَنَحْوِهِ فِي الثَّوْبِ

قَالَ عُرْوَةُ عَنِ الْمِسْوَرِ وَمَرْوَانَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ زَمَنَ حُدَيْبِيَةَ... فَذَكَرَ الْحَدِيثَ: وَمَا تَنَخَّمَ النَّبِيُّ ﷺ نُخَامَةً إِلاَّ وَقَعَتْ فِي كَفِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ فَدَلَكَ بِهَا وَجْهَهُ وَجِلْدَهُ.

٢٤١ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ يُوسُفَ قَالَ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ حُمَيْدٍ عَنْ أَنَسٍ قَالَ: بَزَقَ النَّبِيُّ ﷺ فِي ثَوْبِهِ.

طَوَّلَهُ ابْنُ أَبِي مَرْيَمَ قَالَ: أَخْبَرَنَا يَحْيَى بنُ أَيُّوبَ حَدَّثَنِي حُمَيْدٌ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسًا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ.

(باب البزاق والمخاط ونحوه في الثوب) ئەمە بابی تف و چڵم و وێنەیانە کە ئایا حوکمی چییە؟ وە لە م بارەیەوە ئەم ئەسەرە ئەهێنێ لە عوروەوە ئەویش لە مسوەرو مەروانەوە (خرج النبيﷺ زمن حديبية... فذكر الحديث:) سالی حودەیبیە لە مەدینەوە دەرچوو بەرەو مەککە بۆ عومرە لەپاشان قورەیش ڕێگەیان نەداو کەوتنەوە مفاوزەزەوە وەک لەمەوپاش

دێت. وە لە لایەن سەرۆکی یەکێ لە وەفدەکان ئەمە هەبوو کە گوتی: (وما تنخم النبي ﷺ نخامة إلا وقعت في كف رجل منهم فدلك بها وجهه وجلده) ئامۆژگاری قورەیشی کردو گوتی دەنگ لەگەڵ ئەم پیاوە مەکەن، چونکە کیسراو قەیسەرو نجاشیم دیوە ئەو خۆشەویستی و فیداکاری یەی کە دیومە لە هاوەڵەکانی محمد لە هیچ کەسم نەدیوە هەر تف و چڵمی فرێدا هەرکام لە هاوەڵەکانی دەستی بۆ ئەگرتەوەو نایەڵن بکەوێتە سەر زەوی، بەڵکو بە دەست ئەیگرنەوەو ئەیسون لە دەم چاویان لێرەدا ئەمە مەبەستە کە تف و چڵم و بەڵغەم پاکەو بەرپەرچە بۆ ئەوانەی کە بە لایانەوە پیسە. ئینجا ئەسەرو حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە (قال: بزق النبي ﷺ في ثوبه) هەروەها حميد ئەفەرموێ: (سمعت أنسا عن النبي ﷺ).

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٤٠٥، ٤١٢، ٤١٣، ٥٣١، ٥٣٢، ٨٢٢، ١٢١٤، )دا دووبارە بووەتەوە.

***   ***   ***

## ٧١ـ بَابُ لاَ يَجُوزُ الْوُضُوءُ بِالنَّبِيذِ وَلاَ الْمُسْكِرِ

وَكَرِهَهُ الْحَسَنُ وَأَبُو الْعَالِيَةِ وَقَالَ عَطَاءٌ: التَّيَمُّمُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنَ الْوُضُوءِ بِالنَّبِيذِ وَاللَّبَنِ

٢٤٢ـ حَدَّثَنَا عَلِيُّ بنُ عَبْدِاللهِ قَالَ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ حَدَّثَنَا الزُّهْرِيُّ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ عَائِشَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ».

(باب لا يجوز الوضوء بالنبيذ ولا المسكر) دروست نی یە دەست نوێژگرتن بە نەبیزو نە بە هەرشتێ کە مەردوم سەرخۆش بکات وە حسن و أبو العاليه بێزاندوویانە (وقال عطاء: التيمم أحب إلي من الوضوء بالنبيذ واللبن) عەطا فەرموویەتی تەیەمومم پێ خۆشترە لە دەست نوێژ گرتن بە نەبیزو شیر. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکمان عائشەوە -خوای لێ رازی بێت- ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە (قال: «كل شراب أسكر فهو حرام») فەرمووی هەر خوراوەیەک کە سەرخۆش بکات ئەو خوارەوەیە حەرامەو بێگومان هەرچی حەرام بێت خواردنەوەی حەرامە دەست نوێژ پێ گرتنی بە لای هەموانەوە. لە بارەی نەبیزەوە لەمەو پاش دێت -إن شاء الله-.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٥٥٨٥، ٥٥٨٦)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٧٢ـ بَابُ غَسْلِ الْمَرْأَةِ أَبَاهَا الدَّمَ عَنْ وَجْهِهِ

وَقَالَ أَبُو الْعَالِيَةِ: امْسَحُوا عَلَى رِجْلِي فَإِنَّهَا مَرِيضَةٌ

**٢٤٣ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ قَالَ أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ بْنُ عُيَيْنَةَ عَنْ أَبِي حَازِمٍ سَمِعَ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ وَسَأَلَهُ النَّاسُ -وَمَا بَيْنِي وَبَيْنَهُ أَحَدٌ- : بِأَيِّ شَيْءٍ دُووِيَ جُرْحُ النَّبِيِّ ﷺ؟ فَقَالَ: مَا بَقِيَ أَحَدٌ أَعْلَمُ بِهِ مِنِّي: كَانَ عَلِيٌّ يَجِيءُ بِتُرْسِهِ فِيهِ مَاءٌ، وَفَاطِمَةُ تَغْسِلُ عَنْ وَجْهِهِ الدَّمَ ﷺ فَأُخِذَ حَصِيرٌ فَأُحْرِقَ، فَحُشِيَ بِهِ جُرْحُهُ.**

(باب غسل المرأة أباها الدم عن وجهه) ئەمە بابی ئەوەیە کە ئافرەت دەم و چاوی باوکی خۆی بشۆرێ کە خوێنی پێوە بێت (وقال أبو العالیة: امسحوا علی رجلي فإنها مریضة) ئینجا ئەم ئەسەرەی هێنا بۆ ئەم بابە ئەبولعالیە گوتی: مەسحی پێم بکەن، چونکە ئێشی هەیە. مەسح وەک شۆرین وایەو لەباتی شۆرین ئەکرێ کاتێ کە عوزر هەبێ بۆ نەشۆردن کەواتە بەڵگەیە لەسەر بابەکە. ئینجا حەدیسێ ئەهێنێ لە سهلی کوڕی سعدەوە کە پرسیاری لێ کرا چۆن تەداوی زامەکەی پێغەمبەرﷺ کرا کە لە أحددا زامدار کرا (بأي شيءٍ دووي جرح النبيﷺ؟ فقال: ما بقي أحد أعلم به مني: کان علي یجيءُ بترسه فیه ماء، وفاطمة تغسل عن وجهه الدمﷺ فأخذ حصیر فأحرق، فحشي به جرحه) لە وەڵامدا گوتی عەلی ئاوی هێناو فاطمە -خوای لێ رازی بێت- خوێنەکەی لە دەم و چاوی شۆرد، وە تەداویان کرد بە سوتەمەنی پارچە حەسیرێک بۆ ئەوەی خوێنەکەی بوەستێ. لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە تەداوی سوننەتەو دژی تەوەکول نییە ئەوەتا سەرداری هەموان تەداوی کردووە. وە مەبەستی ئیمامی بوخاری لە هێنانی ئەم حەدیسە لێرەدا ئەوەیە کە تەداوی شەرعییەو ئیتر نەخۆشەکە بیکات یان غەیری نەخۆشەکە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٩٠٣، ٢٩١١، ٣٠٣٧، ٤٠٧٥، ٥٢٤٨، ٥٧٢٢)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

## ٧٣ـ بَابُ السِّوَاكِ

وَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: بِتُّ عِنْدَ النَّبِيِّ فَاسْتَنَّ

٢٤٤ـ حَدَّثَنَا أَبُو النُّعْمَانِ قَالَ حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ زَيْدٍ عَنْ غَيْلاَنَ بْنِ جَرِيرٍ عَنْ أَبِي بُرْدَةَ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَوَجَدْتُهُ يَسْتَنُّ بِسِوَاكٍ بِيَدِهِ يَقُولُ: «أُعْ، أُعْ» وَالسِّوَاكُ فِي فِيهِ كَأَنَّهُ يَتَهَوَّعُ.

٢٤٥ـ حَدَّثَنَا عُثْمَانُ قَالَ حَدَّثَنَا جَرِيرٌ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ يَشُوصُ فَاهُ بِالسِّوَاكِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٨٨٩، ١١٣٦)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب السـواك) ئەمە بابی سیـواک کردنە، ئینجا ئەم ئەسەرە ئەهێنێ (وقـال ابن عبـاس: بت عند النبـي فـاستن) ئەفەرموێ: شەوێک مامەوە لای پێغەمبەرﷺ کە لە خەو هەستـا سیواکی کرد. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە کە (قال: أتيت النبيﷺ فوجدته يستن بسواك بيده يقول: «أع، أع» والسواك في فيه كانه يتهوع) فەرمووی چوومە خزمەت پێغەمبەر بە سیواکێک سیواکی دەکردو دەنگێ لە گەرووی دەهات وەک دەنگی کەسێک کە بیەوێ خۆی برشێنێتەوە. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە حوزەیفەوە کە (قال: كان النبيﷺ إذا قام من الليل يشوص فاه بالسواك) فەرمووی پێغەمبەرﷺ کاتێ لە شەودا کە هەڵئەسا بۆ شەونوێژ سیواکی دەکردو دەمی موبارەکی بە سیواک پاک و خاوێن دەکردەوە لە هەر تامێک کە بە هۆی خەوەوە پەیدا ئەبوو.

*** *** ***

## ٧٤ـ بَابُ دَفْعِ السِّوَاكِ إِلَى الأَكْبَرِ

٢٤٦ـ وَقَالَ عَفَّانُ: حَدَّثَنَا صَخْرُ بْنُ جُوَيْرِيَةَ عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَرَانِي أَتَسَوَّكُ بِسِوَاكٍ، فَجَاءَنِي رَجُلاَنِ أَحَدُهُمَا أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ، فَنَاوَلْتُ السِّوَاكَ الأَصْغَرَ مِنْهُمَا، فَقِيلَ لِي: كَبِّرْ، فَدَفَعْتُهُ إِلَى الأَكْبَرِ مِنْهُمَا».

(باب دفع السـواك إلى الأكبر) ئەمە بابی ئەوەیە ئەگەر دوو کەست لا بوو گەورەو بچووکێ وە ویستت سیواکیان بدەیتێ لە پێشەوە بە گەورەکەی بدە. وە لە م بارەیەوە ئەم

حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن و عومەرەوە -خوا لێیان رازی بێت- کە (أن النبي ﷺ قال: «أراني أتسوك بسواك، فجاءني رجلان أحدهما أكبر من الآخر، فناولت السواك الأصغر منهما، فقيل لي: كبر، فدفعته إلى الأكبر منهما») لەم حەدیسەوە دەرئەکەوێ ئەو کەسەی بە تەمەن گەورەتر بێت باوی ئەدرێ بەسەر تەمەن بچووکدا وە هەروەها خۆراک و شتی تریش بە مەرجێ بەرێز دائەنیشتبن وە ئەگەر بە ریز بوون لای راست پێش ئەخرێ. ئینجا وەرئەگیری بەکارهێنانی سیواکی غەیری ناشەرعی نی یە بەلام چاک وایە بشۆررێ ئینجا بەکاری بێنێ، لەم بارەیشەوە حەدیسێ هەیە لە دایکمان عائشەوە -خوای لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ سیواکی پێدام و منیش ئەم شۆردو سیواکم پێ کرد لە پاشان شۆردم و دامەوە پێی سیواکی پێ بکات. ئینجا ئایا ئەوەی پێ بێژراوە بیدە بە گەورەکە لە خەودا بووبێ یان لە بێداریدا هەردوو هەڵئەگرێ و بە هەردوو بارەکە گوتراوە لای زانایان و بە هەر حاڵ بەو جۆرە سوننەتە. (قال أبو عبدالله اختصره نعمي عن ابن المبارك عن أسامة عن نافع عن ابن عمر) ئیمامی بوخاری ئەفەرموێ ئەم مەتنی حەدیسەی کورت کردووەتەوە نعیم لە ابن مبارەکەوەو ئەویش لە ئوسامەوە ئەویش لە ئیبن عومەرەوە، کەواتە با بزانرێ ئەو کورت کردنەوە نابێ بە دژی درێژەکە.

***   ***   ***

## ٧٥ـ بَابُ فَضْلِ مَنْ بَاتَ عَلَى الْوُضُوءِ

٢٤٧ـ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ مُقَاتِلٍ قَالَ أَخْبَرَنَا عَبْدُاللهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا سُفْيَانُ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ سَعْدِ بنِ عُبَيْدَةَ عَنِ الْبَرَاءِ بنِ عَازِبٍ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ اضْطَجِعْ عَلَى شِقِّكَ الأَيْمَنِ، ثُمَّ قُلْ: اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ، وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ، وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ، رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ، لاَ مَلْجَأَ وَلاَ مَنْجَا مِنْكَ إِلاَّ إِلَيْكَ، اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ، وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ ﷺ فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ فَأَنْتَ عَلَى الْفِطْرَةِ. وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَتَكَلَّمُ بِهِ». قَالَ: فَرَدَّدْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا بَلَغْتُ: «اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ»، قُلْتُ: وَرَسُولِكَ. قَالَ: «لاَ وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ».

( باب فضل من بات على الوضوء ) ئەمە بابی ئەوەیە کە بە دەست نوێژەوە خەوتن کارێکی چاکەو ئەو کەسە هەڵساوە بە کارێکی خەیرو سوننەت، وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە بەرائی کوڕی عازیبەوە کە (قال: قال النبيﷺ : «إذا أتيت مضجعك فتوضأ وضوءك للصلاة، ثم اضطجع على شقك الأيمن، ثم قل: اللهم أسلمت وجهي إليك، وفوضت أمري إليك، وألجأت ظهري إليك، رغبة ورهبة إليك، لا ملجأ ولا منجا منك إلا إليك ، اللهم آمنت بكتابك الذي أنزلت، وبنبيك الذي أرسلتﷺ فإن مت من ليلتك فأنت على الفطرة. واجعلهن آخر ما تتكلم به». قال: فرددتها على النبيﷺ ، فلما بلغت: «اللهم آمنت بكتابك الذي أنزلت» قلت: ورسولك. قال: «لا ونبيك الذي أرسلت») کە فەرمووی پێغەمبەرﷺ فەرمووی پێم کاتێ چوویتە جێگای خەوو راکشان دەست نوێژ بگرە وەک دەست نوێژ بۆ نوێژکردن.

ئینجا بەسەری لای راستدا راکشێ دیارە روو بە قیبلە. ئینجا ئەم دوعایە بخوێنە ئیتر پاش ئەوە قسە مەکە. ئینجا ئەگەر لەو شەوەدا بمرێ لەسەر فیطرەت و ئایینی ئیسلام دەمری و خوا ئەو مردنەمان بە نیسب بکات

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٦٣١١، ٦٣١٣، ٦٣١٥، ٧٤٨٨)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

(٥)

## كتاب الغسل

وقَولُ اللهِ تَعالَى: ﴿ وإنْ كُنتُمْ جُنُبًا فاطَّهَّرُوا، وإنْ كُنتُمْ مَرْضَى أوْ عَلَى سَفَرٍ أوْ جَاءَ أحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أوْ لامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأيْدِيكُمْ مِنْهُ، مَا يُرِيدُ اللهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُمْ مِنْ حَرَجٍ وَلَكِنْ يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ (المائدة: ٦). وقَولِهِ جَلَّ ذِكْرُهُ: ﴿ يَاأيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَقْرَبُوا الصَّلاَةَ وَ أنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ وَلاَ جُنُبًا إلاَّ عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّى تَغْتَسِلُوا، وإنْ كُنتُمْ مَرْضَى أوْ عَلَى سَفَرٍ أوْ جَاءَ أحَدٌ مِنْكُمْ مِنَ الْغَائِطِ أوْ لامَسْتُمُ النِّسَاءَ فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأيْدِيكُمْ، إنَّ اللهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴾ (النساء: ٤٣).

ئینجا دێته سەر کیتابی غوسڵ ئەم دوو ئایەتە ئەهێنێ و مەبەستی ئیمام لەم ئایەتانە ئەوەیە غوسڵ بەقورئان واجبە، ئینجا ئایەتی سورەتی (المائدة)ی پێش خست لەئایەتی سورەتی (النساء)، چونکە ئایەتی (المائدة) مجملە نص نیە لە غوسڵدا وە مەبەستیش غوسڵە، کەواتە وا چاکە ئایەتی سورەتی (النساء) کە نصە لە غوسڵدا بێنێ بە دوایدا ببێ بە بەیان بۆ ئایەتی سورەتی (المائدة).

*** *** ***

## ١- بَابُ الْوُضُوءِ قَبْلَ الْغُسْلِ.

٢٤٨- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ هِشَامٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ بَدَأَ فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ يُدْخِلُ أَصَابِعَهُ فِي الْمَاءِ فَيُخَلِّلُ بِهَا أُصُولَ شَعْرِهِ، ثُمَّ يَصُبُّ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثَ غُرَفٍ بِيَدَيْهِ ثُمَّ يُفِيضُ عَلَى جِلْدِهِ كُلِّهِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەكانی: (٢٦٢، ٢٧٢)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٤٩- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ يُوسُفَ قَالَ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ سَالِمِ بنِ أَبِي الْجَعْدِ عَنْ كُرَيْبٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: تَوَضَّأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ غَيْرَ رِجْلَيْهِ، وَغَسَلَ فَرْجَهُ وَمَا أَصَابَهُ مِنَ الأَذَى، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَيْهِ الْمَاءَ ثُمَّ نَحَّى رِجْلَيْهِ فَغَسَلَهُمَا، هَذِهِ غُسْلُهُ مِنَ الْجَنَابَةِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەكانی: (٢٥٧، ٢٥٩، ٢٦٠، ٢٦٥، ٢٦٦، ٢٧٤، ٢٧٦، ٢٨١)دا دووبارە بووەتەوە.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب الوضوء قبل الغسل) ئەمە بابێكە لە بارەی ئەوەی كە دەست نوێژ بگیرێ لە پێش غوسڵدا وە لەم بارەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە دایكمان عائشە وەكو ئەفەرموێ: (أن النبي ﷺ كان إذا اغتسل من الجنابة بدأ فغسل يديه، ثم يتوضأ كما يتوضأ للصلاة، ثم يدخل أصابعه في الماء فيخلل بها أصول شعره، ثم يصب على رأسه ثلاث غرف بيديه ثم يفيض على جلده كله) ئینجا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ لە مەیمونەوە دایكی ئیمانداران و ئەفەرموێ: (توضأ رسول الله ﷺ وضوءه للصلاة غير رجليه، وغسل فرجه وما أصابه من الأذى، ثم أفاض عليه الماء) بێگومان ئەبێ لێرەدا بڵێین لە پێش دەست نوێژەكەوە عەورەتی شۆریوە (ثم نحي رجليه فغسلهما، هذه غسله من الجنابة).

***   ***   ***

## ٢- بابُ غُسْلِ الرَّجُلِ مَعَ امْرَأَتِهِ.

٢٥٠- حَدَّثَنَا آدَمُ بنُ أَبِي إِيَاسٍ قَالَ حَدَّثَنَا ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ

عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ، مِنْ قَدَحٍ يُقَالُ لَهُ الفَرَق.

ئینجا دێته سەر ئەم بابه (باب غسل الرجل مع امرأته) ئەمه بابی ئەوەیه که ڕەوایه پیاو لەگەڵ ئافرەتی خۆیدا غوسڵ بکا بەم شێوەی که له حەدیسەکەدا هاتووه له دایکمان عائشه -خوای لێ ڕازی بێت- که (قالت: کنت أغتسل أنا والنبي ﷺ من إناء واحد، من قدح يقال له الفرق).

ئەم حەدیسه له ژمارەکانی: (٢٦١، ٢٦٣، ٢٧٣، ٢٩٩، ٥٩٥٦، ٧٣٣٩)دا دووباره بووەتەوه.

*** *** ***

## ٣- بَابُ الْغُسْلِ بِالصَّاعِ وَنَحْوِهِ.

٢٥١- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مُحَمَّدٍ قَالَ حَدَّثَنِي عَبْدُالصَّمَدِ قَالَ حَدَّثَنِي شُعْبَةُ قَالَ حَدَّثَنِي أَبُوبَكْرِ بنِ حَفْصٍ قَالَ سَمِعْتُ أَبَا سَلَمَةَ يَقُولُ: دَخَلْتُ أَنَا وَأَخُو عَائِشَةَ عَلَى عَائِشَةَ فَسَأَلَهَا أَخُوهَا عَنْ غُسْلِ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَعَتْ بِإِنَاءٍ نَحْوٍ مِنْ صَاعٍ فَاغْتَسَلَتْ وَأَفَاضَتْ عَلَى رَأْسِهَا، وَبَيْنَنَا وَبَيْنَهَا حِجَابٌ.

قَالَ أَبُوعَبْدِاللهِ: قَالَ يَزِيدُ بنُ هَارُونَ وَبَهزٌ وَالْجُدِّيُّ عَنْ شُعْبَةَ: قَدْرِ صَاعٍ.

٢٥٢- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مُحَمَّدٍ قَالَ حَدَّثَنَا يَحْيَى بنُ آدَمَ قَالَ حَدَّثَنَا زُهَيرٌ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ حَدَّثَنَا أَبُوجَعْفَرٍ أَنَّهُ كَانَ عِنْدَ جَابِرِ بنِ عَبْدِاللهِ هُوَ وَأَبُوهُ وَعِنْدَهُ قَوْمٌ، فَسَأَلُوهُ عَنِ الْغُسْلِ، فَقَالَ: يَكْفِيكَ صَاعٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَا يَكْفِينِي. فَقَالَ جَابِرٌ كَانَ يَكْفِي مَنْ هُوَ أَوْفَى مِنْكَ شَعْرًا وَخَيْرٌ مِنْكَ. ثُمَّ أَمَّنَا فِي ثَوْبٍ.

ئەم حەدیسه له ژمارەکانی: (٢٥٥، ٢٥٦)دا دووباره بووەتەوه.

٢٥٣- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيمٍ قَالَ حَدَّثَنَا ابنُ عُيَيْنَةَ عَنْ عَمْرٍو عَنْ جَابِرِ بنِ زَيْدٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ وَمَيْمُونَةَ كَانَا يَغْتَسِلَانِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ.

قَالَ أَبُوعَبْدِاللهِ: كَانَ ابنُ عُيَيْنَةَ يَقُولُ أَخِيرًا «عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ» وَالصَّحِيحُ مَا رَوَى أَبُونُعَيمٍ.

ئینجا دێته سەر ئەم بابە کە ئەفەرموێ: (باب الغسل بالصاع ونحوه) ئەمە بابی ئەوەیە دەست نوێژ ئەگیرێ بە پڕی ساع و وێنەی ساع. وە لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکمان عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: (دخلت أنا وأخو عائشة على عائشة فسألها أخوها عن غسل النبيﷺ، فدعت بإناء نحو من صاع فاغتسلت وأفاضت على رأسها، وبيننا وبينها حجاب) پرسیار کرا لە غوسڵی پێغەمبەرﷺ وە پرسیار کەرەکە برای بوو، ئینجا داوای زەرفێکی کرد بە ئەندازی ساعێک، ئینجا غوسڵی کرد بەوە وە پەردە لە بەیندا بوو.

ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ (قال حدثنا أبو جعفر أنه كان عند جابر بن عبدالله هو و أبوه وعنده قوم، فسألوه عن الغسل، فقال: يكفيك صاع، فقال رجل: ما يكفيني. فقال جابر كان يكفي من هو أوفى منك شعرا و خير منك. ثم أمنا في ثوب) لە جابرەوە کە کۆمەڵێک پرسیاریان لێ کرد لە ئەندازی ئاو کە غوسڵی پێ بکرێ ئەویش فەرموی: ساعێ بەسە، ئینجا پیاوێک وتی: ساعێک بەشم ناکات ئەویش فەرموی: ساع لەمەوپەر بەشی کەسێکی ئەکرد کە مووی لە تۆ زۆر تر بوو وە لە تۆش چاکتر بوو لەپاشان هەستا پێش نوێژی بۆ کردین لە یەک لیباسدا. وە مەبەستی لەو کەسە پێغەمبەر بووﷺ. ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێویستە پەیڕەوی پێغەمبەرﷺ بکرێ و مل کەچ بکرێ بۆ فەرمانەکانی. وە زیادە ڕەوی و ئیسراف لە ئاودا چاک نی‌یە.

ئینجا جابری کوڕی زەید لە ئیبن و عەباسەوە ریوایەت ئەکات کە پێغەمبەر وە دایکی ئیمانداران میمونە کە (كانا يغتسلان من إناء واحد) لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ غوسڵیان دەکرد لە یەک زەرفی ئاو. ئەمەش بەڵگەیە کە دوو کەس ئاو هەڵگۆزن لە زەرفێک و دەست نوێژی پێ بگرن ڕەوایە.

*** *** ***

## ٤- بَابُ مَنْ أَفَاضَ عَلَى رَأْسِهِ ثَلاَثًا

٢٥٤- حَدَّثَنَا أَبُونُعَيْمٍ قَالَ حَدَّثَنَا زُهَيْرٌ عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ حَدَّثَنِي سُلَيْمَانُ بنُ صُرَدٍ قَالَ حَدَّثَنِي جُبَيْرُ بنُ مُطْعِمٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِﷺ : «أَمَّا أَنَا فَأُفِيضُ عَلَى رَأْسِي

ثلاثًا، وَأشارَ بِيَدَيْه كِلْتَيْهِمَا.

٢٥٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ بَشَّارٍ قَالَ حَدَّثَنَا غُنْدَرٌ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ مِخْوَلِ بنِ رَاشِدٍ عَنْ مُحَمَّدِ بنِ عَلِيٍّ عَنْ جَابِرِ بنِ عَبْدِالله قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُفْرِغُ عَلَى رَأْسِه ثَلاثًا.

٢٥٦- حَدَّثَنَا أَبُونُعَيْمٍ قَالَ حَدَّثَنَا مَعْمَرُ بنُ يَحْيَى بنِ سَامٍ حَدَّثَنِي أَبُوجَعْفَرٍ قَالَ: قَالَ لِي جَابِرٌ: وَأَتَانِي ابْنُ عَمِّكَ -يُعَرِّضُ بِالْحَسَنِ بنِ مُحَمَّدِ بنِ الْحَنَفِيَّةِ- قَالَ: كَيْفَ الْغُسْلُ مِنَ الْجَنَابَةِ؟ فَقُلْتُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَأْخُذُ ثَلاثَةَ أَكُفٍّ وَيُفِيضُهَا عَلَى رَأْسِه، ثُمَّ يُفِيضُ عَلَى سَائِرِ جَسَدِهِ. فَقَالَ لِي الْحَسَنُ: إِنِّي رَجُلٌ كَثِيرُ الشَّعْرِ، فَقُلْتُ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَكْثَرَ مِنْكَ شَعْرًا.

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب من أفاض على رأسه ثلاثا) ئەمە بابی کەسێکە لە غوسلدا سێ جار ئاوی کردووە بەسەردا، وە لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە جوبەیری کوڕی مطعمەوە کە (قال: قال رسول الله ﷺ: «أما أنا فأفيض على رأسي ثلاثا». وأشار بيديه كلتيهما) وتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من سێ جار ئاو ئەکەم بەسەرمداو بە هەردوو دەست دەستی نیشانی کرد، وە لە ڕیوایەتدا هاتووە کە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نیزاع کرا لە غوسل کردندا، هێندێ گوتیان من چەند جار ئاو دەکەم بەسەرمدا واتە زیاد لە سێ جار، ئەمیش فەرمووی: (عن جابر بن عبدالله قال: كان النبي ﷺ يفرغ على رأسه ثلاثا) من سێ جار ئاو ئەکەم بەسەرمدا، ئینجا هەموو جار وا بووبێ یان نەبووبێ سێ جار سوننەتە.

ئینجا ئەم ئەسەرەش ئەهێنێ (قال (حسن): كيف الغسل من الجنابة؟ فقلت: كان النبي ﷺ يأخذ ثلاثة أكف ويفيضها على رأسه، ثم يفيض على سائر جسده. فقال لي الحسن: إني رجل كثير الشعر، فقلت كان النبي ﷺ أكثر منك شعرا) کە پرسیار کرا لە جابر کە غوسل لە لەش پیسی چۆنە؟ ئەویش گوتی: پێغەمبەر ﷺ سێ مشتی ئاوی ئەکرد بەسەریدا، ئینجا ئاوی ئەکرد بەسەر باقی لەشیدا. ئینجا حسن پێی گوتم: من موم زۆرە ئەویش گوتی: پێغەمبەر ﷺ مووی لە تۆ زۆرتر بوو.

*** *** ***

## ٥- بَابُ الْغُسْلِ مَرَّةً وَاحِدَةً.

٢٥٧- حَدَّثَنَا مُوسَى بنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَاحِدِ عَنِ الأَعْمَشِ عَنْ سَالِمِ بنِ أَبِي الْجَعْدِ عَنْ كُرَيْبٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَتْ مَيْمُونَةُ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ مَاءً لِلْغُسْلِ فَغَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاثًا، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ مَذَاكِيرَهُ، ثُمَّ مَسَحَ يَدَهُ بِالأَرْضِ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، وَغَسَلَ وَجْهَهُ، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَحَوَّلَ مِنْ مَكَانِهِ فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ.

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب الغسل مرة واحدة) ئەمە بابی ئەوەیە کە غوسڵ بە یەک جار ئەبێت وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئیبن عباسەوە کە (قال: قالت میمونة: وضعت للنبي ﷺ ماء للغسل فغسل يديه مرتين أو ثلاثا، ثم أفرغ على شماله فغسل مذاكيره، ثم مسح يده بالأرض، ثم مضمض واستنشق، وغسل وجهه، ثم أفاض على جسده، ثم تحول من مكانه فغسل قدميه) وتی: دایکمان مەیمونە وتی: ئاوم دانا بۆ پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆشۆردن (غوسڵی لەش گرانی) هەردوو دەستی موبارەکی شۆرد دوو یا سێ جار لە پاشان ئاوی کرد بە دەستی چەپیداو زەکەری شۆرد لەگەڵ هەردوو گونیدا لە پاشان دەستی مەسح کرد بە زەوی لە پاشان ئاوی رادا لە دەم و لوتی وە دەم و چاو و هەردوو دەستی شۆرد لە پاشان ئاوی کرد بە لەشی موبارەکیدا لە پاشان شوێنەکەی گۆڕی و هەردوو قاچی پیرۆزی شۆرد.

*** *** ***

## ٦- بَابُ مَنْ بَدَأَ بِالْحِلاَبِ أَوِ الطِّيبِ عِنْدَ الْغُسْلِ.

٢٥٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ الْمُثَنَّى قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُوعَاصِمٍ عَنْ حَنْظَلَةَ عَنِ الْقَاسِمِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ دَعَا بِشَيْءٍ نَحْوَ الْحِلاَبِ فَأَخَذَ بِكَفِّهِ فَبَدَأَ بِشِقِّ رَأْسِهِ الأَيْمَنِ، ثُمَّ الأَيْسَرِ، فَقَالَ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ.

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب من بدأ بالحلاب أو الطيب عند الغسل) ئەمە بابی ئەوەیە کە لە کاتی غوسڵدا شتی بۆن خۆش بەکاربێنێ و لە یەکەم جارەوە بەوە دەست پێ بکات، وە لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکمان عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە

(قالت : كان النبيﷺ إذا اغتسل من الجنابة دعا بشئ نحو الحلاب فأخذ بكفه فبدأ بشق رأسه الأيمن، ثم الأيسر، فقال بهما على رأسه) ئەم حەدیسە زۆر ئیشکالی تێ هێنراوە بۆ سەر ئیمامی بوخاری کە ئەمە هەڵەیەو هیچ کەس بێ هەڵە نابێ وە بە روواڵەتیش زۆر گرانی تێدایە، بەڵام فتح الباری بە جۆرێ هێناویەتی گرێ و ئیشکال نامێنێ، مەبەست بە (حلاب) بۆ شتی پان و شتی قوڵ نەک مەبەست شتی بۆن خۆش بێت، ئینجا بەو جۆرە ئەڵێین: کاتێ پێغەمبەر بیویستایە غوسڵی لەش گرانی بکات داوای زەرفێکی ئەکرد بەو ئەندازەی کە باس کرا، ئینجا لەو ئاوە شتێکی لێ ئەگۆزی و لای راستی سەری ئەشۆری و ئینجا لای چەپی، ئینجا بە هەردوو مشتی ئەیکرد بە سەری موبارەکیدا، ئینجا لە ترجمەکەدا کە ئەفەرموێ: (أو الطيب) مەبەست ئەوەیە داوای ئاوی کردووەو شتی بۆن خۆشیش وە تردد لەمەدایە کە بابەکە بەناوی ئاو ناو ببرێ یان شتی بۆن خۆش. وە بێگومان شتی بۆن خۆش لە پاش غوسڵ بەکار ئەهێنرێ.

***　　***　　***

## ٧- بَابُ الْمَضْمَضَةِ وَالإِسْتِنْشَاقِ فِي الْجَنَابَةِ.

٢٥٩- حَدَّثَنَا عُمَرُ بنِ حَفْصِ بنِ غِيَاثٍ قَالَ حَدَّثَنَا أَبِي حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ قَالَ حَدَّثَنِي سَالِمٌ عَنْ كُرَيْبٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ حَدَّثَتْنَا مَيْمُونَةُ قَالَتْ: صَبَبْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ غُسْلاً، فَأَفْرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى يَسَارِهِ فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ غَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ الأَرْضَ فَمَسَحَهَا بِالتُّرَابِ، ثُمَّ غَسَلَهَا، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ وَأَفَاضَ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ، ثُمَّ أُتِيَ بِمَنْدِيلٍ فَلَمْ يَنْفُضْ بِهَا.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب المضمضة والإستنشاق في الجنابة) ئەمە بابی ئاو لە دەم و لوت رادانە لە کاتی غوسڵی لەش پیسیدا وە لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکمان مەیمونەوە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت : صببت للنبيﷺ غسلا، فأفرغ بيمينه على يساره فغسلهما، ثم غسل فرجه، ثم قال بيده الأرض فمسحها بالتراب، ثم غسلها، ثم تمضمض واستنشق، ثم غسل وجهه وأفاض على رأسه، ثم تنحى فغسل قدميه، ثم أتي بمنديل فلم ينفض بها) وتی ئاوم کرد بە دەستی پێغەمبەردا ﷺ خۆی بشوات بە دەستی

راستی ئاوی کرد بە لای چەپیدا لە پاشان هەردوو دەستی شۆرد لە پاشان عەورەتی شۆرد لە پاشان دەستی دا بە زەویداو مەسحی کرد بە خۆڵ لە پاشان دەستی شۆری و ئاوی رادا لە دەم و لوتی و لە پاشان دەمو چاوی شۆرد وە ئاوی کرد بە سەریدا لە پاشان وازی لێ هێنا وە قاچەکانی شۆرد وە لە پاش لێ بوونەوەی مەندیلی بۆ هێنرا بۆ خۆ وشک کردنەوە بەڵام خۆی پێ وشک نەکردەوە، کەواتە چاک وایە خۆ وشک نەکرێتەوەو واز بهێنرێ لە ئاوی دەست نوێژ با خۆی وشک ببێتەوە.

*** *** ***

## ٨- بَابُ مَسْحِ الْيَدِ بِالتُّرَابِ لِتَكُونَ أَنْقَى.

٢٦٠- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنِ الزُّبَيْرِ الْحُمَيْدِي قَالَ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ قَالَ الأَعْمَشُ عَنْ سَالِمِ بنِ أَبِي الْجَعْدِ عَنْ كُرَيْبٍ عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَغَسَلَ فَرْجَهُ بِيَدِهِ، ثُمَّ دَلَكَ بِهَا الْحَائِطَ ثُمَّ غَسَلَهَا، ثُمَّ تَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ، فَلَمَّا فَرَغَ مِنْ غُسْلِهِ غَسَلَ رِجْلَيْهِ.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب مسح اليد بالتراب لتكون أنقى) ئەمە بابی ئەوەی مەسحی خۆڵ بکرێت بە دەست تا پاک و خاوێن تر بێت. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران مەیمونەوە -خوای لێ رازی بێت- کە (أن النبي ﷺ اغتسل من الجنابة، فغسل فرجه بيده، ثم دلك بها الحائط ثم غسلها، ثم توضأ وضوءه للصلاة، فلما فرغ من غسله غسل رجليه) ئەفەرموێ پێغەمبەر ﷺ خۆی شۆرد لە لەش گرانیدا عەورەتی ئەشۆرد بە دەستی لە پاشا دەستی هێنا بە دیواردا کە خۆڵ بووە لە پاشا دەستی شۆرد لە پاشا دەست نوێژی گرت وەک دەست نوێژ بۆ نوێژ لە پاش لێ بوونەوەی لە غوسڵ هەردوو قاچی شۆرد. لەم حەدیسەوە دەرئەکەوێ کە خۆڵ پاک و خاوێن کەرەو بێگومان وێنەی هەروایە.

*** *** ***

## ٩- بَابُ هَلْ يُدْخِلُ الْجُنُبُ يَدَهُ فِي الإِنَاءِ قَبْلَ أَنْ يَغْسِلَهَا إِذَا لَمْ يَكُنْ عَلَى يَدِهِ قَذَرٌ غَيْرُ الْجَنَابَةِ؟

وَأَدْخَلَ ابْنُ عُمَرَ وَالْبَرَاءُ بنُ عَازِبٍ يَدَهُ فِي الطَّهُورِ وَلَمْ يَغْسِلْهَا ثُمَّ تَوَضَّأَ.

وَلَمْ يَرَ ابْنُ عُمَرَ وَابْنُ عَبَّاسٍ بأساً بِمَا يَنْتَضِحُ مِنْ غُسْلِ الْجَنَابَةِ.

٢٦١- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مَسْلَمَةَ حَدَّثَنَا أَفْلَحُ عَنِ الْقَاسِمِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ تَخْتَلِفُ أَيْدِينَا فِيهِ.

٢٦٢- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ قَالَ حَدَّثَنَا حَمَّادٌ عَنْ هِشَامٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ غَسَلَ يَدَهُ.

٢٦٣- حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ أَبِي بَكْرِ بنِ حَفْصٍ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنْ جَنَابَةٍ.

وَعَنْ عَبْدِالرَّحْمَنِ بنِ الْقَاسِمِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ مِثْلَهُ.

٢٦٤- حَدَّثَنَا أَبُوالْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ عَبْدِاللهِ بنِ جَبْرٍ قَالَ: سَمِعْتُ أَنَسَ بنَ مَالِكٍ يَقُولُ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ وَالْمَرْأَةُ مِنْ نِسَائِهِ يَغْتَسِلَانِ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ.

زَادَ مُسْلِمٌ وَوَهْبٌ عَنْ شُعْبَةَ: مِنَ الْجَنَابَةِ.

ئینجادێته سەر ئەم بابە (باب هل يدخل الجنب يده في الإناء قبل أن يغسلها إذا لم يكن على يده قذر غير الجنابة؟) ئایا لەش گران بۆی هەیە دەست بخاتە زەرفێ کە ئاوی تێدا بێت بۆ ئاو هەڵگوستن ئەگەر دەستی هیچ شتێکی پیسی پێوە نەبێ بێجگە لە لەش گرانی‌یەکەی. وە لەم بارەیەوە ئەم ئەسەرە ئەهێنێ لە ئیبن و عمرو بەرائی کوڕی عازبەوە (و أدخل ابن عمر والبراء بن عازب يده في الطهور ولم يغسلها ثم توضأ ولم ير ابن عمر وابن عباس بأسا بما ينتضح من غسل الجنابة) کە دەستیان خستووەتە ئاوی دەست نوێژ پێش ئەوەی بیشۆرن وە بە بێ شۆرین دەست نوێژیان گرتووە. وە ئیبن و عومەرو ئیبن عەباس هیچ نارەوایی‌یەکیان دانەناوە لەو تکەو پرژە کە لە دەستی دەست نوێژ گر ئەکەوێتە ناو ئەو زەرفەی کە ئاوی لێ هەڵئەگوزێ. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکمانەوە عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە ئەفەرموێ: (قالت: كنت أغتسل أنا والنبي ﷺ من إناء واحد تختلف أيدينا فيه). ئینجا ئەم حەدیسەش ئەهێنێ و ئەفەرموێ: (كان رسول الله ﷺ إذا اغتسل من الجنابةغسل يده). ئەو حەدیسانەش کە دەست نەشۆرین ئەگەیەنن ئەبرێن بەسەر ئەوەدا کە یەقینی هەبێ دەستەکە پاکە. وە ئەوانەی کە شۆرین ئەگەیەنن ئەبرێن بەسەر کاتێکدا کە

گومان هەبێ لە پاکی دەستەکاندا. وە بە چەند وەڵامێکی تریش ئەو حەدیسانە یەک خراون و دژایەتی نەماوە لە نێوان حەدیسەکاندا. ئینجا وێنەی حەدیسی پێشوو محمدی برای دایکی ئیمانداران ئەو حەدیسە ئەهێنێ لێیەوە. ئینجا ئەنەسی کوڕی مالک بەم شێوەی تر ئەم حەدیسە ئەهێنێ و ئەفەرموێ: (كان النبيﷺ والمرأة من نسائه يغتسلان من إناء واحد).

*** *** ***

١٠- بَابُ تَفْرِيقِ الْغُسْلِ وَالْوُضُوءِ.

وَيُذْكَرُ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ غَسَلَ قَدَمَيْهِ بَعْدَ مَا جَفَّ وَضُوؤُهُ.

٢٦٥- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ مَحْبُوبٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَاحِدِ قَالَ: حَدَّثَنَا الأَعْمَشُ عَنْ سَالِمِ بنِ أَبِي الْجَعْدِ عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنُ عَبَّاسٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَتْ مَيْمُونَةُ: وَضَعْتُ لِرَسُولِ اللهِﷺ مَاءً يَغْتَسِلُ بِهِ، فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، ثُمَّ أَفْرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ مَذَاكِيرَهُ، ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالأَرْضِ،ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَغَسَلَ رَأْسَهُ ثَلاَثًا، ثُمَّ أَفْرَغَ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى مِنْ مَقَامِهِ فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب تفريق الغسل والوضوء) ئەمە بابی ئەوەیە ئەگەر بەینی ئەندامەکانی دەست نوێژ بکەوێت قەیناکات. واتە هێندێکیان بشۆرێت و ئیتر بوەستێ تا وشک ئەبێتەوەو ئینجا ئەوانی تر بشۆرێ قەیناکاو دەست نوێژەکەی دروستەو ئەفەرموێ: (ويذكر عن ابن عمر أنه غسل قدميه بعد ما جف وضوؤه) ئەگێڕنەوە لە ئیبن و عومەرەوە کە قاچی شۆرد پاش ئەوەی دەست نوێژەکەی وشک بوو بووەوە. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکمان مەیمونە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت ميمونة: وضعت لرسول اللهﷺ ماء يغتسل به، فأفرغ على يديه فغسلهما مرتين أو ثلاثا، ثم أفرغ بيمينه على شماله فغسل مذاكيره، ثم دلك يده بالأرض،ثم مضمض واستنشق، ثم غسل وجهه ويديه، وغسل رأسه ثلاثا، ثم أفرغ على جسده، ثم تنحى من مقامه قدميه) ئەسەرەکەی پێش خست، چونکە لە مەسەلەکەدا حەدیسەکە دەق نییە، هەڵئەگرێ ئەوەندەی بەین نەبووبێ تا ووشک بوونەوەی پێشووەکە.

*** *** ***

## ١١- بَابُ مَنْ أَفرَغ بيمِينه على شِمَالِه في الْغُسْلِ.

٢٦٦- حَدَّثَنَا مُوسَى بنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبو عَوَانَةَ حَدَّثَنَا الأعْمَشُ عَنْ سَالِمِ بنِ أَبِي الْجَعْدِ عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنُ عَبَّاسٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتَ الْحَارِثِ قَالَتْ: وَضَعْتُ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ غُسْلاً وَسَتَرتُهُ فَصَبَّ عَلَى يَدِهِ فَغَسَلَهَا مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ -قَالَ سُلَيْمَانُ: لاَ أَدْرِي أَذَكَرَ الثَّالِثَةَ أَمْ لاَ- ثُمَّ أَفْرَغَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ دَلَكَ يَدَهُ بِالأَرْضِ أَوْ بِالْحَائِطِ، ثُمَّ تَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ وَغَسَلَ رَأْسَهُ، ثُمَّ صَبَّ عَلَى جَسَدِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ، فَنَاوَلْتُهُ خِرْقَةً فَقَالَ بِيَدِهِ هَكَذَا، وَلَمْ يُرِدْهَا.

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب من أفرغ بيمينه على شماله في الغسل) ئەمە بابی ئەوەیە کە بە دەستی راستی ئاو بکات بەسەر لای چەپیدا. وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکمان مەیمونە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت: وضعت لرسول الله ﷺ غسلا وسترته فصب على يده فغسلها مرة أو مرتين -قال سليمان: لا أدري أذكر الثالثة أم لا- ثم أفرغ بيمينه على شماله فغسل فرجه، ثم دلك يده بالأرض أو بالحائط، ثم تمضمض واستنشق وغسل وجهه ويديه وغسل رأسه، ثم صب على جسده، ثم تنحى فغسل قدميه، فناولته خرقة فقال بيده هكذا، ولم يردها) واتە بە دەست ئیشارەتی کرد کە نامەوێ.

*** *** ***

## ١٢- بَابُ إِذَا جَامَعَ ثُمَّ عَادَ. وَمَنْ دَارَ عَلَى نِسَائِهِ فِي غُسْلٍ وَاحِدٍ.

٢٦٧- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ بَشَّارٍ قَالَ حَدَّثَنَا ابْنُ عَدِيٍّ وَيَحْيَى بنُ سَعِيدٍ عَنْ شُعْبَةَ عَنْ إِبْرَاهِيمَ بنِ مُحَمَّدِ بنِ الْمُنْتَشِرِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: ذَكَرْتُهُ لِعَائِشَةَ فَقَالَتْ يَرْحَمُ اللهُ أَبَا عَبْدِالرَّحْمَنِ كُنْتُ أُطَيِّبُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَيَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ ثُمَّ يُصْبِحُ مُحْرِمًا يَنْضَخُ طِيبًا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٢٧٠)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٦٨- حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بنُ بَشَّارٍ قَالَ حَدَّثَنَا مُعَاذُ بنُ هِشَامٍ قَالَ: حَدَّثَنِي أَبِي عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بنُ مَالِكٍ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَدُورُ عَلَى نِسَائِهِ فِي السَّاعَةِ الْوَاحِدَةِ مِنَ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَهنَّ إِحْدَى عَشْرَةَ. قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: أَوَ كَانَ يُطِيقُهُ؟ قَالَ: كُنَّا نَتَحَدَّثُ أَنَّهُ

أُعْطِيَ قُوَّةَ ثَلاثِينَ.

وَقَالَ سَعِيدٌ عَنْ قَتَادَةَ إِنَّ أَنَسًا حَدَّثَهُمْ تِسْعُ نِسْوَةٍ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٨٤، ٥٠٦٨، ٥٢١٥)دا دووبارە بووەتەوە.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب إذا جامع ثم عاد. ومن دار على نسائه في غسل واحد) ئەمە بابێکە لە بارەی ئەوەوە کەسێک جیماع بکات و ئینجا بە بێ غوسڵ دووبارە جیماع بکات ئایا شەرعی‌یە یان نا؟ وە بابی ئەوەیە کەسێک چەند ژنێکی هەبێ و بگەڕێ بەسەر هەموویانداو لەپاشان یەک غوسڵ بکات لە باتی لە هەموو جیماعەکاندا. لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکمانەوە عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت: کنت أطیب رسول الله ﷺ فیطوف على نسائه ثم یصبح محرما ینضخ طیبا) ئەفەرموێ من پێغەمبەرم ﷺ بۆن خۆش ئەکرد ئینجا ئەگەڕا بەسەر حەرەمەکانیداو لە پاشا ئەچووە ئیحرامەوەو بریقەی ئەدایەوە لە بۆن خۆشیدا، کەواتە مانەوەی بۆنە خۆشەکەو ئاساری بۆ پاش ئیحرام قەیناکات. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە (قال: کان النبي ﷺ یدور على نسائه في الساعة الواحدة من اللیل و النهار وهن إحدى عشرة. قال: قلت لأنس: أو کان یطیقه؟ قال: کنا نتحدث أنه أعطي قوة ثلاثین. وقال سعید عن قتادة إن أنسا حدثهم تسع نسوة) ئەم ریوایەتی قتادە لە بقیعدا هەر نۆن و ناسراون. وە ئەو هێزی ژن و مێردی‌یە بۆ ئەو پێویست بوو، چونکە ئەو هەمیشە دڵی پیرۆزی پەیوەست بووە بە یادی خواوەو بەو هێزە بەتینە ئەبوایە پەرۆش نە ئەبوو دڵی موبارەکی روو بکاتە هیچ کارێکی ترو ئەنەپچڕا لەو یادە. ئینجا کاروباری نهێنی ئافرەتان ئەوەندە زۆرن کە شەرم ئەکرێ لە گوتنیان بە کۆمەڵێکی وا ئەبوایە زەبت ئەئەکرا. تەنانەت پرسیاری وا بووە لە بارەی ئافرەتانەوە پێغەمبەر ﷺ خۆیشی شەرمی کردووە بیفەرموێ و یەکێ لە دایکانی ئیمانداران روونیان کردووەتەوە. بۆ وێنە جارێک ئافرەتێک پرسیاری کرد ئایا لەپاش تەواو بوونی حەیزو غوسڵ کردن چی بکات؟ لە وەڵامدا فەرموی: (وإن تتبع أثره مسکا) میسک و بۆن خۆشی بکات بە عەورەتیا، ئافرەتەکە لەوە تێ نەئەگەیشت و ئەمیش شەرمی ئەکرد دەقەکە بفەرموێ تا دایکی ئیمانداران عائشە -خوای لێ رازی بێت- پەلی گرت و بردی حاڵی کرد.

ئینجا وەک تێهەڵکێش بە جوانی نەزانم چۆنیەتی پەیدا بوون و هۆی کۆبوونەوەیان بکەم بۆ نەشارەزاکان . شتێکی ئاشکرایەو شایەتی مێژوو کە لە پێش هاتنی قورئاندا ژمارەیەکی تایبەتی نەبوو بۆ ژن هێنان و هەرچەند کە مەیل بیوایە ئەهێنرا تا قورئان ژمارەی دیاری کرد بۆ گشت موسڵمانان هەتا هەتایە. وە لە بارەی پێغەمبەرەوەﷺ شتێکی ئاشکراو بەناوبانگە یەکەم حەرەمی خەدیجە خاتوون -خوای لێ رازی بێت- کە لە تەمەنی ٢٥ساڵیدا خواستی ئەو لە تەمەنی ٤٠ساڵیدا بوو هیچ پیاو و ئافرەتێک وەک ئەوان ژیانی بەختەوەری و کامەرانییان نەبردووەتە سەر ئەو ماوە دوورو درێژە ماوەی ٢٥ ساڵێک ئینجا پاش وەفاتی خەدیجە خاتوون سێ ساڵێک بە بێ خێزان مایەوە وە بێگومان خەڵکی زۆر مەمنون بوون کە دڵی چ ئافرەتێک بگرێ بە شانازییەوە بیدەنێ وەک سەرۆکەکانی قورەیش ناردیانە لای چ ئافرەتێکی پێ خۆشە بیدەنێ ئەگەر واز بێنێ لێیان و دژی ئایینەکەیان نەدوێ. وە لە پێش پێغەمبەریشا بە شایەتی هەموان پاکترین کەس و دوورترین کەس بووە لە کاروکردەوەی ناجۆر کەواتە خواستنی حەرەمەکانی هەریەکە هۆو حیکمەتێکی تایبەتی تێدا بووەو هێندێکیان پیرو هەتیو بار بوون وەک بە درێژی باس کراوەو منیش لە تەفسیری قورئانەکەدا باسم کردووە. وە حەرەمەکانی خوا گێرانی بە دایکی ئیمانداران لە رێزو قەدرو حەلاڵ نەبوونیان بۆ هیچ کەسێکی تر بە وێنەی دایکی راستەقینە کەواتە ئەوانە هەر ئەبێ بمێننەوە لە عیصمەتی ئەودا وەک کەسانی تر کە موسڵمان ئەبوون و زیاد لە چوار ژنیان هەبوو چواریان ئەهێشتەوە باقی تریان بەرەڵا ئەکردن وەک یەکێ دە ژنی هەبوو فەرموی: (أمسك أربعا وفارق سائرهن) چواری بهێڵەرەوەو ئەوی تری واز لێ بهێنە. حەزم کرد لێرەدا ئەم کورتەیە باس بکەم لە بارەی دایکەکانی ئیمانداراەوە -خوا لێیان رازی بێت.

***   ***   ***

## ١٣- بَابُ غُسْلِ الْمَذْيِ وَالْوُضُوءِ مِنْهُ

٢٦٩- حَدَّثَنَا أَبُوالْوَلِيدِ قَالَ: حَدَّثَنَا زَائِدَةُ عَنْ أَبِي حَصِينٍ عَنْ أَبِي عَبْدِالرَّحْمَنِ عَنْ عَلِيٍّ قَالَ: كُنْتُ رَجُلاً مَذَّاءً، فَأَمَرْتُ رَجُلاً أَنْ يَسْأَلَ النَّبِيَّ ﷺ -لِمَكَانِ ابْنَتِهِ- فَسَأَلَ، فَقَالَ «تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ».

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب غسل المذي والوضوء منه) ئەمە بابی حوکمی

مەذی‌یەو دەست نوێژ گرتن بە هۆی ئەوەوە، واتە پیسەو دەست نوێژی پێ ئەشکێ و بەلآم لەش پیس ناکات وە لەم بارەیەوە لە ئیمامی عەلی‌یەوە کە (قال: كنت رجلا مذاء، فأمرت رجلا أن يسأل النبيﷺ -لمكان ابنته-) من پیاوێک بووم وەزیم زۆر لێ ئەهات فەرمانم دا بە پیاوێک کە پرسیار بکات لە پێغەمبەرﷺ خۆم رووم ئەبوو لەبەر بوونی کچەکەی، واتە فاطمە -سەلامی خوای لێ بێت- ئەویش پرسیاری کرد (فقال «توضأ واغسل ذكرك) دەست نوێژ بگرەو زەکەرت بشۆرە. مەبەست ئەوەیە لە پێشەوە زەکەرت بشۆرەو لەپاش ئەوە دەست نوێژ بگرە، واتە ئەو دوو شتە بەجێ بهێنە.

*** *** ***

١٤- بَابُ مَن تَطَيَّبَ ثُم اغْتَسَلَ، وبَقِيَ أَثَرُ الطِّيْبِ.

٢٧٠- حَدَّثَنَا أَبو النُّعْمَانِ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبو عَوَانَةَ عَنْ إِبْرَاهِيْمَ بنِ مُحَمَّدِ بنِ الْمُنْتَشِرِ عَنْ أَبِيْهِ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَذَكَرْتُ لَهَا قَوْلَ ابْنِ عُمَرَ: «مَا أُحِبُّ أَنْ أُصْبِحَ مُحْرِمًا أَنْضَخُ طِيْبًا» فَقَالَتْ عَائِشَةُ: أَنَا طَيَّبْتُ رَسُولَ اللهِﷺ، ثُمَّ طَافَ فِي نِسَائِهِ، ثُمَّ أَصْبَحَ مُحْرِمًا.

٢٧١- حَدَّثَنَا آدَمُ قَالَ: حَدَّثَنَا شُعْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَكَمُ عَنْ إِبْرَاهِيْمَ عَنِ الأَسْوَدِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى وَبِيْصِ الطِّيْبِ فِي مَفْرِقِ النَّبِيِّﷺ وَهُوَ مُحْرِمٌ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (١٥٣٨، ٥٩١٨، ٥٩٢٣)دا دووبارە بووەتەوە.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب من تطيب ثم اغتسل، وبقي أثر الطيب) ئەمە بابی ئەوەیە کەسێ خۆی بۆن خۆش بکات لە پاش ئەوە غوسڵ بکات و ئیحرام دابەستێ و ئەسەری شتە بۆن خۆشەکەی پێوە دیار بێت. واتە ماتوڵ لە پێش ئیحرامەکەدا خۆی بۆن خۆش کردووە مانەوەی ئەسەرەکەی بۆ پاش ئیحرامەکە قەیناکات. ئینجا ئیبن و عومەر -خوایان لێ رازی بێت- فەرمودەیەکی هێناوە (ما أحب أن أصبح محرما أنضخ طيبا) پێم خۆش نی‌یە لە ئیحرامدا بم بۆنی خۆشم پێوە بێت، ئینجا یەکێک ئەم قسەیە باس ئەکات بۆ دایکی ئیمانداران عائشە -خوای لێ رازی بێت- ئەویش بەرپەرچی قسەکەی ئیبن عومەر ئەداتەوەو ئەفەرموێ: (أنا طيبت رسول اللهﷺ، ثم طاف في نسائه، ثم أصبح محرما) من پێغەمبەرم بۆن خۆش ئەکردو ئینجا ئەویش ئەگەڕا بەسەر حەرەمەکانیداو کاری شەرعی لەگەڵ ئەکردن و

ئینجا غوسڵی نەکردو ئیحرامی نەبەست بەو بۆنە خۆشەوە. ئیمامی بوخاری هەرچۆنێ ئەو فەرمودەی حەزرەتی عائشەی هێنا بۆ بەربەرچ دانەوەی ئیبن عومەر هەروەها ئەمە ئەگەیەنێ کە حەرەمەکان ئاگادار تر بوون بە هێندێ کار کە هاوەڵەکانی ئاگادار نەبوون با لە هاوەڵە گەورەکانی بووبن. ئینجا دەرئەکەوێ کە ئافرەتان سوننەتە خزمەتی مێردەکانیان بکەن وەک دەریش کەوت مانەوەی بۆنی خۆشی بۆ پاش ئیحرام بەستن قەیناکات. وەک ئەم فەرمودەی دایکمان عائشە دەقەو بە روونی ئەوە ئەگەیەنێ کە لە ریوایەتێکدا هاتووەو ئەفەرمویێ: (کأني أنظر إلى وبيص الطيب في مفرق النبيﷺ وهو محرم) وەک ئێستا بەبەرچاومەوە بێت بریقەو بۆنی خۆشەکە بەسەری پێغەمبەرەوە لە کاتێکدا کە لە ئیحرامدا بوو واتە بریقەکەی مابوویەوە بۆ پاش ئیحرام دابەستن.

*** *** ***

١٥- بَابُ تَخْلِيْلِ الشَّعْرِ، حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوَى بَشَرَتَهُ أَفَاضَ عَلَيْهِ.

٢٧٢- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ: أَخْبَرَنَا عَبْدُاللهِ قَالَ: أَخْبَرَنَا هِشَامُ بنُ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيْهِ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِﷺ إِذَا اغْتَسَلَ مِنَ الْجَنَابَةِ غَسَلَ يَدَيْهِ، وَتَوَضَّأَ وُضُوءَهُ لِلصَّلاَةِ، ثُمَّ اغْتَسَلَ، ثُمَّ يُخَلِّلُ بِيَدِهِ شَعْرَهُ، حَتَّى إِذَا ظَنَّ أَنَّهُ قَدْ أَرْوَى بَشَرَتَهُ أَفَاضَ عَلَيْهِ الْمَاءَ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ.

٢٧٣- وَقَالَتْ: كُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَرَسُولُ اللهِﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ نَغْرِفُ مِنْهُ جَمِيْعًا.

ئینجا دێتە ئەر ئەم بابە (باب تخليل الشعر، حتى إذا ظن أنه قد أروى بشرته أفاض عليه) ئەمە بابی دەست تێخستنی سەرە لە کاتی غوسڵی لەش پیسیدا ئەوەندە چنگی تێ بخات هەتا بزانێ باش پێستەکەی ئاوی لێ کەوتووە بە باشی ئینجا ئاو بکات بەسەریدا ئینجا لەم بارەیەوە حەدیسێ ئەهێنێ لە دایکمان عائشە خوای لێ رازی بێت کە (قالت: كان رسول اللهﷺ إذا اغتسل من الجنابة غسل يديه، وتوضأ وضوءه للصلاة، ثم اغتسل، ثم يخلل بيده شعره، حتى إذا ظن أنه قد أروى بشرته أفاض عليه الماء ثلاث مرات، ثم غسل سائر جسده)، (وقالت: كنت أغتسل أنا ورسول اللهﷺ من إناء واحد نغرف منه جميعا) ئەفەرموێ پێغەمبەرﷺ کاتێ بیویستایە غوسڵی لەش گرانی بکات هەردوو دەستی

ئەشۆردو دەست نوێژی ئەگرت وەک دەست نوێژ گرتن بۆ نوێژ، ئینجا هەردوو دەستی ئەشۆرد ئینجا باقی لەشی ئەشۆردو دەستی ئەخستە ناو مووەکەی هەتا بیزانیایە کە ناوی بە باشی داوە لە پێستەکەی ئینجا ناوی ئەکرد بەسەریدا سێ جار ئینجا باقی لەشی ئەشۆرد. وە لە ریوایەتێکی تردا ئەفەرموێ: من و پێغەمبەرﷺ خۆمان شۆرد لە یەک زەرفداو هەڵمان ئەگۆست.

*** *** ***

١٦- بَابُ مَنْ تَوَضَّأَ فِي الْجَنَابَةِ.

ثُمَّ غَسَلَ سَائِرَ جَسَدِهِ وَلَمْ يُعِدْ غَسْلَ مَوَاضِعِ الْوُضُوءِ مَرَّةً أُخْرَى.

٢٧٤-حَدَّثَنَا يُوسُفُ بنُ عِيسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا الْفَضْلُ بنُ مُوسَى قَالَ: أَخْبَرَنَا الأَعْمَشُ عَنْ سَالِمٍ عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ: وَضَعَ رَسُولُ اللهِﷺ وُضُوءَ الْجَنَابَةِ فَأَكْفَأَ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاثًا، ثُمَّ غَسَلَ فَرْجَهُ، ثُمَّ ضَرَبَ يَدَهُ بِالأَرْضِ -أَوِ الْحَائِطِ- مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاثًا،ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ أَفَاضَ عَلَى رَأْسِهِ الْمَاءَ، ثُمَّ غَسَلَ جَسَدَهُ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ رِجْلَيْهِ. قَالَتْ: فَأَتَيْتُهُ بِخِرْقَةٍ فَلَمْ يُرِدْهَا، فَجَعَلَ يَنْفُضُ بِيَدِهِ.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب من توضأ في الجنابة.ثم غسل سائر جسده ولم يعد غسل مواضع الوضوء مرة أخرى) ئەمە بابی ئەوەیە کە کەسێ لە غوسڵی لەش گرانیدا دەست نوێژ بگرێ و ئینجا باقی لەشی بشۆرێ و شۆردنی جێگە دەست نوێژەکە دووبارە ئەکاتەوەو شۆرینی دەست نوێژ، کە کیفایەت بێت وەک ئەگەر هەموو لەشی بشۆرێ ئیتر لازم ناکات دەست نوێژ بگرێ وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران مەیمونە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت: وضع رسول اللهﷺ وضوء الجنابة فأكفأ بيمينه على شماله مرتين أو ثلاثا، ثم غسل فرجه، ثم ضرب يده بالأرض -أو الحائط- مرتين أو ثلاثا،ثم مضمض واستنشق وغسل وجهه وذراعيه، ثم أفاض على رأسه الماء، ثم غسل جسده، ثم تنحى فغسل رجليه. قالت: فأتيته بخرقة فلم يردها، فجعل ينقض بيده) واتە بە دەست ئیشارەتی کرد نایەوێ و خۆش وشک ناکاتەوە. ئەم حەدیسە پێش کەوت بەڵام

لێرەدا مەبەست ئەوەیە بەڵگە بێ لەسەر ئەوە شۆردنی دەست نوێژ بەسە پێویست نی یە لە غوسلدا شۆرینی ئەندامەکانی دەست نوێژو دووبارە کردنەوەی.

*** *** ***

١٧- بَابُ إِذَا ذَكَرَ فِي الْمَسْجِدِ أَنَّهُ جُنُبٌ خَرَجَ كَمَا هُوَ وَلاَ يَتَيَمَّمْ.

٢٧٥- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مُحَمَّدٍ قَالَ حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بنُ عُمَرَ قَالَ: أَخْبَرَنَا يُونُسُ عَنِ الزُّهْرِيِّ عَنْ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: أُقِيمَتِ الصَّلاَةُ وَعُدِّلَتِ الصُّفُوفُ قِيَامًا، فَخَرَجَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَلَمَّا قَامَ فِي مُصَلاَّهُ ذَكَرَ أَنَّهُ جُنُبٌ فَقَالَ لَنَا «مَكَانَكُمْ» ثُمَّ رَجَعَ فَاغْتَسَلَ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَيْنَا وَرَأْسُهُ يَقْطُرُ، فَكَبَّرَ فَصَلَّيْنَا مَعَهُ.

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب إذا ذكر في المسجد أنه جنب خرج كما هو ولا يتيمم) ئەمە بابێکە باسی ئەوە ئەکات ئەگەر کەسێ لەشی گران بێت بیری نەبێت لە مزگەوتدا بێت هەر بەو شێوەیە دەرچێت لە مزگەوت و تەیەموم ئەکات بۆ دەرچوونەکە، وە لەم بارەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە ئەفەرموێ: (أقيمت الصلاة وعدلت الصفوف قياما، فخرج إلينا رسول الله ﷺ، فلما قام في مصلاه ذكر أنه جنب فقال لنا «مكانكم» ثم رجع فاغتسل، ثم خرج إلينا ورأسه يقطر، فكبر فصلينا معه) ئینجا بە متابعە ئەوزاعی ئەیهێنێ لە زەهری یەوە. ئینجا چەند باسێک هەیە لە بارەی ئەم حەدیسە لەمەو پاش بە ئیزنی خوا دێت لە (كتاب الصلاة) دا.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٦٣٩، ٦٤٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

١٨- بَابُ نَفْضِ الْيَدَيْنِ مِنَ الْغُسْلِ عَنِ الْجَنَابَةِ.

٢٧٦- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ أَخْبَرَنَا أَبُو حَمْزَةَ قَالَ سَمِعْتُ الأَعْمَشَ عَنْ سَالِمٍ عَنْ كُرَيْبٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: قَالَتْ مَيْمُونَةُ: وَضَعْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ غُسْلاً، فَسَتَرْتُهُ بِثَوْبٍ وَصَبَّ عَلَى يَدَيْهِ فَغَسَلَهُمَا ثُمَّ صَبَّ فَغَسَلَ فَرْجَهُ، فَضَرَبَ بِيَدِهِ الأَرْضَ فَمَسَحَهَا ثُمَّ غَسَلَهَا، فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ وَغَسَلَ وَجْهَهُ وَذِرَاعَيْهِ، ثُمَّ صَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ

قَدَمَيْهِ ،فَنَاوَلْتُهُ ثَوْبًا فَلَمْ يَأْخُذْهُ ، فَانْطَلَقَ وَهُوَ يَنْفُضُ يَدَيْهِ .

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب نفض اليدين من الغسل عن الجنابة) ئەمە بابی ئەوەیە کە لە غوسڵی لەش گرانیدا بە هەردوو دەستی ئاوچۆڕ بکات بە باڵەکانی و بە شتێک وشکی نەکاتەوە، لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکمان مەیمونە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت ميمونة: وضعت للنبي ﷺ غسلا فسترته بثوب وصب على يديه فغسلهما ثم صب بيمينه على شماله فغسل فرجه فضرب بيده الأرض فمسحها ثم غسلها، فمضمض واستنشق وغسل وجهه وذراعيه، ثم صب على رأسه وأفاض على جسده، ثم تنحى فغسل قدميه، فناولته ثوبا فلم يأخذه، فانطلق وهو ينفض يديه) ئیمام ئەم حەدیسەی هێناو کردی بە بەڵگە لەسەر ئیشارەت بە دەستەکانی بۆ نەهێنانی جلەکانی.

*** *** ***

## ١٩- بَابُ مَنْ بَدَأَ بِشِقِّ رَأْسِهِ الأَيْمَنِ فِي الْغُسْلِ.

٢٧٧- حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بنُ يَحْيَى قَالَ حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بنُ نَافِعٍ عَنِ الْحَسَنِ بنِ مُسْلِمٍ عَنْ صَفِيَّةَ بِنْتِ شَيْبَةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كُنَّا إِذَا أَصَابَتْ إِحْدَانَا جَنَابَةٌ أَخَذَتْ بِيَدَيْهَا ثَلاثًا فَوْقَ رَأْسِهَا ثُمَّ تَأْخُذُ بِيَدِهَا عَلَى شِقِّهَا الأَيْمَنِ، وَبِيَدِهَا الأُخْرَى عَلَى شِقِّهَا الأَيْسَرِ.

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب من بدأ بشق رأسه الأيمن في الغسل) ئەمە بابی ئەوەیە لە کاتی غوسڵ کردندا بە لای راستی سەریدا دەست پێ بکات بە شۆردنی، وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکمان عائشەوە -خوای لێ رازی بێت- (قالت: كنا إذا أصابت إحدانا جنابة أخذت بيديها ثلاثا فوق رأسها ثم تأخذ بيدها على شقهاالأيمن، وبيدها الأخرى على شقها الإيسر) فەرمووی ئەگەر یەکێک لە ئێمە تووشی لەش گرانی ببوایە بە دەستی سێ جار ئاوی ئەکرد بەسەریدا لە پاشا بە دەستی ئاوی ئەکرد بەلای راستیداو بە دەستەکەی تری بە لای چەپیدا. لەم حەدیسەدا شێوەیەکی تری غوسڵی هێناوە دیارە پێویستە ئەم شێوەیان راگەیەنێ ئیتر بە حەدیس یان بە ئەسەر.

*** *** ***

## ٢٠ - باب مَنِ اغْتَسَلَ عُرْيَانًا وَحْدَهُ فِي الْخَلْوَةِ، ومن تستّر فالتستّرُ أفضلُ وقَالَ بَهْزٌ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِّهِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ «اللهُ أَحقُّ أنْ يُستحيا منهُ من النّاسِ»

٢٧٨- حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بنُ نَصْرٍ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُالرَّزَّاقِ عَنْ مَعْمَرٍ عَنْ هَمَّامِ بنِ مُنَبِّه عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ «كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، وَكَانَ مُوسَى يَغْتَسِلُ وَحْدَهُ، فَقَالُوا: وَاللهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا إِلاَّ أَنَّهُ آدَرُ. فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِهِ، فَخَرَجَ مُوسَى فِي إِثْرِهِ يَقُولُ: ثَوْبِي يَا حَجَرُ، حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى مُوسَى فَقَالُوا: وَاللهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ. وَأَخَذَ ثَوْبَهُ فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا» فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاللهِ إِنَّهُ لَنَدَبٌ بِالْحَجَرِ سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ ضَرْبًا بِالْحَجَرِ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەكانی: (٣٤٠٤، ٤٧٩٩)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٧٩- وَعَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَانًا فَخَرَّ عَلَيْهِ جَرَادٌ مِنْ ذَهَبٍ، فَجَعَلَ أَيُّوبُ يَحْتَثِي فِي ثَوْبِهِ، فَنَادَاهُ رَبُّهُ: يَا أَيُّوبُ أَلَمْ أَكُنْ أَغْنَيْتُكَ عَمَّا تَرَى؟ قَالَ: بَلَى وَعِزَّتِكَ، وَلَكِنْ لاَ غِنَى بِي عَنْ بَرَكَتِكَ».

وَرَوَاهُ إِبْرَاهِيمُ عَنْ مُوسَى بنِ عُقْبَةَ عَنْ صَفْوَانَ بنِ سُلَيْمٍ عَنْ عَطَاءِ بنِ يَسَارٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَيُّوبُ يَغْتَسِلُ عُرْيَانًا....».

ئەم حەدیسە لە ژمارەكانی: (٣٣٩١، ٧٤٩٣)دا دووبارە بووەتەوە.

(باب من اغتسل عريانا وحده في الخلوة، ومن تستر فالتستر أفضل) ئەمە بابی حوكمی ئەوەیە كەسێك غوسڵ بكات بە رووتی و تەنیا لە چۆڵیدا دروستەو ئەگەر خۆی داپۆشێ چاكترە. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە باپیری بەهزەوە عن النبي ﷺ: الله أحق أن يستحيا منه من الناس) لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی خوا شایانترە بەمەی شەرمی لێ بكرێ تا خەڵكی. واتە بەرووتی غوسڵ كردن لەپێش چاوی خەڵكی و شەرمی لێ نەكرێ كارێكی ناڕەوایە دەی شەرم نەكردن لە خوا ناڕەواترە. كەواتە ئەگەر لە چۆڵیدا غوسڵی كرد با

ی داپۆشێ لەبەر شەرم کردن لە خواو بەڵێ هیچ شاراوە نی یە لە خواو هەرچی بکەین
ـواین بە بەرچاوی خواوە، بەلام ناشکرایە خۆ بەرەڵا کردن بێ شەرمی یەو چاك وایە ئەوەی
ـمان بکرێ لە خۆ داشاردن شتێکی چاکە. ئینجا لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو
ـرەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ کە (قال «کانت بنو إسرائيل يغتسلون عراة ينظر
بعضهم إلى بعض، وكان موسى يغتسل وحده، فقالوا: والله ما يمنع موسى أن يغتسل
منا إلا أنه آذر. فذهب مرة يغتسل، فوضع ثوبه على حجر ففر الحجر بثوبه، فخرج موسى
ي إثره يقول: ثوبي يا حجر، حتى نظرت بنو إسرائيل إلى موسى فقالوا: والله ما بموسى
من بأس. وأخذ ثوبه فطفق الحجر ضرباً» فقال أبو هريرة: والله إنه لندب بالحجر ستة أو
سبعة ضرباً بالحجر) بەنی ئیسرائیلی یەکان بە رووتی غوسڵیان ئەکردو تەماشای یەکتریان
ـەکرد، موساﷺ بە تەنیا غوسڵی ئەکرد، ئینجا بەنی ئیسرائیلی یەکان ئەیان گوت موسا بە
تەنیا غوسڵ ئەکات هەر لەبەر ئەوەیە قۆرەو پێی ناخۆشە کەس بیبینێ، هەتا جارێ غوسڵی
ئەکرد جل و بەرگەکانی دانا بەسەر بەردێکەوەو بەردەکەش رای کرد بە جل و بەرگەوە موساش
کەوتە شوێنی بانگی کرد بەردەکە جل و بەرگەکەم بدەرەوە ئینجا گەیشت بە بەردەکەو دەستی
کرد بە لێدانی. ئینجا ئەبو هورەیرە فەرموی: سوێند بە خوا شەش یا حەوت ناساری
لێدانەکەی پێوە بوو، ئینجا لەو کاتەدا بە رووتی دەرکەوت بۆ خەڵکەکە، ئەمە هۆی پەیوەندی
حەدیسەکە بە مەبەستەکەوەو وتی ناڕەوایە مەگەر مەغذەرتێک ببێ.

ئینجا حەدیسێکی تر ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوەﷺ کە (قال:
«بينا أيوب يغتسل عرياناً فخر عليه جراد من ذهب، فجعل أيوب يحتثي في ثوبه، فناداه
ربه: يا أيوب ألم أكن أغنيتك عما ترى؟ قال: بلى وعزتك، ولكن لا غنى بي عن
بركتك») ئەفەرموێ جارێک ئەیوبﷺ غوسڵی ئەکرد بە رووتی ئینجا چەند کوولەکەیەک لە
ئاڵتوون باری بەسەریدا، ئینجا ئەیوب دەستی کرد بە چنینەوەی و ئەیخستە ناو پۆشاکەکەی
ئینجا خوایش بانگی لێ کرد ئەی ئەیوب ئایا من بێ پێویستم نەکردووی لەوەی کە ئەیبینی
ئەویش گوتی بە گەورەییت قەسەم بێ پێویستت کردووم لەوە بەلام بێ پێویستی نی یە لە
بەرەکەتی تۆ. ئەم حەدیسە لە رێگەیەکی ترەوە ریوایەت کراوە لە ئەبو هورەیرەوە. ئینجا لەم
حەدیسە وەرئەگیرێ بە رووتی غوسڵ کردن حەرام نی یە ئەوەتا خوا عیتابی نەکرتووە لە

رووتی‌یەکەی بەڵکو عەیبداریی گرتووە لەسەر بە دوای مال و سامان گەڕاندا وەک لە حەدیسی پێشوودا دەست نیشان هەیە بەمەی لەگەڵ ئەمەشدا ... خۆ رووت کردن چاک نی‌یە، ئینجا ئایا چۆن موسا ﷺ جلەوگیریی نەکردووە لە بەنی ئیسرائیلییەکان وا دەرنەکەوێ لەو شەریعەتەدا قەدەغە نەبووبێ.

••• ••• •••

## ٢١- بَابُ التَّسَتُّرِ فِي الْغُسْلِ عِنْدَ النَّاسِ.

٢٨٠- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ مَسْلَمَةَ عنْ مَالِكٍ عنْ أبِي النَّضْرِ مَوْلَى عُمَرَ بنِ عُبَيْدِ اللهِ أنَّ أبَا مُرَّةَ مَوْلَى أمِّ هَانِئٍ بِنْتِ أبِي طَالِبٍ أخْبَرَهُ أنَّهُ سَمِعَ أمَّ هَانِئٍ بِنْتَ أبِي طَالِبٍ تَقُولُ: ذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ عَامَ الْفَتْحِ فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ وفَاطِمَةُ تَسْتُرُهُ، فَقَالَ: مَنْ هَذِهِ؟ فَقُلْتُ: أنَا أمُّ هَانِئٍ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٣٥٧، ٣١٧١، ٦١٥٨)دا دووبارە بووەتەوە.

٢٨١- حَدَّثَنَا عَبْدَانُ قَالَ أخْبَرَنَا عَبْدُاللهِ قَالَ أخْبَرَنَا سُفْيَانُ عَنِ الأعْمَشِ عَنْ سَالِمِ بنِ أبِي الْجَعْدِ عَنْ كُرَيْبٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ مَيْمُونَةَ قَالَتْ: سَتَرْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَهُوَ يَغْتَسِلُ مِنَ الْجَنَابَةِ، فَغَسَلَ يَدَيْهِ، ثُمَّ صَبَّ بِيَمِينِهِ عَلَى شِمَالِهِ فَغَسَلَ فَرْجَهُ وَمَا أصَابَهُ، ثُمَّ مَسَحَ بِيَدِهِ عَلَى الْحَائِطِ أوِ الأرْضِ، ثُمَّ تَوَضَّأ وُضُوءَهُ لِلصَّلَاةِ غَيْرَ رِجْلَيْهِ، ثُمَّ أفَاضَ عَلَى جَسَدِهِ الْمَاءَ ثُمَّ تَنَحَّى فَغَسَلَ قَدَمَيْهِ.

تَابَعَهُ أبُو عَوَانَةَ وَابْنُ فُضَيْلٍ فِي السَّتْرِ.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب التستر في الغسل عند الناس) ئەمە بابی ئەوەیە لە کاتی غوسڵدا خۆ رووت نەکرێ لای خەڵکی. لە حەدیسی پێشوودا بەڵگەی هێناوە لەسەر دروستی خۆ رووت کردنەوە لە چۆڵیدا، ئینجا ئەوا بەڵگە ئەهێنێتەوە لەسەر ئەوەی قەدەغەیە لە پێش چاوی خەڵکی وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ کە ئوم هانیء ئەڵێ (ذهبت إلى رسول الله ﷺ عام الفتح فوجدته يغتسل وفاطمة تستره، فقال: من هذه؟ فقلت: أنا أم هانئ) لە ساڵی فەتحی مەککە چووم بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ بینیم غوسڵ ئەکات و فاطمەی کچی دای شاردووە، ئینجا فەرمووی ئەم ئافرەتە کێ‌یە؟ منیش گوتم: (أم هانئ). وا

دەرئەکەوێ سەترەکە تەنک نەبووەو زانیویەتی ئەو کەسە هاتووە ئافرەتە، چونکە ئەو شوێنە شوێنی هاتنی پیاوان نەبووە. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران مەیمونە -خوای لێ رازی بێت- کە (سترت النبيﷺ وهو يغتسل من الجنابة، فغسل يديه، ثم صب بيمينه على شماله فغسل فرجه وما أصابه، ثم مسح بيده على الحائط أو الأرض، ثم توضأ وضوءه للصلاة غير رجليه، ثم أفاض على جسده الماء ثم تنحى فغسل قدميه) ئەم حەدیسە تێپەڕی کرد بە عینوانێکی تر، کەواتە ترجمەی ناکەین لێرەدا.

***　***　***

## ٢٢- بَابُ إِذَا احْتَلَمَتِ الْمَرْأَةُ.

٢٨٢- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ هِشَامِ بنِ عُرْوَةَ عَنْ أَبِيهِ عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِي سَلَمَةَ عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ أَنَّهَا قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ امْرَأَةُ أَبِي طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللهِﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ اللهَ لاَ يَسْتَحِي مِنَ الْحَقِّ، هَلْ عَلَى الْمَرْأَةِ مِنْ غُسْلٍ إِذَا هِيَ احْتَلَمَتْ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِﷺ: «نَعَمْ إِذَا رَأَتِ الْمَاءَ».

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب إذا احتلمت المرأة) ئەمە بابی ئەوەیە ئایا ئافرەت ئیحتیلامی دەبێت وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران أم سلمە کە (جاءت أم سليم امرأة أبي طلحة إلى رسول اللهﷺ فقالت: يا رسول الله إن الله لا يستحي من الحق، هل على المرأة من غسل إذا هي احتلمت؟ فقال رسول اللهﷺ: «نعم إذا رأت الماء») ئەفەرموێ: ئوم سلیم کە ژنی ئەبو طلحە بوو هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ عەرزی کرد خوا شەرم ناکات لە حەق ئایا ئافرەت لە خەوا ئیحتیلامی بوو (شەیتانی بوو) ئایا غوسڵی لەسەرە، ئەویش فەرمووی: بەڵێ ئەگەر ئاوی بینی. واتە دوای خەبەر بوونەوە شەهوەتی بینی بە تەڕی یان بە وشکی و ڕەقاڵتەیی. واتە زانی ئاوی هاتووەتەوە واجبە غوسڵ بکات.

***　***　***

## ٢٣- بَابُ عَرَقِ الْجُنُبِ، وَأَنَّ الْمُسْلِمَ لاَ يَنْجُسُ.

٢٨٣- حَدَّثَنَا عَلِيُّ بنِ عَبْدِاللهِ قَالَ حَدَّثَنَا يَحْيَى قَالَ حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ قَالَ حَدَّثَنَا بَكْرٌ عَنْ أَبِي رَافِعٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ النَّبِيَّﷺ لَقِيَهُ فِي بَعْضِ طَرِيقِ الْمَدِينَةِ وَهُوَ جُنُبٌ،

فَانْخَنَسْتُ مِنْهُ، فَذَهَبَ فَاغْتَسَلَ ثُمَّ جَاءَ، فَقَالَ: أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟ قَالَ: كُنْتُ جُنُبًا فَكَرِهْتُ أَنْ أُجَالِسَكَ وَأَنَا عَلَى غَيْرِ طَهَارَةٍ. فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللَّهِ، إِنَّ الْمُسْلِمَ لا يَنْجُسُ».

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب عرق الجنب، وأن المسلم لا ينجس) ئەمە بابی ئەوەیە عەرەقی لەش پیس پاکەو موسڵمان پیس نابێ. لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە (أن النبي ﷺ لقيه في بعض طريق المدينة وهو جنب، فانخنست منه، فذهب فاغتسل ثم جاء، فقال: أين كنت يا أبا هريرة؟ قال: كنت جنبا فكرهت أن أجالسك وأنا على غير طهارة. فقال: «سبحان الله، إن المسلم لا ينجس») پێغەمبەر ﷺ تووشی ئەبێ لە هێندێ شوێنی مەدینەدا لە کاتێکدا کە لەش گران ئەبێ. ئەبو هورەیرە ئەفەرموێ: بە هێوی ئەوەوە خۆم کەناردا لێ ی تا چووم غوسڵم کردو گەڕامەوە بۆ خزمەتی و فەرموی پێم: ئەبو هورەیرەوە لە کوێ بووی؟ عەرزی ئەکات من لەشم گران بوو پێم ناخۆش بوو دانیشم لات لە کاتێکدا لەش پاک نەبم، ئەویش فەرموی: سبحان الله واتە سەری سوڕما لێ ی کە ئەوەی گووت و فەرموی: موسڵمان پیس نابێت، وە فەرموی: سبحان الله چۆن ئەبو هورەیرە ئەو شتە ئاشکرای نەزانی. لەم حەدیسە وەرئەگیرێ کە گەورەو کاربەدەست ژێر دەستەکەی ئاگادار بکات و بیخاتە سەر ڕێگای ڕاست یا بچووک داواش ئەکات هەروەها لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە بچووک و ژێر دەستە شایانی ئەوەیە ئیزن بخوازێ کاتێ بیەوێ جوێ ببێتەوە لە گەورەکەی ئەوەتا فەرموی لە کوێ بووی؟ ئیمامی بوخاری پیس نەبوون بە لەش پیسی کردووە بە بەڵگە لەسەر ئەوە عەرەقەکەی پاکە. وە هەروەها لەم حەدیسەوە وەرئەگیرێ کە لەش پیس ئەتوانێ پەلە ئەکات لە غوسڵ کردندا بەڵکو پێش غوسڵەکە ئیش و کار بکات و ئینجا غوسڵ بکات وەک لەم بابەی دواییدا بە دەقی ئەفەرموێ.

ئەم حەدیسە لە ژمارەی: (٢٨٥)دا دووبارە بووەتەوە.

***　***　***

## ٢٤- بَابُ الْجُنُبِ يَخْرُجُ وَيَمْشِي فِي السُّوقِ وَغَيْرِهِ.

وَقَالَ عَطَاءٌ: يَحْتَجِمُ الْجُنُبُ وَيُقَلِّمُ أَظْفَارَهُ وَيَحْلِقُ رَأْسَهُ وَإِنْ لَمْ يَتَوَضَّأْ.

٢٨٤- حَدَّثَنَا عَبْدُ الأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ قَالَ حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ زُرَيْعٍ قَالَ حَدَّثَنَا سَعِيدٌ عَنْ قَتَادَةَ أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ حَدَّثَهُمْ أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَطُوفُ عَلَى نِسَائِهِ فِي اللَّيْلَةِ الْوَاحِدَةِ

وَلَهُ يَوْمَئِذٍ تِسْعُ نِسْوَةٍ.

٢٨٥- حَدَّثَنَا عَيَّاشٌ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُالأَعْلَى قَالَ حَدَّثَنَا حُمَيْدٌ عَنْ بَكْرٍ عَنْ أَبِي رَافِعٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: لَقِيَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَنَا جُنُبٌ، فَأَخَذَ بِيَدِي فَمَشَيْتُ مَعَهُ حَتَّى قَعَدَ، فَانْسَلَلْتُ فَأَتَيْتُ الرَّحْلَ فَاغْتَسَلْتُ، ثُمَّ جِئْتُ وَهُوَ قَاعِدٌ فَقَالَ: أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هِرٍّ؟ فَقُلْتُ لَهُ، فَقَالَ: «سُبْحَانَ اللهِ يَا أَبَا هِرٍّ، إِنَّ الْمُؤْمِنَ لاَ يَنْجُسُ».

(باب الجنب يخرج و يمشي في السوق وغيره) ئەمە بابی ئەوەیە کە لەش گران لە ماڵەوە دەرئەچێ و ئەگەڕێ بە بازاڕو غەیری بازاڕداو هیچ گوناهێک لەوەدا نی‌یە. (وقال عطاء: يحتجم الجنب ويقلم أظفاره ويحلق رأسه وإن لم يتوضأ) عەطا ئەم کارانە بە ڕەوا دائەنێ با دەست نوێژیش نەگرێ (خوێن گرتن، نینۆک کردن، سەرتاشین). وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەنەسەوە (أن نبي الله ﷺ كان يطوف على نسائه في الليلة الواحدة وله يومئذ تسع نسوة) ئەم حەدیسە لە بابی (إذا جامع ثم عاد) وە پەیوەندی ئەسەرەکەی عطا لەم بارەیەوەیە کە لەش گران بە بێ غوسڵ کارو فرمان بکات. ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە کە لە بابی پێشوودا هێنانی کە فەرموی: (لقيني رسول الله ﷺ وأنا جنب، فأخذ بيدي. فمشيت معه حتى قعد، فانسللت فأتيت الرحل فاغتسلت، ثم جئت وهو قاعد فقال: أين كنت يا أبا هر؟ فقلت له، فقال: «سبحان الله يا أبا هر، إن المؤمن لا ينجس»).

*** *** ***

## ٢٥- بَابُ كَيْنُونَةِ الْجُنُبِ فِي الْبَيْتِ إِذَا تَوَضَّأَ قَبْلَ أَنْ يَغْتَسِلَ.

٢٨٦- حَدَّثَنَا أَبُو نُعَيْمٍ قَالَ: حَدَّثَنَا هِشَامٌ وَشَيْبَانُ عَنْ يَحْيَى عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَرْقُدُ وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَتْ نَعَمْ، وَيَتَوَضَّأُ.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب كينونة الجنب في البيت إذا توضأ قبل أن يغتسل) ئەمە بابی بوونی لەش گرانە لە ماڵدا ئەگەر دەست نوێژ بگرێ وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە أبو سلمەوە کە (قال: سألت عائشة أكان النبي ﷺ يرقد وهو جنب؟ قالت نعم،

ويتوضأ) فەرمووی پرسیارم کرد لە عائشە -رضی الله عنها- ئایا پێغەمبەر بە لەش گرانی‌یەوە ئەخەوت؟ گوتی بەڵێ وە دەست نوێژی ئەگرت. لەم حەدیسەوە دەرئەکەوێ کە خەوتن بە لەش گرانی‌یەوە کەراهەتی نی‌یە ماتووڵ دەست نوێژ بگرێ.

*** *** ***

٢٦- بَابُ نَوْمِ الْجُنُبِ.

٢٨٧- حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ قَالَ: حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ نَافِعٍ عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّ عُمَرَ بنَ الْخَطَّابِ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَيَرْقُدُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: نَعَمْ، إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَلْيَرْقُدْ وَهُوَ جُنُبٌ.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب نوم الجنب) ئەمە بابی خەوتنی لەش گرانە وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ (أن عمر بن الخطاب سأل رسول الله ﷺ أيرقد أحدنا وهو جنب؟ قال: نعم، إذا توضأ أحدكم فليرقد وهو جنب) عومەر -خوای لێ رازی بێت- پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ ئایا هەرکام لە ئێمە لەش گران بوو بخەوێ ئەویش فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر دەست نوێژ بگرێ بخەوێ، کەواتە بەو جۆرە خەوتنەکە خیلافی سوننەت نی‌یە.

ئەم حەدیسە لە ژمارەکانی: (٢٨٩ ، ٢٩٠)دا دووبارە بووەتەوە.

*** *** ***

٢٧- بَابُ الْجُنُبِ يَتَوَضَّأُ ثُمَّ يَنَامُ.

٢٨٨- حَدَّثَنَا يَحْيَى بنُ بُكَيْرٍ قَالَ حَدَّثَنَا اللَّيْثُ عَنْ عُبَيْدِاللهِ بنِ أَبِي جَعْفَرٍ عَنْ مُحَمَّدِ بنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ وَهُوَ جُنُبٌ غَسَلَ فَرْجَهُ وَتَوَضَّأَ لِلصَّلَاةِ.

٢٩٨- حَدَّثَنَا مُوسَى بنُ إِسْمَاعِيلَ قَالَ حَدَّثَنَا جُوَيْرِيَةُ عَنْ نَافِعٍ عَنْ عَبْدِاللهِ قَالَ: اسْتَفْتَى عُمَرُ النَّبِيَّ ﷺ: أَيَنَامُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا تَوَضَّأَ».

٢٩٠- حَدَّثَنَا عَبْدُاللهِ بنُ يُوسُفَ قَالَ: أَخْبَرَنَا مَالِكٌ عَنْ عَبْدِاللهِ بنِ دِينَارٍ عَنْ عَبْدِاللهِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ قَالَ: ذَكَرَ عُمَرُ بنُ الْخَطَّابِ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ تُصِيبُهُ الْجَنَابَةُ مِنَ اللَّيْلِ، فَقَالَ

لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «تَوَضَّأْ وَاغْسِلْ ذَكَرَكَ ثُمَّ نَمْ».

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب الجنب يتوضأ ثم ينام) ئەمە بابی ئەوەیە لەش گران دەست نوێژ بگرێ ئینجا بخەوێ وە لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە دایکی ئیمانداران عائشە -خوای لێ رازی بێت- کە (قالت: كان النبي ﷺ إذا أراد أن ينام وهو جنب غسل فرجه وتوضأ للصلاة) وتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێ لەشی گران بوایەو بیویستایە بخەوێ تارەتی ئەگرت و دەست نوێژی ئەگرت وەک دەست نوێژ بۆ نوێژ بگرێ ئینجا ئەخەوت. ئینجا ئەم ئەسەرەش ئەهێنێ (استفتى عمر النبي ﷺ: أينام أحدنا وهو جنب؟ قال: «نعم، إذا توضأ») ئینجا ئەم حەدیسە ئەهێنێ (ذكر عمر بن الخطاب لرسول الله ﷺ أنه تصيبه الجنابة من الليل، فقال له رسول الله ﷺ: «توضأ واغسل ذكرك ثم نم») پیتی (و) تەرتیب ناگەیەنێ کەواتە مەبەست ئەوەیە تارەت بکرە لە پێشەوە ئینجا دەست نوێژ بگرەو ئینجا بخەوە. لەم حەدیس و ئەسەرانەوە دەرکەوت خەوتن بە لەش گرانی‌یەوە دروستە وە ئەگەر دەست نوێژ بگرێ وەک دەست نوێژ بۆ نوێژ دروستەو سونەتیشە. چەند جارێ گوتمان ئیمامی بوخاری لە هەر مەسەلەو بابێکدا هەر حەدیس و ئەسەرێکی دەست کەوتبێ لەسەر مەرجەکەی خۆی هێناویەتی وە گوێی نەبووە لە تیکرار.

*** *** ***

## ٢٨- بَابُ إِذَا الْتَقَى الْخِتَانَانِ.

حَدَّثَنَا مُعَاذُ بنُ فُضَالَةَ قَالَ حَدَّثَنَا هِشَامٌ ح.

٢٩١- وَحَدَّثَنَا أَبُونُعَيْمٍ عَنْ هِشَامٍ عَنْ قَتَادَةَ عَنِ الْحَسَنِ عَنْ أَبِي رَافِعٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا جَلَسَ بَيْنَ شُعَبِهَا الأَرْبَعِ ثُمَّ جَهَدَهَا فَقَدْ وَجَبَ الْغُسْلُ».

تَابَعَهُ عَمْرُو بنُ مَرْزُوقٍ عَنْ شُعْبَةَ مِثْلَهُ وَقَالَ مُوسَى: حَدَّثَنَا أَبَانُ قَالَ: حَدَّثَنَا قَتَادَةُ أَخْبَرَنَا الْحَسَنُ مِثْلَهُ.

ئینجا دێته سەر ئەم بابە (باب إذا التقى الختانان) ئەمە بابی ئەوەیە ئەگەر جێ خەتەنەی پیاو و ئافرەت گەیشتن بە یەک حوکمی چی‌یە؟ لەم بارەیەوە ئەم حەدیسە ئەهێنێ لە ئەبو هورەیرەوە ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە (قال: إذا جلس بين شعبها الأربع ثم جهدها

فقد وجب الغسل ) نەفەرمویٚ کاتێ پیاو دانیشت لە بەینی چوار دەوری عەیبی ئافرەت و خۆی پیادا غوسلی لەسەر واجب دەبێ. زاهیرەکەی ئاوی بێتەوە یان نەء وە شوعبەو حەسەنیش ئەم حەدیسەیان بە متابعە هێناوە.

***        ***        ***

٢٩- بَابُ غُسْلِ مَا يُصِيبُ مِنْ فَرْجِ الْمَرْأَةِ.

٢٩٢- حَدَّثَنَا أَبُو مَعْمَرٍ قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالْوَارِثِ عَنِ الْحُسَيْنِ قَالَ يَحْيَى وَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ أَنَّ عَطَاءَ بنَ يَسَارٍ أَخْبَرَهُ أَنَّ زَيْدَ بنَ خَالِدٍ الْجُهَنِي أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَأَلَ عُثْمَانَ بنَ عَفَّانَ فَقَالَ: أَرَأَيْتَ إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ فَلَمْ يُمْنِ؟ قَالَ عُثْمَانُ: «يَتَوَضَّأُ كَمَا يَتَوَضَّأُ لِلصَّلاَةِ وَ يَغْسِلُ ذَكَرَهُ» قَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ.

فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ عَلِيَّ بنَ أَبِي طَالِبٍ وَ الزُّبَيْرَ بنَ الْعَوَّامِ وَطَلْحَةَ بنَ عُبَيْدِاللهِ وَأُبَيَّ بنَ كَعْبٍ -رَضِيَ اللهُ عَنْهُمْ- فَأَمَرُوهُ بِذَلِكَ. قَالَ يَحْيَى: وَأَخْبَرَنِي أَبُو سَلَمَةَ أَنَّ عُرْوَةَ بنَ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُ أَنَّ أَبَا أَيُّوبَ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَمِعَ ذَلِكَ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ.

٢٩٣- حَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ حَدَّثَنَا يَحْيَى عَنْ هِشَامِ بنِ عُرْوَةَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبِي قَالَ: أَخْبَرَنِي أَبُو أَيُّوبَ قَالَ: أَخْبَرَنِي أُبَيُّ بنُ كَعْبٍ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ إِذَا جَامَعَ الرَّجُلُ الْمَرْأَةَ فَلَمْ يُنْزِلْ؟ قَالَ يَغْسِلُ مَا مَسَّ الْمَرْأَةَ مِنْهُ ثُمَّ يَتَوَضَّأُ وَيُصَلِّي.

قَالَ أَبُو عَبْدِاللهِ: الْغُسْلُ أَحْوَطُ، وَذَاكَ الآخِرُ، وَإِنَّمَا بَيَّنَّا لاِخْتِلاَفِهِمْ.

ئینجا دێتە سەر ئەم بابە (باب غسل ما يصيب من فرج المرأة) ئەمە بابی ئەوەیە ئەگەر کەسێ چووە لای ژنەکەی و دخولی پێ کرد بەلام ئاوی نەهاتەوە غوسلی لەسەر نیە، بەلکو هەر زەکەری بشۆرێ وە لەم بارەیەوە ئەم ئەسەرە ئەهێنێ کە زەیدی کوڕی خالد (سأل عثمان بن عفان فقال: أرأيت إذا جامع الرجل امرأته فلم يمن؟ قال عثمان: «يتوضأ كما يتوضأ للصلاة و يغسل ذكره» قال عثمان: سمعته من رسول الله ﷺ. فسألت عن ذلك علي بن أبي طالب و الزبير بن العوام وطلحة بن عبيدالله وأبي بن كعب -رضي الله عنهم- فأمروه بذلك. قال يحيى: وأخبرني أبو سلمة أن عروة بن الزبير أخبره أن أبا أيوب أخبره

أنه سمع ذلك من رسول الله ﷺ) زەیدی کوڕی خالید ئەڵێ وەک پرسیارم کرد لە عثمان هەروا پرسیارم کرد لە عەلی و زوبەیرو طلحە و ابی کوڕی کعب ئەوانیش هەروەک عثمانیان فەرموو. (و أخبرني أبو سلمة أنه سمع ذلك من رسول الله ﷺ) ئەبو سەلەمە هەواڵی پێدام بیستی کە (أن أبي بن كعب أنه قال: يا رسول الله ﷺ إذا جامع الرجل المرأة فلم ينزل؟ قال يغسل ما مس المرأة منه ثم يتوضأ ويصلي)، (قال أبو عبدالله: الغسل أحوط) ئیمامی بوخاری ئەفەرموێ ئەوە چاکترەو ئیحتیاتە (واتە خۆی بشۆرێ با ئاویشی نەیەتەوە) (وذاك الآخر، وإنما بينا لإختلافهم) ئەوەش ئاخر رایە ئەم حەدیسەی دواییمان باس کرد هەر لەبەر ئەوەی ئیختیلافی علمای تێدا بووە، بە هەر حاڵ جەماوەر لەسەر ئەوەیە کە واجبە غوسڵ.

کیتابی غوسڵ تا ئێرە ٦٣ حەدیسە خالیسەکەی ٢٨ حەدیسە.

***      ***      ***

## ناوەرۆك

* مامۆستای خوا لێخۆشبوو لە ساڵی ١٩٢٢ لە گوندی (بریسی جەروو) ناوچەی شەرەزووڵی نزیک بە شاری هەڵەبجە لە دایک بووە، بە رەچەڵەک دەچێتەوە سەر زاهیدی خوانناس (پیر خضری شاهۆیی).

* هەر بە منداڵی لەسەر دەستی چەنابی باوکی و مامۆستا مەلا صالحی ئامۆزای دەخوێنێ و پاشان لەسەر دەستی جەنابی باوکیدا ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە.

* لە ساڵی ١٩٥٤دا کاتێک بەڕێزان شێخ ئەحمەد زەهاوی و محمد مەحمود صەواف پەیامی "الإخوان المسلمین"یان هێنایە عێراقەوە مامۆستا بە پەرۆشەوە ئەو پەیامە پەرزە وەرئەگرێ و لەگەڵ چەندین مامۆستای بەڕێزی تری ناوچەکەدا یەکەمین ئەڵقەی کاری ئیسلامی دادەمەزرێنن لە هەڵەبجە.

* لە ٢٧ی رەمەزانی ١٩٥٩دا بە بڕیاری عەبدولکەریم قاسم دەستگیر دەکرێت لەگەڵ مامۆستا مەلا عومەری برا گەورەی و مامۆستا مەلا صالحی ئامۆزای وچەند سەرۆک عەشیرەتێکی ناوچەکەو بۆ ماوەی (٩) مانگ لە ناصریە دەست بەسەر دەبن.

* لە ساڵی ١٩٦٤ بە سەرۆکایەتی وەفدی کوردستان بەشداری کۆنگرەی دامەزراندنی (حیزبی ئیسلامی عێراق)ی دەکات و وتاری کوردستان دەخوێنێتەوە.

* لە ساڵانی (٥٩ - ٦٧) چەند جارێک چاوی بە عبدالکریم قا... عبدالسلام عارف دەکەوێت و مەسەلەی میللەتی کوردیان لەگ... باس دەکات.

* لە ساڵی ١٩٧٤ بە سەرۆکایەتی وەفدێکی زانایانی ...لامی کوردستان سەردانی سعودیە دەکات و چاوی بە م... ...ڵی پادشای سعودیە دەکەوێت و مەسەلەی کوردی بۆ شی ...ەوە.

* لە ساڵی ١٩٧٧ لە لایەن رژێمی عێراقەوە دەستگیر دەکرێت و (١٠) مانگ لە زیندانی (سەماوەو رمیثة) زیندان دەبێت و هەر لە زینداندا سید قطب ناسنا دەست ئەداتە نووسینی (تەفسیری قورئانی پیرۆز).

* ساڵی ١٩٨٧ وەک بەرپەرچ دانەوەیەکی توندی رژێم لە سەرکو... کردنی راپەڕینە جەماوەرییەکەی مانگی ٥/ ١٩٨٧ ناوچ... هەڵەبجەو شارەزوور "بزووتنەوەی ئیسلامی لە کورد... رادەگەیەنێ و بە بڕیاری هەموو لایەک دەبێتە رابەری ... بزووتنەوەکە.

* لە ساڵی ١٩٩١دا بەشداری راپەڕینە جەماوەرییەک ... کوردستانی کردووەو چالاکانە لە نزیکەوە رێنموونی جەماوەری کردووەو دەوری لەبەرچاوی هەبووە.

* ساڵی ١٩٩٢ یەکێک بوو لە پاڵێوراوان بۆ "رابەرایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد" لە کاتی هەڵبژاردنە گشتییەکەی خەڵکی کوردستاندا.

* مامۆستا گەلێک بەرهەمی زانستی بەپێزی هەیە، لەوانە:

-تەفسیری قورئانی پیرۆز لە (١٥) بەرگ و بە قەبارەی (...) لاپەڕە. کە لە ساڵانی ١٩٩٦ و ١٩٩٧دا بە چاپ گەی...ت و بڵاوکرایەوە.

-نووسینی (شەرحی فەرمودەکانی صەحیحی بو...) لەسەر شێوازی (فتح الباري) کە مامۆستا تا رۆژی کۆچ ... یەک لەسەر سێی ئەو کارەی ئەنجامدا.

-بەرهەمێکی سەبارەت بە (علوم القرآن) دەست پێک... ئەویش تا رۆژی کۆچ کردنی لە نیوە زیاتری تەواو کرد.

-چەندین نامیلکەو بابەتی جۆراو جۆرو وەرگێڕانی کت... گرنگەکان کە ئەگەر بە چاپ بگەیشتایە بۆ کاتی خ... دەورێکی کاریگەریان دەبوو لە رێنموونی کردنی رابو... ئیسلامی کوردستاندا. ئەمە سەرەرای چەندین بابەتی فیقهی ... لێرەو لەوێ بە جۆرەها شێواز بڵاوکراونەتەوە لە نێ... قوتابیانی پەیمانگای زانستە شەرعییەکاندا.

* لە سەر لە بەیانی چوارشەممە ١٢/ ٥ / ١٩٩٩ لە شاری دیمەشق پایتەختی سوریا کۆچی دوایی کردو لە مەراسیمێکی بێ وێنەدا جەماوەری موسڵمانی کوردستان تەرمی پیرۆزیان گەیاندەوە هەڵەبجەو دوا ماڵئاواییان لێکردو بەخاکیان سپارد.

بسم الله الرحمن الرحيم من محمد عبدالله ورسوله

إلى هرقل عظيم الروم

السلام على من اتبع الهدى، أما بعد:

فإني أدعوك بدعاية الإسلام أسلم تسلم يؤتك الله

أجرك مرتين، فإن توليت فإن عليك إثم الأريسيين.

﴿ قل يا أهل الكتاب تعالوا إلى كلمة سواء بيننا

وبينكم أن لا نعبد إلا الله ولا نشرك به شيئا ولا يتخذ

بعضنا بعضا أربابا من دون الله، فإن تولوا فقولوا

اشهدوا بأنا مسلمون ﴾

# شرح صحيح البخاري

## (باللغة الكردية)

## الشيخ عثمان عبدالعزيز محمد

### المجلد الأول

الطبعة الأولى

١٩٩٩م - ١٤٢٠ هـ

ناوەندی عبدالعزیز بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

مركــز عبدالعزيــز للطبــاعة والنشـــر

ژمارەی سپاردنی (١٦٣) ساڵی ١٩٩٩ دراوەتێ